دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنـەوە، دامەزراوەیەکە بـۆ چاپ و بڵاوکردنـەوەی کتێـب، لـە 21/8/2019 دامـەزراوە، هـەوڵ دەدات بـە شێوەیەک کتێب چاپ بـکات، کـە هـەم لـە ڕووی ناوەڕۆکـەوە، هـەم لـە ڕووی هونـەری و تەکنیکییـەوە لـە ئاستێکی بـەرزدا بێـت، هەروەها لـە ڕووی نرخـەوە، دۆخـی خوێنـەران لەبەرچاو دەگـرێ و هـەوڵ دەدات کتێـب لـە هەمـوو بـوارە جیاجیاکانی ئەدەبـی، سیاسـی، کۆمەڵایەتـی، ئابـووری و منـداڵان و.... چاپ و بڵاو بکاتەوە..

فام: ئاوەز، تێگەیشـتن [هەنبانـە بۆرینە، هـەژار: ل516]، [فەرهەنگی کوردسـتان، گیـوی موکریانـی: ل 664]. [فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ: ل313]

FAMpublication

دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAMpublication
بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری



چاپی دووەم - ٢٠٢١

# خەوی پساوەی قەندیل

نووسینی

## کەریم کاکە

بابەت: ڕۆمان

پێوانە

١٣.٥*٢١سم (٣٤٦) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (١٦٧٢)ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێ دراوە.

## ١

لە سەر پایەی حەفتەمی پەیژەی ماچ، ماچم دەچنیەوە، ماچێ کە هەرگیز لە چێوەی ئاگایی ناگیرێ، نازانم نە هەڵگەڕان دایدەگرتم نە داگەڕان هەڵیگرتبووم، هێندەم لە بیرە راپەڕینێ راپەڕیم، نە هیچ ئەسپێ وا راپەڕیوە نە هیچ میللەتێ، رێك چۆلەکەیێ بووم خۆم لە ئاقاری پشیلەدا دیتەوە، مەزەندە دەکەم لە ریزی راچڵەکینە ئەفسانەییەکان، راچڵەکینەکەی من جێگەیەك بگرێ.

*رابە حەفت خولەك لە ئێشکگریەکەت ماوە، ئەوەی دوای خۆت بەئاگابێنە.*

ئەوە دەنگی ئەو پیاوە بوو، کەس وەک پێویست نایناسێ، مـن ئەو هەمـوو شـەوە هاموشـۆمکرد هێنـدەی چـاکوچۆنیەکی سەرپێییش نەمناسی، بە ناوەکەی ئاشنابووم و بەس.

خولە

بە هەر نشێوییەك نشێو دەبیەوە شوێنپێی ئەو پیاوە دیارە، چاو

له هەر هەورازەیەك دەبڕی، جێپەنجەی ئەو پیاوەی پێوەیە، بەڵام نیشانەو هێمای ئاڵۆزو نەکراوەن، من هیچم لەو هێمایانە هەڵنەکراند، ئەوە نەبێ، پێناچێ ئەو پیاوە بۆ تامی ئەفسانەش خزمایەتیی لەگەڵ ئەفسانەکانیدی هەبێ، بە ئەفسانەبوونی ئەو پیاوە لە سادەییەوەیە، رەنگە لە سادەییەوە هاتبێت، لەوەوە هاتووە کە هێند لە ناو چاوانە، هێند لە ناو دڵانە، بە هیچ چاوێ نابینرێ.

لە کتێبەکەی (نووح)، پیاوێ لە دواوەی کەشتیەکە سواربووە، هێند لەو خولەیە دەکات، پڕ لە لافاوی گومانی کردووم، شەپۆلەکانی دڵنیام دەکەنەوە هەوە.

لە کتێبی (قەرات ) وێنەی کابرایەك هەیە کە لە نزیك کونەگورگێ شەڕی ئەسحابان دەکات، هەر زۆر بەو دەچێت، پیرێکی بنارنشینی دەیگۆ:

وابزانم هەر ئەو پیاوە بوو دوو سێ جار سمکۆی شکاکی لە مردن رزگارکرد.

من کەڕەتێ حەفت پرسیارم لێیکرد، وەڵامی یەکیانی دایەوە و هۆشداریەکی توندیشی دامێ کە ببڕای ببڕ پرسیاری لێنەکەم، ئیدی وەك ئەوەی خزمی خواوەند بێ، دەرگای پرسیاری بە توندی داخست.

هەر هێندەی گوت:

ئەگەر بمزانیبا ناوی ئێشکگرەکەی دوای تۆ بخوێنمەوە، لە پەیژەی ماچم نەدەکردی.

ئەو وەڵامە هەر بە جارێ منی تۆقاند، هەستمکرد داوم بە داوی پەیامبەرێکەوە بووە، ئەوە دوا جار بوو، ناوی من لە

ئێشکگریی لە دوای ناوی خولەوە بێت، ئەوە دوا جار بوو، ئەو پیاوە من بە ئاگابێنێت، لە وێوە تا ئێرە و لە هەموو ساتە ترساوەکان، کە بە نیازی خەون خەو دەمباتەوە، نزادەکەم ئەو وەئاگامبهێنێتەوە.

گوێم لە دەنگی پیاوێکە، هێشتا نازانم نە خەونە نە وڕێنە، رەنگە هیچیان نەبێ، پیاوێك بە دەنگی نووساوەوە دەڵێ:

دەمەوێ لە دەرەوەی چیرۆکەوە چیرۆکی خەوی چیایی بگێڕمەوە، لە دەرەوەی خەویشەوە پیاسەیەك بکەم بە بزنەرێی هەوڵدان بۆ نووسینەوەی خەوی چیرۆکی گۆرانیەکان، یەکە یەکەی گۆرانیەکان، گۆرانیی جەنگاوەران، تا پێشمبکرێ کەم خۆم لە سەربردەی وی دەدەم، بۆوەی چیرۆکەکە داگیرنەکات.

ئەفسانە کوا جمکانەی تیر و کەوانە

نا سەر بە بەرەی تفەنگیش نیە

ئەفسانە نە زادەی لە گۆڕ هەستانەوەیە

نە بە ئاقاری شەڕیشدا پیاسەیەکی کردووە

ئەفسانە حیلەی بەجێماوی ئەسپە

جریوەی بەجێماوی چۆلەکەیە

تەنها لە بێخەویەوە دێ

لە بێخەویەوە دەحیلێنێ، دەجریوێنێ.

( سترانی جەنگاوەر)

## ٢

چیایەك هەبوو (قەندیل) یان دەگوتێ، ئەو قەندیلە زۆر لە دێرزەمانەوە ڕێکەوتنامەیەکی نهێنیی لەگەڵ هەوری ئاسمانان مۆرکردبوو، دەبوایە تا قەندیل قەندیلە حەفتیەکی بەفری هەوران بۆ وی بێ، ئەگەر نا ئاسمان دەکاتە ئاگر و هەرچی هەورە گڕ تێبەردەدا، لاپەڕەکانی بەفری قەندیلێ زۆرن و هەڵنادرێنەوە، ژمارەیان پترە لە لاپەڕەی هەموو ئەفسانە و ئایینەکان، لە قسان چی وای لە کچە جوانەمەرگەکانی حەوا کەمتر نیە، لە ژنە کۆچەریەکم بیست:

زۆر لەو لاپەڕانە پەنجە مۆری خولەیان پێوەیە.

من کە وەك بزنێکی هەڵاتوو بە پێڵاوی دڕاوەوە بە قەندیلێدا هەڵدەزەنام، دوا شەوی مانگێ بوو، مانگی ساڵێك لەو ساڵانەی لە ڕۆژژمێری خوداوەندا سڕابوونەوە، ئەو شەوە هەر ئەو شەوە بوو کە برایمی مەلا زێندینان لە ڕێ بوو، ئەو برایمەی بۆ هەتایە بووە درەختی بەفرو چوار کەژە کلووە دەگرێ و بەردارترین درەختە.

نازانم چەند لەوێ مامەوە، هێندەم لە بیرە لاپەڕەیەکیدیش هاتە سەر لاپەڕەکانیدی، شەوانە برایم دەستەکانی خۆی بە من گەرمدەکردەوە، من لەوێ شێتبوونی چیام دیت و ئاشنای بووم،

خەڵکــی قەنــدیل دیتــی بەو شــێتبوونەیان دەگــوت زریــان، دەیانگوت:

هاییداربن شێتیی چیا مرۆڤیش دەگرێتەوە.

درەنــگ تێگەیشــتم و زووو گــرتمیەوە، زریــان لە دایکــم میهرەبــانتر دایپۆشــیم، چ بەخــتەوەریە خەوتــن لە شــێتبووندا، کەرەتێ بـایی خەونـێ خەوتـم، هەوکەش وا دەزانـم لە بـاخەڵی کچە رەوەندیان خەوتم.

کـچە دارخورمـاییەك پێـدەچوو جـادووی هەور لە بەسـراوە گەیاندبێتیە قەندیلێ و بە بەرەوە و لە گوێژ بە تامتر رواندبێتیەوە، ئەو کچە ناوی خۆی و چەند ناویدیشی هەبـوو، وەلـێ مـن هەر بە فاتیمە گازمدەکرد، ناوەکەی بە سەردا بڕا، دەیپرسی:

بۆچی فاتیمە؟

وەڵامی پرسیاری وا لە تێگەیشتنی دارخورمـا سـەختتر بـوو، ئـاخر لە مەسـتی چـاودا کـچە هـۆزانیەکەی هەردی بـوو، لە نەرمونیانی ژنە ئایینیەکەی ئیمـامی عەلـی بـوو، لە زۆر شـتیدیش زۆر فاتیمەیدی.

فـاتیمە سـاتێ بە ئاگایهێنـامەوە، لە بـازنەی ئـاگر خەریکـی پیاسەی خولانەوە بووم، لەوێوە دەنگێک لەسەر ریتمی بەفربارین دەیگۆ:

بەخێر بێن بۆ بەهەشت.

لەوێـدا زۆر چـاوم بـۆ ژن گێـڕا، هەر پیـاو بـوو لە ئـاگردا دەخولانەوە، دەمویست بپرسم:

بەهەشت و ئاگریان گگگ...

فاتیمە دەستی نەگرتبام، تا ئێستاش بەردە سـەهۆڵێ دەبـووم بە جەستەی ئەوێوە، بە دنکە قەسپێ کە هەر لە هی سۆفیی لە خـوا پەنهان بوو دەچوو، منی بە ژیان ئاشنا کردەوە، ئیدی لەوێوە لەو دوورەوە بەسرام بە خورمـاوە لە بـاوەش گـرت، لە باوەشـگرتنێ خوداوەنــد هــیچ پەیــامبەرێکی خــۆی بەو تونــدیە لە بــاوەش نەگرتووە.

زریـان تەواو شـەکەت بووبـوو، بە نـابەدڵی بەرۆکـی چیـای بەردا، دیتم بەدیوێکدا ئاودیو بوو، خوداوەنـدە بەسـراییەکەش لە ئاوڕدانەوە قەسـپییەکانی کە لە پـێش مـنەوە دەرۆیشـت، هەسـتی پێکردبــوو کەم کەم شــێتیم لێــدەڕەویەوە، ئەو ســاتانە مــن لە بیرمچووبوو یان هەر نەمـدەزانی چەنـد ڕۆیشـتووین و بـۆ کـوێ ڕۆیشـتووین و بـۆ کـوێ دەڕۆیــن، هینــدەم دەزانــی ڕۆیشــتن ئەرکێکــی قەنــدیلیە و دەبێــت بەجێبێنــین، بەدەم ڕۆیشــتنەوە و لەسەر ریتمی بەفر شـکاندن، ئەو سـەرهاتانەی بـۆ دەخوێنـدمەوە کە لەسەر ڕێچکە ئەفسانەییەکان و لەو بۆشاییەی دەکەوێتە نێوان بەفرو تاشـەبەرد، تۆمـاری کردبـوون، فـاتیمە چـاوی لە خـولەش تیژتر بوو، پیتی سڕاوەشی دەخوێندەوە، لە کچی دارخورمـاییەوە مـن سـەرهاتی کۆڵەپشـتەکەم بیسـت، ئەو کۆڵەپشـتەی دەڵـێن ئیستاش نەکراوەتەوە، فاتیمە هەبوو نەبـووی نەبـوو، لە دەسـپێکی گێڕانەوەی هەر چیرۆکێ دەیگۆ:

ئەو قەسـپەی تـۆ دەیخۆیـت نـاوکەکەی لە کـنە مـنە، ئەو

قەسپەی من دەیخۆم ناوکەکەی لە کنە ویە.

ئەو (وی) یە گرێیەك بوو لە سەر دڵان و نەیدەکردەوە.

دەڵێن کۆڵەپشتەکە بە پشتی کوڕێکەوە بوو، بۆ جیاکردنەوە لەکاوەکانی چیا، چاوی خۆی شین کرد، ئەو چاوشینە شەوێك تووشی بە تووشی ئەفسانەیەك دەبێت، ئەفسانە پێیگوتبوو:

ئەگەر نیازی یاخیبوونت هەیە، دەبێت لە سەرەتاوە لە باوکت یاخی بیت.

ئەویش حەزی یاخیبوونی لەسەر دەڕژا، چووە ئەزموونی یاخیگەریەوە، هەرچی دەکرد باوکی پێیپێدەکەنی و لە ئەزموونەکە دەرنەدەچوو، دوای چەند خۆ جەڕباندنێك هات ناوی خۆی گۆڕی و چاوی شین کرد، لەوەوە باوکە لە جیاتی پێکەنین دەموچاوی گرژ بوو، ئیدی کوڕو لە ئەزموونی یاخیگەریتی بە نمرەی باش دەرچوو، ئیدی لە کۆلان، گەڕەك، شار، دەوڵەت، یاخی بوو.

فاتیمە لە راستە رێیە کورتەکان، رستەکانی درێژتر دەکردەوە:

ئەو زستانەی قەندیل پشتئاشانی بوو، چاوشین هەرچی راز و پەنهانی قەندیل هەیە دەیخاتە کۆڵەپشتەکەیەوە و ملی رێیەکی گرت کە من و تۆ وا پێیدا دەڕۆین، زۆر کەس بە منیشەوە هەوڵی دزینی کۆڵە پشتەکەیان داوە، بەڵام وەها بە پشتیەوە نووسانبوو، مەگەر جادوویەك لێی بکاتەوەبیستوومە دەڵێن:

ئەگەر رێکەوتننامەکەی نێوان قەندیل و هەور هەرەس بێنێ، ئەو دەمانێ رەنگبێ کۆڵەپشت و پشت دەسبەرداری یەکتر بن.

فـاتیمه تێـر تێـر سـەرهاتی بـۆ گێـڕامەوە، لە بەفـر روونتـر مانـدوویێتی پێـوە دیـار بـوو، بەڵام لێـی دەشـاردمەوە، بـۆ پتـر رەوینەوەی شێتایەتیم دەیشاردەوە، بە رستەی پچڕ پچڕ هەوراز و نشێوی لە راستە رێیەك لێكدی گرێدەدایەوە.

دەنگێک، لە دەوری ئاگرێ کـۆیکردینەوە، لەوەتەی مـرۆڤ فێـری کـارکردن بـووە، سـەختترین کـارێ رووبەرووی مـرۆڤ بووبێتەوە، لە زستانی قەندیلێ ئاگرکردنەوەیە، لەگەڵ ئەو هەمـوو سەختیەش هەر چەند ساتێکی پێچوو ئـاگر کـرایەوە، جەنگـاوەر ئەگەر لە کارەکانیدیش هێندەی ئاگرکردنەوە شـارەزا و خـاوەن ئەزموون با، پلەیەك لە مرۆڤ بەرزتر دەبۆوە، هەر بە بۆن لە بـن بەفـری ئەسـتوور چـیلکەو چـوال و دڕك و داڵان دەبینێـتەوە، بە دنـــکە شـــخاتەیەکی تەڕ، کـــۆلکە دارێکـــی تەڕی لە ئـــاو هەڵکێشراوی دەکردە مەشخەڵ.

پێشتر هەر لەو دەنگەوە بیستبووم کە:

هەموو دانیشتووان و رێبوارانی ئەو چیایە ئاگرپەرستن، ئەگەر بـۆ تـاقە شـەوێکیش رێـت بکەوێـتە ئەوێ و هەر لەو شەوەشـدا عیزرائیل بە رێکەوت تووشت بێت و بتباتە بەر دلۆڤانیـا خـودێ، ئەوا خودا دەتخاتە لیستی ئاگرپەرستانەوە، ئەوجا لە بەهەشت یان دۆزەخ لە سەر ئەو ئایینە لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات.

مـن تـا پەرسـتگای قەنـدیلم بە چـاوی خـۆم نەدیـت، ئەو قسەیەم وەکو نـوکتەیەکی خـۆش وەرگرتبـوو، ئێسـتا بە تەواوی بڕواوە و بێ هیچ زۆرلێکردن و لە دوورەوە نیشـاندانی پاداشـتێ، ئاگرپەرســتم و بە تاســەوە خــۆ ســازدەکەم بــۆ ســرووتەکانی ئاگرپەرستی، ئەوەتـا لەگەڵ فـاتیمە و دەنـگەکە و ئەوانیـدی لە

جوانترین سرووتی ئاگرپەرستیدا، عەشق دەکەین، لە دووکەڵی بخووریدا بزردەبین و رووناهیی ئاگر جاروبار دەماندرەوشێنێتەوە.

پرسی:

ها، ئێستا لە سەر کام ئایینی؟

گوتم:

هێ لە ئایینی ئاگر چ ئایینیدی ناناسم.

دەنگەکە پیاوێ بوو نازانم کێ زۆر بە گەورەیی هێنابوویە دنیا، پێدەچوو لە دەستی دەرچووبێ، بۆ تەوقەکردن لەگەڵی، دەبوو بچیتە سەر گابەردێ، یالا دەستی تەوقە دەگەیشتە دامەنی، چاو و برۆیەکی سەیرو پڕ سامی هەبوو، کوڕم دەویست لە لاوەش توانیبای بۆ چەند ساتێ سەیری بکات و رووی خۆی وەرنەگێڕێ، ئەو پیاوە لە سەردەمی ئەسکەندەری مەگدۆنیەوە بە جەنگاوەری لە دایك بووبوو، دەڵێن:

ئەگەر ئەو پیاوە نەچووبایەتە پێش سوپاکەی ئەسکەندەر، شاری خۆر تیشکێکی نەدەما.

ئەو جەنگاوەرە هەمیشە ماندوو دیار بوو، دەتگوت هەر ئێستا لە شەڕی هەندرێن، لە شەڕی ئەنفال هاتۆتەوە، لە شەڕێکی دەستەویەخەیی بە سەختی برینداز کرابوو، دەیانگوت:

پێی چەپی حەفت کیلۆ پلاتینی تێدایە.

شەلینێکی جوان دەشەلی، رێك لە تەیمووری لەنگ دەچوو، هەر کاتێ رێم بە رێی ئەو پیاوەکەوتبا، وام هەستدەکرد لەرێی داگیرکردنی جیهان رێدەکەم، ئەو گەورە جەنگاوەرە بێ

شەرمکردن لە گەورەیی خۆی باسی گەورەیی و ئازایەتی خولەی دەکرد، دەیگوت:

لە کاتی خەوتنی، خولە تاکە کەسێ کە شایەنی ئەوە بێت پاسەوانیی لێبکات جەنگیزخانە، بەڵام لە بیرتان بێت خولە دوورو نزیك خزمایەتیی لەگەڵ خەودا نیە، ئەوەی بیستبێتم یەکجار خەوی لێکەوتووە ئەویش لەناو رووبار بووە.

ئەو پیاوە لەوەتەی دنیا دنیایە، هەر ناوی گەورەیە ویستوویانە ناوی بگۆڕن، یان خۆی نیازی بووبێت بیگۆڕێت، نەگۆڕاوە، بەڵام لەو بە قەندیل کەوتنەدا بە ئاسانی گۆڕا و بووە ئیمامەی پساوە.

ئاگر تا دەهات بڵێسەدارتر و چیاش لە سپێتیدا شەوی دەکردەوە، بە دیار ئاگرەوە هەموومان رێك پشیلەی سپی بووین و هەڵتووتکابووین.

ئەوەتا بە دیار یارانی ئەشکەوتەوە دانیشتووم، هەر شەشیان بە فاتیمەوەش لە نێوان ئاگرو بەفر بەسەر چیچکانەوە مردوون، لە پەرستگای قەندیلێ تاکە ئاگرپەرستێکم جوولەی پەرستنم تیا مابێ، ئێرەییم بە هاورێ بە بەفربووەکانم دەبرد، ئەو تۆپەڵە بەفرانەی بەدیوی ئاگردا چۆڕاوگەیان بەستووە و دەڵێی چاوی زەردەشتن چۆڕ چۆڕ فرمێسکیان لێ دەچۆڕێ.

درەنگ تێگەیشتم شێتیی چیا پەرپیوەتەوە ئەوانیش، بەڵام کەمێك جیا لەو شێتیەی پێشتر هاتبووە من، لە سەر رژان بووم جارێکیدی برژێمەوە شێتی، تەزووە یادێ لە خولە، لە رژانی کردم.

له چۆکی خۆم دا که له دەستم چوو له چاوەکانیەوە هەندێ رۆشنایی بێخەوی بخوازم، رەنگبوو دڵی نەشکاندبام، بەر لەوەی بە قەندیلێ بکەوم و بێمە ریزی ئاگرپەرستانەوە، لە سەر ئەو زوورگەی گەرمیان و کوێستان لێك دابڕدەکا و پێکیان دەبەستێتەوە، خولەم دیت، چاوەکانی تژی بوون له قسە، من سەرەو کوێستانێ و ئەو بەرەو گەرمیانێ، باشووکە ئاسا دەفڕی، کەسێکیدیشی لەگەڵ بوو، لەبەر نادیاری دیاریان دەگۆتێ، ئەو جەنگاوەرەش یەکێ بوو له بابیاخیەکان، زوو ناوی خۆی گۆڕیبوو، دەیانگۆ:

ناو گۆڕین لە شێتێکەوە فێر بووبوو نەك لە ئەفسانەوە.

ئەوەی کەس سەرەدەری لێدەرنەدەکرد ئەو کوڕە لە شێتەوە هاتبوو، کەچی دەگەڵ ئەفسانە کەوتبوو، دیتم لەگەڵ خولەدا فڕی، بیرمە لە فڕینەکەدا کوڕێکیدیش لەگەڵیان بوو، هەموو خەڵکی ئەو مەملەکەتەی کە دەکەوتە نێوان دوو چیای یەک کوێستانی یەک گەرمیانی، بە شەهێن گازیان دەکرد، چ شەهێن! دەتگوت هەموو شەهێنی شاخان لە دەموچاوی و لەبەرگیراون، بەڵام خەڵکی ئەوێندەرێ دەیانگۆ:

ناوی شەهێنێ مە لە وێکچوونی سەروسەکوتی وی و شەهێنان نەهاتووە.

دەیانگۆ:

رۆژێکی هاوینی، شەهێنێ مە لەگەڵ پۆلەک شەهێنان، لە چیای کوێستانێ خۆیان دابووە سێبەرێ، لەپڕ هەواڵ دەگات کە

خوله له سەر چیای گەرمێنێ. لەشکری ئەنفال دەوری داوە و شەڕ گەرمە، ئاوی لێ بڕایە و گەلەك تینووە، ترسی گوللەی نیە، حەیفی لەوەی دێ تینوویتی بیکوژێ.

هەر هێنــدەی جــگەرەیەك دووی بکێشــی، شــەهێن بە مەتارەیەك ئاوی کوێستانەوە لەسەر چیای گەرمێنێ نیشتبۆوە، ئیدی لەوێ رۆژێوە. بە شەهێن ناودێر کرا.

دەپسێمەوە، لە زنجیرەکە دەپسێمەوە، لە یادەوریی ئەوانیش دەپسێمەوە، دێمەوە دیار یارانی ئەشکەفت.

خەوی شــێتبوون بەریــنەدەدام، خــوا کــردی بــێ داد فریامکەوت، دیارە بە دووربینــی جادوو ئاگرەکەی دیتبوو، لوورەی تۆپ هاتە گوێم، نێوان لوورە و لرمە دوورایی مژێکی قوولی جگەرە بوو، زەوی ئەگەر چەند لرمەیەکی وا بە خۆیەوە ببینێ، ناچار بە جێگۆڕکێ دەبێت، هاوڕێ مردووەکانم وەك رێواسی ناو بەفر زیندووبوونەوە، لەوێوە تێگەیشتم ئەو جۆرە تۆپانە مردووش زیندوو دەکەنەوە، ئەگەر ئەو لرمە دنیاهەژێنە نەبا، فاتیمە و ئەوانیدی لەو خەوە قوولە بەفرە ئاگرینیە بە ئاگانەدەهاتنەوە.

- ئەرێ راستە دەڵێن لەوەتەی بێ داد دادە چاوی بە ئاگرو رووناکی هەڵنایە و بەردەوام لە شەڕی ئاگردایە؟

+ منیش بیستوومە و دەڵێن وایە.

داغستانی هەڵیدایێ:

ئا ئا وایە، هیچ گومانی تێدا نیە.

داغستانی لەوەوە ئەو ناوەی لە خۆی نابوو، خۆشخوانێ بە چەند شەوێ داغستانی رەسووڵ هەمزاتۆڤی بۆ خوێندبۆوە.

چیایەك نیە لەو دنیایە ئەو پیاوە شەڕی تێدا نەکردبێت، ئەگەر تووشی شەڕیش نەبووبێت، راوی لێ دامەزراندووە، راویشی بۆ مەیسەر نەبووبێت، ئاوی لە کانیەکی خواردۆتەوە، ناوی چیایەکانی دنیای لە منداڵەکانی خۆی جوانتر لەبەربوو، لە زۆر شوێن هەتا نەتگوتبا داغستانیەکە کەس نەیدەناسیەوە چ سمێڵێکی هەبوو خودایە! بەر روومەتی هەر کچێ بکەوتایە، چۆڕ چۆڕخوێنی لێ دەچۆڕا، ئەو پیاوە لە نەخوێندەواریی خۆیەوە خەونی بە کۆڵپشتەکەوە دەدیت و لە خەونێدا لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، گەلێ شتیشی لە بارەی خولەوە دەگوت، داغستانی کە بە پێوە دەوەستا، رێك بنە داربەڕوویەکی گچکەلەی خرکەڵە بوو، لە ناو چیایانیش تەنها داخی لە قەندیل بوو، بە چاکە ناوی نەدەهێنا دەیگوت:

ئەو قەندیلە بەڵایە بەڵا، تا قەندیل مابێ شەڕی براکوژیش هەردەمێنێ.

داغستانی لەو قەندیلەدا و لە سەردەمانێکی زەبو گوللەیەکی براکوژی چووبووە دڵیەوە، تا ئێستاش وەک راسپاردەیەك لە شوێنی خۆی هەڵیگرتووە و دەستی لێنەداوە، جارێك سەردانی نەخۆشخانەکانی مۆسکۆی کردبوو، دکتۆرەکان پێیانگوتبوو:

ئێمە ئەو توانایەمان نیە نەشتەرگەریی براکوژی بکەین.

داغستانی چەندێ رقی لە قەندیل دەبۆوە بارتەقای ئەوە فاتیمەی خۆشدەویست، کەچی بە دڵی خۆی قسەیەکی لەگەڵدا نەکردووە، چوونکە لە تێری لێکدی نەدەگەیشتن، داغستانی لە

سێ رستە قسە، دوو رستەی لە بارەی قەندیلەوە بوو، دەیگۆ:

کورینە دەزانن ئەو قەندیلە چەند کلوو بەفری گرتۆتە باوەش، هێندە گوللەشی لە سینگیدا راچووە، ئەها ئەو گوللەتان دیتیە وا لە دڵێ منە، یەکەم جار بە بەردەکی قەندیلێ کەوت ئەوجا هاتە دڵی من، گوللەکان بەر لەوەی ماچی جەنگاوەران بکەن، ئەگەر بە سووکە ماچیش بێ قەندیل بەسەردەکەنەوە.

من کە بە وردی لە سمێڵی داغستانیم دەڕوانی، بە دەستە خۆم نەبوو، کات ساڵ ساڵ بەرەو پاشێ دەچوو، لە ناو بەفرەوە باڵم لێکدەدا و لە بەر ئاگردانی مالی مەلای نیوە سوور دەنیشتمەوە، لەوێ دوو وێنەی گەورە زۆر گەورە بە تەنیشت یەکەوە نیوەی لا دیوارێکیان گرتبوو، لە بن یەکیان بە خەتێکی ناخۆش نووسرابوو:

شێری خودا ئیمامی عەلی.

لەبن ئەویدی بە خەتێکی ناخۆشتر:

شێری بەشەریەت هاوڕێ ستالین.

کەوتبوومە داوی خۆشەویستیی هەردوو شێرەکە، حەزمدەکرد وێنەیەکی منیش لە نێوان ئەو دوو شێرە هەڵبواسرێ، وێنەی شێری بەشەریەت کتومت ئەو داغستانیەیە، بڕوام وایە ستالین و پیاوە داغستانیەکە هەریەکن، لەوێ ستالین بوو، لە کنە مە داغستانی، بەڵام لەوەی تێمابووم، بیستبووم:

ستالینی ئەوێ ئەگەر لە دژی وی قسۆکەك کرابا، با ئەو قسەیە لە گەرەکێکی فریشتە نشینەوەش بکەوتایەتە سەر زاران، دەهات گەرەکەکەی نغرۆ دەکرد، بەڵام ئەوەی ئێرە لە

میهرەبانیـــدا مەســـیح بە مەسـیحایەتی خـــۆی بە تـــۆزی پێشـــی ڕانەدەگەیشت.

مەلای نیوە سوور دەیگۆ:

کـــاتێ خـــوای گەورە شـــێرەکی لــۆ خـــۆی درووســـتکرد، بەشەریەتیش بیری کردەوە کە شێرەك لۆ خۆی درووستبکات، ئەوە بـــوو ســـتالینی درووســـتکرد، ئەو دوو شـــێرە هەردووکیـــان جـــێگەی ڕێـــزن و پیـــرۆزن، دەســـتکردی بە شـــەریەتیش وەك دەستکردی خوا پیرۆزە.

داغستانی کە لە دەســت بە سـمێڵ داهێنانـدا لاسـایی سـتالینی دەکردەوە، دەڵێ:

ئەها لەو پێچە بادەیتەوە دوندێك بە دیار دەکەوێ، بڵنـدترین دوندە، هەر کەسێ لە مـانگی بـرایم زێنـدینانێ بگـاتە سـەر وێ دونـدێ، شـارەزا دەبێـت بە هەمـوو نهێنییەکـانی ئاسـمانێ، بەڵام پیـاوم دەوێ دەو مانگەیـدا بگـاتە ئەوێ، دەڵـێن خـولە خـۆی گەیاندووەتێ، هەر لەبەر هەندێشە کەس تێناگات، خۆ منیش لە گەرمەی ڕۆیشـتنێ بـووم بـۆ سـەری دونـدی، بەڵام ئەو گـوللە سندانکوشتیە ساردیکردمەوە.

لەو قسـانەی داغسـتانیەوە هەوای دونـدەکە لە سـەریدام بە تێڕامانی قووڵەوە چاوم هەر لەو پێچە بوو کە داغستانی پەنـجە بە جگەرە زەردبووەکانی بۆ درێژکرد، دەمویسـت بە ڕێـی خـولەدا هەڵکشێم، داغستانی دەتگوت نیازی منی خوێندۆتەوە:

کەس بیر لە گەیشتن بە دوندی ئاسمانێ نەکاتەوە، چوونکە ئەگەر بەفـریش ڕەقـت نەکـاتەوە، یەك لە سـێ تیـرەکە ساردت

دەکاتەوە و سەگتۆپت پێدەکات، دەڵێن: تیر و کەوان بە دەستێ هەیە، هەر کەسێ بگاتە نزیك دوندەکە، سێ تیرانی تێدەگرێ مسۆگەر یەکیانت هەر پێدەکەوێ، کەسیش نازانێ تیرو کەوان بە دەست لە کیهان لاوە سێرانت لێدەگرێ.

بیستوومە ئەو تیرهاوێژە شەیتانە، ئا ئا شەیتان شەیتان، ئەو سەگبابخێوە حەزناکات بەشەر شارەزای سرو تری ئاسمان بێت، بەڵام کورینە ئەمن تێمامە نازانم خولە چۆن خۆی گەیاندێ، چۆن ئەو هەموو بەفرەی شکاند و نەبووە چلوورە، ئەدی چۆن بەر تیرێ لە تیرەکانی شەیتانێ نەکەوت، هەبێ نەبێ لەو کاتەی ئەوگەیشتۆتە ئەوێ، شەیتان خەریکی دەست بە ئاوگەیاندن بووە، جا بلێم چی.

لەو قسانەی داغستانیەوە تیری شەیتان سەری بەتالکردمەوە لە هەوای دوندە ئاسمانیەکە، گوتم باشترە بە دووی سرو تری ئاسمان نەکەوم، بکەومە دووی نهێنیەکانی زەوی، بۆچی بە پێی خۆم بچمە ناو سێرەی شەیتانەوە.

هەر حەفتمان حەفت دنکە تەزبێحی پساوە بووین، لە بیرمنیە تەزبێحەکە کەی و لە کوێ و لە دەستی کێ و بە هۆی چیەوە پسابۆوە، هێندە دەزانم ئەوە قەندیلە ئێمەی پێکەوە ئاشنا کردۆتەوە، لەوێدا زریان دەمنادەمێ هەڵیدەگرتین و پەرت و بڵاویدەکردینەوە، هەر لەوێدا لە پەنای زریانەوە ئاگر هەڵدەبوو، وەك منداڵە هەتیوەکانی خۆی لە باوەشی خۆی کۆیدەکردینەوە، ئەو چیایەی من دیتم ئەوە نەبوو کە لە کتێبی جوگرافیا و مێژوو خوێندبوومەوە، ئەوەش نەبوو کە لە نەخشە سەربازی و زۆر نهێنییەکان کێشرابوو، ئەوەش نیە وا لە بینایی تۆدا هەڵچنراوە و

لە هزرتدا لە بن بەفر خەوتووە و زریان رایدەژەنێ، نا نا کەس سەرەدەری لەو قەندیلە دەرناکات، ئەوە نالێم خولە شتێکی لێ بزانێ، لەوێدا هەندێك شەوی ساڵ هەیە بە قەد یەك ساڵی رێك بە هەموو شەو و رۆژەکانیەوە درێژە، بە قسەی پیرەمێردێ بێ کە ئەوێ ساڵێ لە نزیک کونەکۆترێ سەنگەری گرتبوو، دەیگۆت:

رێیەکی کورتیلەی قەندیلێ لە رێی حەجێ دوور و درێژترە، من ساڵێك پێش ئەوەی وشەی ئەنفال بێتە سەر زاری بنیادەم، چوومەتە حەجێ، بە چوون و هاتنەوە ساڵێك و چەند رۆژێکم پێچوو، بەڵام ئەها لەو قەندیلێهێ کەوا لێرەوە دیارە، رێم بەرێی وا کەوتووە حەفت ساڵ رۆیشتنی ویستووە.

من ئەو هەموو کاتەی تەمەنم کە نازانم چەندە، لەوێ وەك گوڵەبەرۆژە قرتاند، ئێستاو ئێستاش چی تێنەگەیشتم، نازانم لە چ کیشوەرێکەوە دەست پێدەکا و لە کوێ کۆتایی دێ، بە بەر چاوتەوە دنیایەك سەرهات بەرانگژی یەکتر دەبن بێ ئەوەی دەستت بگاتە سەرە داوێکی تێگەیشتن، لە بێ سەرو بنیدا لە دنیایێ تاقانەیە، ئەوە نیە لە چەند جێگەیەك هەندێك نهێنیی شاردبێتەوە، هەر خۆی نهێنیەکی گەورەیە و خۆی لە دنیا شاردۆتەوە، لە دینت دەکاو دینت دەداتێ، سپیترین شەو شەوی قەندیلە، شەوترین رۆژ رۆژی قەندیلە، دوندێ دەتکاتە تۆپ و دەتهاوێ، وێنەی بەرخۆڵەیێ لە باوەشی دوندێکیدی خۆت دەبینیەوە.

ئا، ئا

بەردیش ساتی نەرمبوونی هەیە

ئا، ئا

بەفریش ساتی گەرمبوونی هەیە

ئەو ساتانەی موگناتیسی خەو

بە دوا وزەی خۆیەوە هەڵدەکا و

وەك سوپای باران داگیرمدەکا

بەرد لە بەفر نەرمترە

بەفریش گەلەك گەلەك گەرمترە

لە سوخمەی ئارەقاوی

کچە رەوەندی

(سترانی جەنگاوەر)

# ٣

لە بـن دونـدێ کەوتیـنەوە، بە ئاسـمانەوە بـوو، پێنەدەچـوو پێوەندی بە چیا و زەویەوە مابێ، لەوێ سێ گابەردی گەورە، زۆر گەورەتـر لەو بەردەی پیـرەی کونەکـۆتری لە سـەر شـانیدا سەنگەری چێکردبـوو، شـەڕی ئـایەتی ئەنفـالی دەکـرد، سـەریان پێککردبوو خەوێ خەوتبوون، وەک دەڵێن:

خوداوەند دڵی نایە بە ئاگایان بێنێتەوە.

ئەو بەردانە لە بـنەوەش بە قەد سـەرێ، زیـاتریش بەفریـان گرتبـوو، هەر حەفتمـان کەوتیـنە بەفرمـاڵینی بنـێ، هـۆڵێکی سێگۆشـەیی بـوو، ئـێمە بـۆ خەوتـن پێویسـتمان بە شـەش جـێگە هەیە، کەچی لە تێری حەفت جێگەی لێ رابخە، پێدەچوو جێـی کۆبوونەوەی فریشتان بێ، فـاتیمە خەریکـی خەتـی رەشـکراوەی سەر دیوارەکان بوو:

بەخێر هاتنی ئاگرپەرستان دەکەین.

گوتم:

دەڵێی شتێکت خوێندەوە؟

پێکەنی و هیچی نەگوت.

دیسانەوە ئاگر، لێرە و لەوێ ئاگری بچووك بچووك، لە وێنەی ئەو ئاگرانەی لە دۆزەخدا بۆ ئاگرپەرستان دەکرێنەوە، سەردەستەی مراویان بە باوێشکی قووڵەوە هەر باوێشکێ جگەرە کێشانێ بوو:

دەزانن هەر کلووە بەفرێ بەر ئێرە دەکەوێ، دنکە ڤالیۆمێکی تێدایە.

سەردەستەی مراویان بە قسەی خۆی بێ، خزمی حاجی قادر دەبۆوە، لە بەر مەمکان دەبێت شیری دایکی تێری نەدەکرد، دایکەی قوڕ بەسەر زۆر جار ئەو ڕێیە دوورەی دەبڕی و دەیخستە باوەشی دایکی عەلی بەردەشانیەوە و تا مڕ دەبوو شیری دەخوارد، گەلەك جار دەیگۆ:

من هیچم لە حاجی قادر کەمتر نیە هەر دەبێت ببمە شاعیر.

شەو هەبوو حەفت شیعری درێژی دەنووسی، لە قسانیش لە هەموو تەمەنی خۆشی بە وردی و تێگەیشتنەوە شیعرێك چیە نەیخوێندبۆوە، بەردەوام بە دەنگی بەرز شیعرەکانی خۆی دەخوێندەوە، کاتێ بەدەوری ئاگردا دەخولایەوە و لە شیعری هەڵدەدا، مووغێکی زەردەشت بوو بۆ خۆی، ئەو کوڕە هەر بەگچکەیی بۆتە برادەری مراویانی گوندی، لە دەو زێ، ماڵێکی لە داریان هەبوو، شەو و رۆژ لە ناو زێدا لەگژ مەلەکردن بوو، هێندە لەناو ئاو دەمێنێتەوە تا وای لێدێ دەبێتە مەشقکار، بێچووە مراویان فێرە مەلە دەکات، دەڵێن ئەو شەوانەی لە بابی توورە دەبوو، چەند مراویەکی بەگەڵ خۆی دەدا و پێکەوە لەناو زێ شەویان دەکردەوە، لەوەوە بە سەردەستەی مراویان ناوی دێنن، لە خۆیم بیستووە:

حاجی قادر هێشتا منداڵ دەبێت لە دەو زێ پێی لە بەردەکی هەڵدەخلیسکێ و دەکەوێتە ئاوەوە، من نەبام ئاوەو ئاو دەچوو، ئەگەر دەرمنەدەهێنا، ئەو ناوە تادنیا دنیایە بڕکە شیعرێکی لێ شیننەدەبوو، من شیعرم رزگار کرد.

ئاگر لە حەفت لاوە بلێسەی دەدا، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بێت سێبەری مرۆڤیش وەك نیوە مرۆڤێ بێتە رێزەوە، ئەوا ژمارەکان خۆی لە حەفتا کەسێ دەدا، هۆڵی بن گابەردان لە تەمەنی خۆی سەمای وای بەخۆیەوە نەدیتبوو، هەر سێبەر بوو دەستی سێبەر لە دەستا، هەڵپەڕینێ هەڵدەپەڕین شەیتان ئیرەیی پێ دەبردین، بە تیچاوێ سەیری چاو و بڕۆی ئیمامەی پساوەم دەکرد، چاوو بڕۆیێ دەتگوت بنەگوێنین و تازە لە بن بەفر قیت بوونەتەوە، ئیمامەی پساوە چیاییانە دەنگی هەڵبڕی:

دەتوانن بە دڵنیاییەوە بخەون، ئێرە ئەو شوێنەیە نە تۆپی بێ داد و شام، نە هی ئێران و تورانیش نایگرێتەوە، وێناچێ شەیتانیش ڕێی بێرە کەوتبێ.

هەرگیز نەمدیتبوو داغستانی لە دەوی کەس بداتەوە:

ترحێو! کوڕە کێ دەڵێ ئێرە ئاودەستی شەیتان نیە، لێرە بەر لەوەی پشت لە نوێژکردن بهێنێ، چەندان جار دەزنوێژی هەڵگرتووە، ما جێ هەیە لە قەندیلێ ترِی شەیتانی وێنەکەوتبێ!

ئیمامەی پساوە پێکەنینێ پێکەنی دوندی لەراندەوە، لە داغستانیەوەش جوانترین بزەی سمێڵ، ئاخر ئەو تەنێ بزەی سمێلانی هەبوو، کەس گوێی لە دەنگی پێکەنینی نەبووە، سەردەستەی مراویانیش شیعرێکی پێداکرد، شیعرێ بە خوێی شیویش خزمی شیعر نەدەبۆوە، من هەر بۆ ئەوەی سەردەستەی مراویان لە قسە بکەم:

دەزانن ئێمە سەگێکمان کەمە، ئەگەر سەگێ پەیدابکەین، مێژوویەکی جوان، ئەفسانەیەکی جوانتر دووبارە دەکەینەوە.

ئیمامەی پساوە:

بەڵام سەگێک لە جۆری (سەی رێوان) ئەگەر سەیەکی وامان هەبا، لە بەڵای عەرد و عاسمان پاسی دەکردین.

داغستانی دیسانەوە هەڵیدایێ:

بە خودای ئەو قەندیلە نەفرەتیە ئێوەی هێڕو هوڕکردووە، ئەدی ئەو سەگە چیە لە بەر دەمتان!

( پەنجەی بۆ سەردەستەی مراویان درێژکرد)

- ئاخر ئەگەر سەردەستەی مراویان سەگەکە بێت، شەش دەمێنینەوە، نابێ...

+ دەڵێم هێڕبووی! ئەدی فاتیمە دوو پیاو نیە؟

هاوڕێی گیڤارا هەڵیدایێ:

ئەوەش مەڵێ ئەدی ئیمامەی پساوە بە قەد دوو پیاوان نابێت؟

- دە بە خودای مادام سەگم، نانووم و دەبێت ئەو شەو هەزار و یەك شیعرتان بۆ بخوێنمەوە و هەمووتان هێڕو هوڕ بکەم.

+ نا چاوەکەم ئەوە نەکەی! ئەمن سەگەکەم.

هاوڕێی گیڤارا وای گۆ.

هاوڕێی گیڤارا لە مێژ نەبوو لە کن گیڤارا گەڕابۆوە، گیڤارا پێیگۆتبوو:

نیازم هەیە سەردانێکی قەندیل بکەم، بەڵام ئەگەر مەرگ مەودای نەدا، تۆ لەوێ جێنشینی منی.

هاوڕێی گیڤارا هەمیشە وەك جەنگاوەرێکی لە شەڕ براوە دەدوا:

ڕاسپاردەیەکی گیڤارام پێیە بۆ خولە، بەڵام نیوەی دنیام لە دووی کرد نەمدیتەوە، لام سەیربوو چۆن خولە دەناسێ! کاتێ بەگیڤارام گۆت:

دەزانی خولە خوێندەواریی نیە.

سەری سوڕماو ئێستاش باوەڕی نەکرد، گوتی:

لە دنیایێ هەموو شتێك دەبێت، بەڵام ئەوە نابێ و نابێ!

سووربوونی گیڤارا منیشی خستە گومانەوە، منیش بڕواناکەم خوێندەواریی نەبێت.

هاوڕێی گیڤارا کەوتە گێڕانەوەی گیڤارا:

هێی! لە گەڵ گیڤارا لە دوای شەڕێکی گچکە چووینە سەر چیای سیراماسترا، لە لەبن بەردێك دانیشتین و دەستمان بە کێشانی جگەرە ئەستوورەکان کرد، هۆگری سەرهاتیش پەیدابوو، پێنووس و کاغەزی دەرهێنا و گیڤارای پرسیارڕێژکرد، پرسیار لە هەموو شتێك، پارتیزانی، زیانی جگەرە، لەناوبردنی نەخوێندەواری، نووح، مارکس، کوڕە تۆ بڵێ! ژەهرەکەی سوقرات هی فیرعەونی نازانم چەندەم، گوتەکانی خولە، نهێنیی قەندیل، هەموو شتێك،گیڤاراش حەفت دنیا وەڵامی دایەوە، لە

بیـرمه له وه‌ڵامه‌کانیـدا که ده‌هـاته سـه‌ر دوو بـابه‌ت، وشـه‌ی (ره‌نگه‌)ی زۆر به‌کار ده‌هێنا ئه‌وانیش قه‌ندیل و خوله بوون.

داغستانی قسه‌ی به هاوڕێی گیڤارا بڕی:

سه‌ربرده‌ی هۆگری سه‌رهات وا له کنه منه، له خه‌سته‌خانه‌ی مۆسکۆ له سه‌ر سه‌رم بـوو، وه‌گێڕمـان بـوو، کـاتێ دکتۆره‌کـان چاره‌ی ده‌ردی دڵی منیان پێنه‌کرا، زۆر توڕه‌بوو، له‌گژبوو به‌شه‌ڕ بێ، نه‌مهێشت، به دکتۆره‌کانی گۆ:

ئه‌نگۆ ده‌بێت بچنه کن گیڤارا، خولێکتان لۆ بکاته‌وه.

شـه‌وێك له رۆخ رووبـاری ڤۆلگـا هه‌تـا به‌دمه‌سـت بـووین ڤۆدگامان هه‌ڵچۆڕاند، پێشتریش له قه‌نـدیل دیتبـووم، ئه‌وجـا له‌و به‌دمه‌ستیه‌دا دیته‌بیرم دوو چاوپێکه‌وتنی بـۆ خوێنـدمه‌وه، یه‌کیـان له‌گه‌ڵ قه‌یسه‌رێ بوو، ئه‌ویدی له‌گه‌ڵ ستالین، ئه‌و دووه هه‌رچـی جوێنی پیسی دنیا هه‌یه به یه‌کدیان دابوو، هۆگر گۆتی:

ئه‌وانه بڵاوناکه‌مه‌وه، مرۆڤایه‌تی ئابڕووی ده‌چێت.

به حه‌فت رۆژ پێش ئه‌وه‌ی من بگه‌ڕێـمه‌وه، ئه‌و گه‌ڕابـۆوه، تایبه‌ت بۆ خوله گه‌ڕابۆوه، نیـازی بـوو ببینـێ و سـه‌ربرده‌ی وی بنووسێته‌وه.

ئه‌زژی پـــایزانێ له هه‌ورێ ئه‌و چیـــایه‌ی قه‌نـــدیل تـــیلمه هه‌ورێکی پێ به‌خشیبوو، له‌وێ کۆڵه‌پشتێکم دی، وێده‌چوو هـی شه‌هێن بێ، له سه‌ر کۆڵه‌پشته‌که وێنه‌ی گیڤارا، چنینێکـی جـوان چنرابوو، هه‌ر چه‌ندێ له سـیمای هـاوڕێی گیڤـارا ورد ده‌بـمه‌وه، چ جیاوازیه‌کی ئه‌وتۆ له نێوانیـان نـابینمه‌وه، کـێ نـاڵێ هه‌ر هه‌و نیه! هاوڕێی گیڤارا نیوه‌ی دنیا گه‌ڕابوو، ده‌وڵه‌ت نه‌بوو له‌و دنیایه

ئەو کـــوڕ شـــەڕی لەگەڵ نەکردبێـــت، هەرچـــی ســـروودی شۆڕشگێریی دنیـا هەیە لەبەریبـوو، بە چەنـدان زمـان سـروودانی دەچڕی (کوردی، رووسی، ئیسپانی، هیندی، فارسی، عەرەبـی...) وابزانم تەنها تورکی نەدەزانی، دەیگۆ:

میللەتێ تـا ئەتـاتورك بپەرستێ، سـروودی شۆڕشـگێری لـێ ناڕسکێ.

قەندیلی پڕکردبوو لە سروود، ژمارەی وشەی سـروودەکانی هاوڕێی گیڤارا کەمتر نـین لەو کلـووە بەفـرانەی لەسـەر قەنـدیل دەنیشنەوە.

ناوە نـاوە تێیهەڵـدەکرد، سـروودێکی تـایبەت بە قەندیلیشـی هەبوو.

بەر لەوەی وەك بزنە کێوی بە قەندیلێ بـکەوم، جاروبـار ئەو سـروودەم لەبەر خـۆم دەگـوتەوە، بەڵام قەنـدیل کەتنەکـی وای پێنەکردم چیدی بە سەر زمانمدا بێ.

داغستانی بە پەنجە خرپنەکانی سەرپۆشی سـمێڵی بڕکـۆکەك لە سەر دەمی لادا:

- ئەو ســروودە گەلەك خـۆش دەبـوو، ئەگەر ئەو قەنـدیلە نەفرەتیەی لەگەڵ نەبا، ئەرێ هاوڕێی گیڤارا! ناکرێ تفەکـی لەو قەندیلە بکەی؟

+ نـا نـا! نـاکرێ، قەنـدیل گیـانی سـروودەکەیە، لایـدەین دەمرێ.

- گووی سروودەکەیە.

دیتم سەردەستەی مراویان خۆی لەهاوڕێی گیڤارا نزیکدەکردەوە:

- ئەریَ تۆ شیعری دنیایێت کردە سروود، لەبەرچی شیعرێکی منیش ناکەیتیَ؟!

+ کورە تۆ چ شیعرت هەیە! وشەکانت دەڵێی بزماری سەبەن لە بەردیان دادەکوتی، خۆ من شێت نیم دەنگی خۆم بزمارڕێژ بکەم.

- سەد شیعرم هەیە لە شیعرە ئیسپانییەکە خۆشترن، ئەوەی ئەویَ رۆژیَ نەتدەبڕیەوە، بەڵام ئەنگۆ چاوتان بە من هەڵنایێ، حەزناکەن بناسرێم.

+ کەرە، ئەو سروودە جوانترین شیعری ئیسپانی و دنیاشە، تۆ چی لە شیعر دەزانی! بڕۆ هەندێك شیعری جوان بخوێنەوە، ئەوجا دەو لە شیعر بدە، دەزانی کێ ئەو سروودەی زۆر دەگوتەوە؟

- بابی زەردەشتیش گۆتبێتیەوە، لە چاو شیعرەکانی من چ نیە.

+ گیڤارا لە هەر شەڕێك دەگەڕایەوە، بەو سروودە مژدەی سەرکەوتنی دەدا هاوڕێکانی.

بە دیار ئاگرەوە سەما، سەما، پۆلای فاتیمە لە هەمووان جوانتر سەمای دەکرد، دەستی فاتیمەش لە دەستا، حالگرتنی ئەو لە هەمووان رەشبەلکتر بوو، جگە لە زاری هەموو ئازای گیانی وێردی دەخوێند، کەس تا فاتیمەش لە بارەی بێدەنگیی هەمیشەیی ئەو کوڕەوە شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی.

ئاگری ئەو شەوە لە کزی نەدەدا، بلێسە دوای بلێسە

بلێسەدارتر، دەتگوت شەیتان بەنزینی پێدادەکات، لە سیما ستالینیەکەی داغستانیەوە، رووناهیی زەردەشت چەپك چەپك دەدرەوشایەوە، سەردەستەی مراویان، مراوی ئاسا باڵی لێکدەدا و لە ئاگری ئاوی مەلەی دەکرد، فاتیمەی دارخورماییش پرچی کردبۆوە، دەتگوت دیجلەیە لە ئاگردا شەپۆلان دەدا، ئیمامەی پساوەش ریك داربەرووی بەر غەزەبی رەشەبا بوو، خەریکبوو هەموومان لە گەڵای چاوو برۆی بزر بین.

فاتیمە دوو چاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانییە

لارو لەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانیە...

ئەوە منم بۆ یەکەمین جار لەو قەندیلە گۆرانی پچڕم، لەگەڵ گۆرانیەکە فاتیمە جوانتر شەپۆلان دەدا، دەنگم تێکەڵی شەپۆلەکانی فاتیمە دەبوو، شەپۆل دەنگی منی برد، بردی بردی، تا ئەو ساتە نەمزانیبوو، قوڕگی من ئەو دەنگەی هەیە، ئەوە دوا گۆرانیشم بوو، گوێم لە دەنگی خۆم بوو، دەنگێکی خۆش و پڕ لەرە، وا دیارە قەندیل دەنگ خۆش دەکات، رەنگبێ پیرترین کەری دنیا بگاتە ئێرە و لە ناو بەفرێ و بە دیار ئاگرەوە بزەڕێ، سەی ئەلی ئەسغەری بە شاگردی دەبێت، بیرم لە بڕیاری خوداوەندی دەنگ کردەوە، ئەگەر خوداوەند کەمێ کاتی هەبا و لەو قەندیلەدا گوێی لە گۆرانیی مرۆڤ و کەر و هەموو بەندەکانی خۆی بگرتایە، بەو جۆرەی کردی، بە کەری نەدەکرد، ئەدی...

بێ شمشاڵیە، دەنا من و گۆرانییان نەگوتووە، من شمشاڵم هەبێت، هەرگیز دەنگ نادەمە گۆرانی، تەنها بە زمانی شمشاڵ گۆرانی دەچڕم، زمانی شمشاڵ لە هەموو زمانێك ناسکترە،

زولالترە، گۆرانیترە، پتر دەچێتە دڵانەوە، ئەوەی فێربێت بە پەنجە گۆرانی بڵێت، پەنجەکانی بۆ هەتایە دەبەخشێتە شمشاڵ، وەك من چۆن بەخشیمنە شمشاڵ و لێیان ناپرسمەوە و هەرگیز نەمگوتووە کوا پەنجەکانم، لەو رۆژەوەی شمشاڵەکەم چوو، پەنجەکانیشم چوون، دەمێکە بێ پەنجە ماوم، بێ پەنجەیی بوو گۆرانیم گوت و کەس نەیناسیمەوە، ئەوانە بە شمشاڵ من دەناسنەوە، فاتیمە بە شمشاڵ دەمناسێتەوە، ئەگەر شمشاڵم دەبوو، چ ئاوازێکم دەژەنی، چ سەمایەکم دەخستە نا ئەو سەمایەوە، دەبوو بە ئاوازێك توانەوەیەك بخەمە ئەو سەهۆڵبەندانەی قەندیل کە گورگ دەبەستێت، ئاوازێك بژەنم، لە هەموو میهرەبانیەك میهرەبانتر، ئاوازێك بچێتە ماڵی شەیتان و دەستی بگرێت و بیهێنێ، بیهێنێ تا دەگاتە کۆشی پڕ لە بەزەیی خوداوەند هەر بیهێنێ، لەوێ لەو کۆشە نەرمە دەست بە گریانێك بکات بە شمشاڵ نەبێت بە چ ژێر نەبێتەوە، ئاوازێك بژەنم، جەنگاوەران خۆ لە بیر کەن کە جەنگاوەرن و لە سەمادا بزر بن، ئاوازێك دەستی فاتیمە بگرێ و بڕوا بڕوا، لەو سەما بۆ ئەو سەما بیگێڕێ و تا قەندیل قەندیلە فاتیمە هەر لە سەما بێت و سەر بە ماڵی پشوودا نەکاتەوە، فاتیمە ئاشنایە بە شمشاڵی من، شەوێکی هاوینی بوو، لە شەڕێك هاتبووینەوە، پشوومان دەدا بۆ شەڕێکیدی نێوانی ئەو دوو شەڕە چیایەك بوو، شەو درەنگ بوو، بۆ ئێشککگریی بانگیانکردم، دیتم فاتیمە بە ئاگایە و ناخەوێت، نازانم چی خەوی زڕاندبوو، گوتم:

حەزت لێیە بخەویت؟

گوتی:

خەریکە شێت بم بۆ چۆرە خەوێك و خەو نایە.

نەرم نەرم شمشاڵم ژەنی، نەرمتر لەو رووبارە پایزیەی دایکانە گەڵای درەختە زیزەکانی ئەو بەر و ئەم بەری خۆی لە دەستی با وەردەگرێتەوە دەیانلاوێنێتەوە، نەرم نەرم تا دوا نەرمیی نەرم شمشاڵم بۆ فاتیمە ژەنی، هەرچی ئاوازی رووباریی هەبوو، رووباری هاوینی و پایزی من بۆ فاتیمەم ژەنی، دنیا رووناك ببۆوە من هەر شمشاڵم دەژەنی، نازانم فاتیمە لە کەیەوە خەوتبوو، چەند خەونی شمشاڵیی دیتبوو، من هەر شمشاڵم بۆ فاتیمە دەژەنی، نازانم ئێشکگرییم بۆ چەند جەنگاوەر گرت و هەر شمشاڵم ژەنی، فاتیمە تێر خەویش بوو، هەستایەوەش من هەر ئاوازی خەوتنم بۆ فاتیمە دەخوێند.

لەو شەوەوە فاتمە بووە سەوداسەری شمشاڵ، لە هەر جێگەیەك تووشم بایە حەزی لێبوو شمشاڵی بۆ بژەنم، بەڵام کەم جار نەبێت دەنا دڵیم شکاندووە، ئێستا شمشاڵم هەبا، هێندەی هەمووو دڵشکانەکانم بە زیادەوەش بۆ دەژەنند، بە قەد فرمێسکەکانی زەردەشت دەبوو ئاوازی بۆ بژەنم، ئەو فرمێسکانەی لە کاتی ماڵاوایی لە قەندیل بە سەر بەفردا دڵۆپ دڵۆپ هەڵیوەراند.

بیستوومە لە زۆر کەسانم بیستووە:

زەردەشت نەیویستووە لە ئاقاری قەندیل بچێتە هیچ ئاقارێکیدی، بەڵام موغەکان زۆریان لێکردووە، زۆر تکایان لێکردووە، کە دەبێت ئێرە چۆلبکات، ئیدی نازانرێ چۆن رازی دەبێت، دەگێڕنەوە لەو جێگەیەی کەشکۆلەکەی بە کۆڵی دادایە تا دوا سنووری سپیی قەندیل هەر فرمێسکی داباراندووە، لێی دەپرسن:

ئەو هەموو فرمێسکە بۆ؟

باگۆنـاداتەوە، زۆر هەوڵـی لەگەڵ دەدەن هـۆی ئەو هەمـوو فرمێسکە گەرمەیان بۆ روونبکاتەوە، بـێ کەڵـکە و هـیچ ناڵێـت، هەندێك دەڵێن ویستوویەتی لەو بـارەیەوە قسـەیەك بکـات، بەڵام هەنسك و گریان رێگەی قسەیان پێنەداوە، ئیدی هەتـا سەریشـی نایەوە، گریان هەوک و چاوی بەرنەدا، چەندی کردی و کردی هەوکەش نەیتوانی قسەیەك بکات، بەرد هـاتە زمان، زەردەشـت نەهاتە گۆ.

- راوەستن راوەستن شیعرم هات

+ کورە گووت هات.

- هەر دەیڵێم:

ئۆخەی ئۆخەی خودایە

لە بیرم نەبوو

هەندێك شەکرو چام پێ مایە

بنە مەتارەی بینن

نۆش نۆش چای هەڵقوڕێنن

ئەوە جوانترین شیعری دنیایێیە، هەموو سـروودەکانی هـاوڕێی گیڤارا دەهێنێ، شیعر دەبێت تامی چا بدا.

ئیمامەی پساوە پێش هەمـووان بـنە مەتـارەی هێنـا، بە دزیەوە گۆتم:

جوانترین شیعرە لە ناو شیعرەکانی سەردەستەی مراویان.

چـا چ چـا! ئەگەر لە یەکەم رۆژی کە مـرۆڤ بە دنیـایێ

وەربوو، هەندێ تۆچا و شەکریشیان بۆ رووکردبا، بڕوا ناکەم هەتا هەتایێ لۆچەکی گرژی لە مێژووی مرۆڤایەتی دەرکەوتبا، ئێوە نازانن بە تامترین چا، چای ناو بەفری دیار ئاگرێیە.

سەردەستەی مراویان بە دەم فڕ لە جایە دانەوە:

توخوا شیعری من بزماری سەبێیە! کوڕە شیعرە چایە شیعرە چا.

هەر بنەمەتارە بوو هەڵمی ئارامیی لێ هەڵدەستا، تەنها سەردەستەی مراویان نەبێ، بە شیرانەوە دەیشیعراند، بۆوەی رستەکانی سەردەستەی مراویان بپسێنم، ئەو رستانەی هەندێکیان سێ بەقەد بەژنی ئیمامەی پساوە دەبوون، بۆوەی گوێم لە دەنگی پۆڵای فاتیمە بێت:

- ئەرێ چۆن رێت لە تەیمووری لەنگ گرت؟

+ زۆر گوتراوەتەوە پێویست ناکات.

وا بوو، زۆر گوترابۆوە، بەڵام لە زاری خۆیەوە نا، دەگێڕنەوە:

کاتێ تەیمووری لەنگ رێی دەکەوێتە ئەو چیاو چۆڵانەی ئەولا – کام لا؟ - پۆڵای فاتیمە و چەند جەنگاوەرێ رەنگبێ فاتیمەشیان لەگەڵبووبێ، رێی پێدەگرن و رێنادەن بە ئاقاری ئەواندا تێپەڕێ، شەڕ گەرم دەبێت، لەشکری تەیموور پیس دەشکێ، تەیموور هاوار دەکات:

- بە خۆشی رێ بەردەی باشترە، من تەیموورم!

+ زۆر تەیموورم لێرە کردۆتە خواردنی درندان، بگەڕێوە باشترە، بە دەستی ئەو ژنە خۆت بە کوشت مەدە.

- واز لەو ژنە بێنە و دەگەڵ مـن کەوە، کـاتێ هیندسـتانم گرت، تەیموور پاشا نەبم، ئەگەر نیوەی هیندستانێت دە قەبەر نەکەم.

+ چاوێکی ئەو ژنە بە هەموو خاکی هیندستان ناگۆڕمەوە.

- پیاوەکی زۆر کەرە خۆی لێ لادەین باشترە.

تەیموور تا ڕێی خۆی نەگۆڕی، پێی بە هیندستانێ نەکەوت.

هەر ئەو پـۆڵای فـاتیمەیە، زوو هێشـتا زەردەشـت قەنـدیلی بەجـێ نەهێشـتبوو، ماڵیـان لە دەو ئەلـوەن دەبێـت، ئەو دەمەی حوسێن لە کەربەلا لێی دەقەومـێ، لە ڕێـی بـاوە برووسـکەیێکی بۆدەکات:

بگە هانام...

پۆڵای فاتیمە تاکێ پێڵاو لە پێ دەکات بەویدی ڕاناگات، تـا دەگاتە ئاقاری کەربەلا پشوو نادات، بەڵام بەسەر چی دا بچێـت و چ ببینێ! خوێن لاشەی دەبرد، لاشەی حوسێن بێ سەر مابوو، نەیارانی حوسێن دەوری پـۆڵای فـاتیمە دەدەن، هەرچـی شـێر و تیری شامی و قوڕەیشـیان هەیە، بە سـەر ویـدا دەبـارێ، کەچـی پەنجەیەکیشی بە خوێن نایە، ئەو کوڕە لەوێوە دەبێتە پۆڵا.

وەبیرمدێ لە ناو قەیسـەری دووکـانێکی وێنەفرۆشـی هەبـوو، وێـنەی گەورە گەورەی هەڵواسـی بـوو، ئەودەمەی مـن دەیڵـێم هێشتا تازیمانەی پاشای شاری خۆر هەڵنەگیرابوو، ناوی کۆشکی پاشا هەر کۆشك بوو نەبووبووە مەزاری سولتان مـوزەفەر، پـڕ بە گەرووی قەیسەری هاواری دەکرد:

وەرن ئەوەتا کوڕی شێر! کوڕی شێری خوا بە دە عانە.

چەندێ لە سەرو سەکوتی پۆلای فاتیمە رادەمێنم، ئەو دە عانەیەم بیر دێتەوە کە دایکم بردی و بەکوڕی شێرەوە گەڕایەوە ماڵێ.

دەگێڕنەوە: پۆلای فاتیمە بەر لەوەی سەرەو زێد هەڵکشێ و ئاقاری کەربەلا بەجێبێڵێ، حەفتا شەو و حەفتا رۆژی لە سۆراخی سەری براوی حوسێن کردۆتەوە.

ئەو قەندیلە سەررێژی گومانی کردووم، قسەی من نیە! قەندیل لە چاو تروو کانێکا مردووی سەردەمی نوحیش زیندوو دەکاتەوە و دەیهێنی لە تەنیشت تۆوە سەمای ئاگری پێدەکا و لە بنە مەتارە چایەت لەگەڵ دەخواتەوە، هەر ئەو قەندیلە لە تەنیشتتەوە دەستی زیندووێك دەگرێ و دەیبا دەیبا تا دەگاتە رابردوویەکی دوور دوورو لەوێدا لەبن عەردی دەنێ.

قەندیل چوار وەرزەی ساڵ ئاوێنەیە، بڵێم دوو وەرزە، چوونکێ ساڵی ئێرە دوو وەرزە، وەرزێکیان تەمەنی هەر رۆژێك دەبێت، رۆژەکانیدی هەمووی وەرزەکەیدی دەیبات، بە گۆتەی گۆتیاری:

لە چلەی زستانێ و لەو ساتانەی زریان هەموو دوندەکانی پێکدی دەگەیەنێ و بۆ میزکردنیش دۆڵێ نابینیەوە، ئا ئەو دەمانەی لە هێلکەی زەوی دەچێت، چاوێك هەبێ بە رووی زریان بێتەوە، بینای لە بینایی وی ببڕێ و نەیترووکێنێ، ئا لەو ئاوێنەیەوە بە روونی هەموو کوڕو کچانی حەوا بە زیندوو مردووەوە بە زیندوویێتی دەبینێ و دەشێتوانێ یەکە یەکە قسانیشیان دەگەڵدا بکات.

ئێرە دەفتەری بیرەوەریی هەموو مرۆڤێکە، هەر کەسێ چ

خوا چ شەیتان بە قەندیلی بێخێ، ئەگەر حەز بکات هەموو سەرهاتی خۆی چ هی ساتەکانی ئاگایی چ ئەوانەی لە خەویدا خەوتوون، چ ئەوانەش کە لە زیندە خەوێ یەخەی گرتوون، دەتوانێ هەموو ئەوانە لەو دەفتەرە بخوێنێتەوە، ئیمامەی پساوە دەڵێ:

دەڵێن: خولە و زریانی قەندیلێ چاو لە چاوی ئێکدی دەبڕن خولە نابەزێ و نابەزێ.

ئیمامەی پساوە واز لە خولە ناهێنێ و سەربردەی وی دەگێڕێتەوە:

لێی دەپرسن: ئەرێ (کونەکورگ)ی تۆ لە چیەوە هاتووە ؟

گوتوویەتی:

بەو چاوانەی خۆم زەمانی حەفتاو حەفت پاشای شارم بە چاوی خۆم دیتیە، لەو پاشایانە یەکەمیان نا، ئەوانیدی هەر هەموویان لە پەنای ئەو تفەنگەی دەستمەوە گەیشتوونەتە سەر تەختی پاشایەتی، ئەمن نەبام بە خەونیش تاجیان لە سەر نەدەنا، ئەوەی دوایی لێدەرکە لە تازیمانەی هەمووشیان تەقەی خۆشیم کردیە، ببەڵام یەکەمیان نەبێ، دەنا ئەوانیدی خڕیان رۆژێك پێش ئەوەی تاجی پاشایەتی لە سەر نێن، گەلەك گفتی هەنگوینیان بە مە دایە وەکوو:

خولە، بەس ئەمن ببمە پاشا، پیاو نەبم ئەگەر زێدەکەت نەکەمە جوانترین چەپکە گوڵ، دەبێت لە ناو گوڵدانی شار لە دوورەوە دیار بێ و بۆن و بەرامەی بە سەر هەموو مەملەکەتی برژێنێ، ئەوجا هەر مێوانەك رێی بەو مەملەکەتەی بکەوێ، پێی دەڵێم:

بنۆڕە ئەها ئەوە ماڵی خولە گوڵە!

شەرتبێ لە شەرتی برادەرایەتیمان دەبێترێدەکەت بکەمە بەهەشتی ئارامی و هیچ گورگەك بە خەونی شەویش ڕێی بەو گوندەی نەکەوێ.

بەڵام ئەوان ناپیاوەتیان لە یەکدی گرتبۆوە، ئەمن لەگەڵ هیچ لەو پاشیانە لە دانە ڕۆژەکی زیاتر برادەر نەبوومە، لۆ دانی هێواریێ کە چوویتمەوە ماڵێ، دەبینم پاشای تازە چەند گورگەکی لۆ من بە دیاری هەناردیە و دەورەی ماڵییان گرتیە، ئەمنیش کردیتمە تەق و تۆق، لۆیە ئەو تفەنگەی من هەرگیز بێنی نەدایە، ناوی کونەگورگ لەوەی هاتیە و من ئەو ناوەم بە سەردا بڕیە.

بە خولەیان گۆتیە:

- باشە تۆ بۆچی یەك هەڵەت حەفتاو ئۆندە جارە بێ دەسکاری و بە یەك شێوە ئۆندە بارە کردۆتەوە؟

+ شێت حەفتاو حەفت جۆری هەیە ( بە پێکەنینەوە) من هەرجارەی جۆرێ لەو جۆرە شێتانە بووم،کورە خەڵکەکی زۆر لەو دنیایە وەکی منن، بەڵام من هەست پێدەکەم کەچی ئەنگۆ...

-باشە تۆ کە پاشای کۆنت وەلا دەنا، بۆ خۆت نەدەبوویتە پاشای تازە؟

+ ئاخر هەرچی پاشای دنیایێ هەیە، لە گورگ گورگترن، منیش ببمە گورگ ؟! بەڵام بڕیارمداوە لە مەو پاشی نەبمە چاوساخی کەس، چاویشیان دەرێ، دەستی کەس ناگرم و نایبەمە سەر تەختی پاشایەتی، بەڵام لەگەڵ پاشای ئێستا و

ئەوانەی لە دوای ئەویش دێن، ئاشتنابمەوە و دەبێت شانەکم هەر لە ملەی ئەوان بێت.

ئیمای پساوە و هەموو ئەو کەسانەی لە خولە دەدوان و سەرهاتی ئەویان دەگێڕایەوە، کاتێ دەتپرسی:

کێ وای گۆ؟ بە چاوی خۆت دیتت؟

دەیگۆ:

منیش بیستوومە.

هەر ئەوە بوو.

داغستانی دەستی بۆ کیسە تووتنەکەی برد، ئەو کیسەیەی فەردە توتنێکی دەگرت، بە خێرا خۆی جگەرەیەکی بۆ منیش پێچایەوە، بە بیرمداهات ئەو سپێدەیەی ئادەم و حەوا لە سەر زەوی نیشتنەوە، ئەگەر داغستانی هەبا سەرو جگەرەی پێشکەش کردبان و بە پۆلووە ئاگری چا لە سەر رژاو دایانگیرساندبا، لەوێوە تا ئێرە مرۆڤێکت نەدەدیتەوە، بە خێرایی و بێ بیرکردنەوەی قووڵ بڕیار لە سەر هیچ شتێك بدات.

سەردەستەی مراویان هەر شیعری دەخوێندەوە و کەسیش گوێی نەدەدایێ، داغستانی شیعری پێبڕی و گوتی:

بەسە، دنیات لە گوو گرت، سەربردەیێ نازانی؟

سەردەستەی مراویان کەمێ داما:

با، بەڵام بەو شیعرە دەستپێدەکەم.

هەموو توند کونە گوێی خۆمان گرت، کاتێ پەنجەمان لە گوێمان کردەوە، ئەو گەیشتبووە سەربردەکە:

ئەو دووە ئەگەر لە ساتەکانی خەوتن و دەست بە ئاو گەیاندن دەسبەرداری یەکتر بان، دەنا هەر بەیەکەوە بوون و لێکدی دانەدەبڕان، ئەو گوللە تۆپانە گابەردیان لێکدی دەکرد زەفەریان بەو دووە نەدەبرد و لێکدی جیا نەدەبوونەوە، لە ناو کەشتییەکەی نووحیش بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون، لەوەتەی لە کەشتییەکەش دابەزیون هەر بەیەکەوەن، ئەوە نیە لە شەڕیشدا هەر یەکیان سەنگەر خۆشدەکا و جێی ئەویدیش دەکاتەوە، ئەنتی عارەب دەڵێتە جەنگاوەرێک:

- هەرگیزلە حەمرین بەو دیودا نەچی، بۆ هیچ مەبەستەکی، ئەگەر بە نیازی شەڕکردن بوو قەینا.

+ نا نا ئەوە مەڵێ، ئەوە نابێ.

-کوڕە کوڕی ئاسمان، تۆ ئەو بەرەبابە ناناسی بە قسەی من بکە، هەر کەسێ لەو دیوەوە بەم دیودا هات، تەقەی لێ بکە، مەپرسە کوڕی عەلییە هی عومەرە، بابی موحەمەد مەهدی جەواهێریە،کورە هەر کەسەك لەم دیوەوەش بەرەو ئەو دیو ڕۆیشت بە گوللەی گەرم ساردی بکەوە، لە سەلاحەدینی ئەیووبی پیاوتر نابێ.

- کوو وا دەبێ!

+ وا نابێ ! لە بیرت چوو نەنکتیان چ لێکرد؟ دەرپێیەکەیان لۆ کێندەرێ برد؟!

- ئەمن لە دەرپێی نەنکمەوە بیر ناکەمەوە.

+ ئەدی لە چیەوە بیر دەکەیتەوە؟

- لەو قاوەیەی لە ماڵە بێ دادیەک خواردمەوە.

+ به خودای بەو قاوەیە دەمری، هەبێ نەبێ ژەهری ناو قاوەکە ئیکسپایەر بووە، دەنا هەتا ئێستا سندانی دەگەیاندێ.

- وا نیە، ئەدی بەو خەڵکانەی ئەودیوی حەمرین چ دەڵێی! ئەوەتە شان بەشانی تۆ لە شەڕێدان؟

+ به خودای ئەتو زۆر کەری، بڕۆ لە ناو گووی بیربکەوە، دەزانی ئەو رەفیقلعەزیزانە...

- نا لەسەر گووی!

هەڵاتبوو بۆ گووکردن- راوەستە ئێستا دێمەوە- ئەوجا هەندێك دەڵێن هەر ئەو (دێمەوە)یە بوو، ئێستاو ئیستا نەهاتەوە، هەندێکیدی دەڵێن:

نا دەستوبرد گەڕایەوە و سازشیان کرد، بە کەوچکی چا نەرمییان لەگەڵ یەکدی گۆڕییەوە.

**ئەو دەمانەی وێنەی رستەی ئەزبەرکراو**

**لە سەر پێم بۆ رژان**

**رژان بۆ تویلی پەرەگرافی خەو**

**رووپەڕێکم نادەنێ بۆ پالکەوتن**

**ساتێکیش خەو شیعر ئاسا دەزڕێ**

**دنیا باوەشی خەو دەکاتەوە**

**(سترانی جەنگاوەر)**

## ٤

له قەندیلێ و له ساته‌کانی گورگەخەویدا، رازێکم دیتەوە، وێناچێ هیچ جێیەکی دنیایێ ئەو شتەی تێدابێ که له لێره هەیە، شتێك هەندێ جار دەتتۆقێنێ، تۆقینێکی وا چ کورێکی دنیای باوکان بەو شێوە له باوکی نەتۆقیوە، جارناجاریش ئارامیەك دەبەخشێ، چ دایکێك ئارامیی وای بە کۆرپەکەی نەبەخشیوە، هەر کەسێ پێ بخاتە قەندیلێ و بتوانێ برەك چاو له چاوی زریان ببرێ، بە مەرجێ پێشترێ ئەویندار بووبێ، ئەوا هەموو سەرهاتی تەمەنی خۆی بە روونیش نەبێ، بە لێلی دەبینێ.

چاودێ، له زگی ژنێ هاتمە دەرێ، کۆمەڵێ ژن دەوریان داوم، ئەها شتەکیان لێکردم، وا دەگرییم، نەتدیتیە! وا له پەرۆکم دەپێچن، ئەها بەو ژنەی دەڵێم دایە، بەو پیاوەش بابە، جانتام له پشتێیە دەچمە قوتابخانە، دەستم بۆ داری ئەو ئەفەندیە گرتۆتەوە، هەمووی دەبینم، ئەو کچەم ماچکرد، پیاوێ دارێکی بە سەرما کێشا،کتێبێ دەخوێنمەوە، سێ پۆلیس بە دوام کەوتوون، گەیشتمە ئاقاری، دەرچووم.

ئێرە بە کونەگورگ دەچێ، بۆچی لام نەدایە ماڵی خولە! گەیشتمە ئاقارەکیدی، ئەو کۆمەڵە چەکدارە چین؟ نەمکوژن، ئەها ئەوە خولەیە، ئەو شتە چ بوو لێیم وەرگرت! جوان دیار نیە

زۆر لێڵە دەڵێی تفەنگە! ئەو هەموو کۆترە لە کوێوە هاتن، ئەو چیایە بڵندە کێندەرە! قەندیل نەبێ!

تەواو، ئاوێنە پشتی تێکردم، لە ناو باسوخواسانی جەنگاوەرانی پساوە وەئاگاهاتمەوە.

فاتیمە دەڵێ:

لاپەڕە هەڵنەدراوەکانی قەندیل، بە قەد هەموو ئاسمانان نهێنیان تێدایە.

سەردەستەی مراویان دەڵێ:

لە خولەم بیستووە، لەو سەری قەندیل ( نازانم کیها سەری) دوندێك هەیە دبێژنە وی جاسووسان، ئەو جاسووسانە چاوی دەرەوەی قەندیلە، کاری ئەو چاوە هەواڵگریە، وێنەگریە، جاسووسە ئەمما جاسووس! هیچ پەیامبەرێك بە زەردەشتیشەوە چاوی وای نەبووە، هەرچی سڕو تری دنیا هەیە بە رەنگ و دەنگەوە، بە بۆن و تامەوە لە کن ئەو جاسووسانەیە، وێنەی هەموو دنیا دەگرێ و دەیداتە قەندیل، ئەو چاوە وردە زیندەوەر و گیاوگۆڵی بنی دەریاکان دەبینێ، لە دوورترین بیاباندا مێرووله دەبینێ، هەر ئەو جاسووسانە دەبینێ و ئاگای لێیە جوولەیەك، وێنەیەك، دەنگەك ئەگەر بیەوێ ئاقاری قەندیل بەجێبێڵێ، یەکسەر دوندەکیدی ئاگادار دەکاتەوە، ئەو دوندەشیان (چەکوچ)ی ناوە، ئەو چەکوچە هێندەی بڵێی یەك و دوو دەگاتە سەریان و پانیاندەکاتەوە، چما شتەك هەیە لە دەستی ئەو چەکوچە دەرچێ! بەڵام ئەوە هەیە ئەو چاوە جاسووسە سەرەکەیدیکەی قەندیل نابینێ و چەکوچەکەش ناگاتە وێندەرێ.

هاوڕێی گیڤارا پرسی:

- خولە ئەوەی چۆن زانیوە؟

+ من ئەوە نازانم.

داغستانی هەڵیدایێ:

-کەس ئەو سەربردەی لە خولە نەبیستووە، ئەوەت لە سەگایەتی خۆتەوە هەڵبەستووە!

+ بە خوا قسەی خولەیە، بەڵام با قسەی تۆ بێ.

- نا نا بە راست هی خۆتە یان هی ئەو؟

+ دەبا پێشت بڵێم گۆتیتی:

ئەگەر ژن و مێرد هۆدەی خۆیان کونبڕ بکەن و دەرگە و پەنجەران لە قیرپیش بگرن، لە سێرەی چاوی ئەو جاسووسانە دەرناچن و بە رووتی وێنەیان دەگرێ، ئێستا ئەو قەندیلەی جوان بگەڕێی وێنەی پادشا و ژنەکانیان بە رووتی لە بن لێفە دەبینیەوە.

لەو دەمە سەردەستەی مراویان ئەو قسانەی بۆ کردا!

موچڕکی ترس لە تەوقی سەرمەوە هات و گەیشتە بنی پێم، نیشانەی موچڕکەم لە وانیدیش بەدیکرد، فاتیمە و پۆڵای فاتیمە نا، هەموومان دەستمان بۆ جگەرە برد، لە مژی جگەرەوە تێگەیشتم هەموومان بیر لە جاسووسان دەکەینەوە، دیتم لە نێوان ئیمامەی پساوە و داغستانی و فاتیمە بووە فسکەفسك و مقۆمقۆ، هێندەم لێیان هەڵکڕاند، هیچیان لە بیریان نەمابوو جاری پێشی بە

کام سەری قەندیل ئاقاری قەندیلیان بڕیبوو، وردە وردە بەرزتر و روونتر قسانیان دەکرد:

- نازانم ئەو جاسووسانە لە کوێیە.

- کاتێ قەندیل هەڵیدامە مۆسکۆ نازانم بە کام دەست و لە کام سەرەوە بووا

- بزانم رۆژ لە کوێوە بەرەو کوێ دەچێت، دوورنیە رێم بە رێی دەرچوونی جاری پێشی بکەوێتەوە.

- تڕحێوا شەیتانیش لە قەندیلێ دەزانێ رێی رۆژێ لە کوێیە؟ تەنها ئەگەر خولە جاسووسان بناسێتەوە و بزانێ لە کێندەرێیە، ئەو خولە زیندەیە لە هەمووجێیەك هەیە، لە بەختی مە لێرە بە دیار ناکەوێ، ئاخر لۆ بەرەو گەرمیانێ رۆیشتی!

پۆلای فاتیمە:

واز لەو قسانە بهێنن، کێ لە دوای من ئێشککگرە؟ نهێنیی شەو چیە؟

لەوەتەی بە قەندیلێ کەوتووین، ئەوە درێژترین رستە بوو لە زاری بێتە دەرێ، بە قسە هاتنی پۆلای فاتیمە، ترسی چەکوچ و جاسووسانی نزیکتر خستەوە، ئاخر کەس گوێی لەو کوڕە نەبووە لە خۆوە هەڵداتە قسان، تەنها ئەگە پرسیارڕێژی بکەی، ئەویش ئەگەر بە ئا و نا وەڵامت بداتەوە، لە دڵی خۆم گوتم هەبێ نەبێ پرسیارەکی گەلەك گرنگ و ترسناك رژایتە دڵی ئەو کوڕەوە، ئیمامەی پساوە پارچە کاغەزێکی دەرهێنا:

فاتیمە لەدواتە، نهێنیی شەویش خولە.

کەنگێ ترسم لە دڵ با، باشتر دەنووستم، کەسم نەدیتیە وەك من بێ، ترساوەکان هەمیشە بە ئاگان، لە پەنایەکیش هەڵکورمێن هەر لە سەر پێن، ترساوەکان بێ چاوترووکان چاودەگێرن و لە هەمسوو لاوە تـرس دەبیـنن، خەو بـۆ جەژنـانەش سـەردانی ترسـاوەکان ناکـات،کەچی مـن رەنگبـێ لە هەموویـان زیـاتر بترسێم، ترسێك تا ئەوەتا کەوتمە ناو چاوی جاسووسانەوە، ئێستا نـا دەمێکیـدی چەکـوچەکەم دەگـاتێ و دەمکـاتە لیتـاوی بەفـر، کەچی خەو بەرمنادا، نازانم کێ بوو پێیگوتم:

من دڵنیام تۆ بە پێوە نامری، بە دانیشتنەوەش نـامری، تـۆ لە خەوێکی قووڵ دەمری.

لەگێـنە وابـێ، مـن ترسـنۆکترین ئـازا بـم، دەترسـم بە زیندوویێتی چاوان بمرم، کێ زاتی ئەوە دەکـات بە ئاگـاییەوە بە خێرهـاتنی مەرگ بکـات! مـن پیـاوی ئەوە نـیم، بەرگەی ئەوە ناگرم، ئەگەر لە خەوێدا بێ، مـردن چ ترسـەکی نـیە، تـا مـن لە ساتە ترساوەکان، لەو سـاتانەی هەرەشـەی گەورە چـوار دەورت دەدا و نە رێـگەیەك هەیە بـۆ هەڵاتـن نە بەرانگـژی چـارەت دەکات، نووستن تـاکە رێـیە، نـازانم بـۆچی لەو سـاتە ترسـاویانە دەچـمە خەوە و خەو بەرمنـادا! ئەوەتـا کیسـەی خەو سـینگ و بەرۆکی بۆم کردۆتەوە و بانگمدەکات.

سەردەستەی مراویان دەستی بە زگی خۆیدا هێنا:

زۆر گچکە بوویتەوە بەتاڵە.

چاوی بڕیە ئیمامەی پساوە:

ئەو پیاوە لە برسان دەمانکوژێ، تا کەنگی لێرە دەمێنینەوە؟!

+ دوا ئێشــکگر بــا لە نیــوەی ئێشــکگریەکەی چــایەکە دێمبکات و بانگمان بکات.

- ئەرێ هاورێی گیڤارا دە تـوش بیرێـك بـکەوە بە کـام لادا برۆین؟ نەکەوینە بەر چاو و چەکوچەکە.

+ لە سەر مە رۆیشتنە.

من دوا ئێشکگر بووم، ئەو جارەش فاتیمە بە ئاگایهێنـام، لـێم پرسی:

- من زوو لە قسـەو باسـان دابـڕام، پـێش نووسـتنێ گەیشـتنە کێندەرێ؟

+پێش دابڕان و دوای دابڕان وەکوو یەکە، هـیچ نەگـۆترا و هیچ نەکرا.

جاسووســـان ئێســـتا لە منـــدا چەقـــی بیرکـــردنەوەیە، هەر بیرۆکەیەك لە جاسووسانەوە یا بەرەو ئەوێ هەڵنەکـا، لە مێشـکما تەمەنی زۆر درێژ بێ، هێندەی تف رۆکـردنێکە، هەر دەنگـێ لە (چەکوچ)ەوە بەرزو نزم نەبێتەوە، لە گوێی مندا دەنگی نیە، بـای ســـەرهات گێـــڕانەوەیەك چـــاوە خەواڵووەکـــانمی کـــردەوە، گێڕانەوەیەك زۆر پێش نازلبوونی ئایەتی ئەنفال.

کوڕێـك هەبـوو رێ حێـی نـاو بـوو، لە سـەر ئەو (ح)یە راکێش راکێش بـوو، هەنـدێك دەیـانبردەوە حەمـرین، هەنـدێك هێندەیان رادەکێشا هەتـا وڵاتـی حەج گیـر نەدەبـوون، زۆریـش دەیـانگۆت: هێنـدە راکـێش راکێشـی پـێمەکەن، لەو حەسـارە رایگـرن و تەواو، لەگەڵ ئەو رێ حێیە بە دیـار بـابەگوڕگوڕەوە دانیشتبووین و خۆمان گەرمدەکردەوە، سەربردەیەکی گێڕایەوە:

رۆژێك ئەنتی عارەب لە پڕا پشتاو پشت بە حەمرینێ کەوت، کە چووینە سەری:

هـا چ بـوو ؟ کـێ و لە کوێـوە وا بە حەمرینـی دادای؟ تێگەیشتین لە قەندیلەوە فڕێدرایە.

گوتی:

هێندەم زانی چیایەك کە لە شێوەی چەکوچ بوو، چەکوچێك بە قەد دنیـایەك گەورە، بـۆم هـات، بەڵام مـن زوو خـۆم هەڵـدا، هەڵدانێکی وا لێرە کەوتمەوە.

گوتی:

- ئێرە کوێیە؟

+ حەمرینە

-دیوی ئاگر یا دیوی حووشتر؟

+ دیوی خۆمان

- سوپاس خوایە.

خولە گەیشتە سەری:

چ نیە هەندێك ئاوی بۆ بێنن.

دوای ئەوە نەمدیتەوە.

وردە وردە، ئەفسـانەی چەکـوچ و جاسووسـان و ئەوانەم بیردەکەوتەوە.

له جێیه‌كـی سـارد بتخسـتایه‌ته نـاو بـابه‌گوڕگوڕیش گه‌رمنه‌ده‌بۆوه‌، ڕێحێم دیته‌وه‌، ئه‌و جه‌نگاوه‌ره‌ چا خـۆره‌وه‌یه‌كی بـێ ڕه‌زا بـوو، چایخـانه‌یه‌ك تـایبه‌ت بـۆ ئه‌و چـای لێبنـایه‌، پێیـڕا نه‌ده‌گه‌یشت، مه‌گه‌ر من هێنـده‌ی ئه‌و چـا بخـۆمه‌وه‌، به‌ ده‌م چـا خواردنه‌وه‌ قسه‌یه‌كی خـوله‌ی گێـڕایه‌وه‌، به‌ڵام له‌ زاری خـوله‌وه‌ نا، له‌ زاری زارانه‌وه‌ نازانم به‌ چه‌ند پشت ده‌گه‌یشته‌وه‌ خوله‌:

*له‌و قه‌ندیله‌ دۆڵێك هه‌یه‌ (كۆگه‌)ی ناوه‌، ڕێك ده‌كه‌وێته‌ بـن پێلـووی جاسووسـانه‌وه‌ ئه‌و كـۆگه‌یه‌ له‌ هه‌ر حه‌فـت سـاڵێك، حه‌فت ڕۆژ خۆی پیشانده‌دات، ئه‌گه‌ر كه‌سێك هه‌بێ له‌و حه‌فت ڕۆژه‌ی حه‌فت ساڵه‌یه‌، بگاته‌ ئه‌وێ و به‌ وردی له‌ كۆگه‌ بڕوانێ، دنیا به‌كـۆن و تـازه‌وه‌ ده‌بینـێ، كـۆگه‌ كۆگـای وێـنه‌ و ده‌نـگه‌، سینه‌مایه‌كه‌ هه‌رچی فیلمی تۆ بته‌وێ نیشانده‌درێ.*

ده‌ڵێن خوله‌ زۆر فیلمی له‌وێ دیوه‌.

له‌ ئه‌فسانه‌وه‌ به‌رده‌بمه‌وه‌ ناو یارانی به‌فر.

له‌ سـه‌ر به‌فـرو به‌ دیـار ئـاگره‌وه‌ ورتـكه‌ نانمـان به‌ چـاوه‌ ده‌خوارد، ئه‌و ورتكه‌ نانـانه‌ی له‌ نـاو كۆڵه‌پشـتا چه‌نـدان كه‌ڕه‌ت چووبوونه‌وه‌ نـاو دۆخـی هه‌ویـری و گه‌ڕابـوونه‌وه‌ سـه‌ر دۆخـی نانی، هێ له‌ قه‌سپه‌كانی فاتیمه‌ له‌و قه‌ندیله‌ هیچ هێنـده‌ی ورتـكه‌ نان به‌ چاوه‌ خۆش نیه‌، ڕێك تامی ئه‌و سـاتانه‌ی ده‌دا، سـاته‌كانی برسێتی كه‌ به‌ منداڵی نانم ده‌خسته‌ ناو چایه‌ی زۆر گه‌رمه‌وه‌.

پشتم له‌ سیانیان و ڕووم له‌ سێیه‌كه‌یدی كرد:

ئێوه‌ بیستووتانه‌ له‌ قه‌ندیل جێیه‌ك هه‌بێ به‌ ناوی كۆگه‌؟

داغستانی:

ویتاچێ ئەو ناوە لە قەندیل دەستبکەوێ، بەڵام نازانم لە رووسیا هەیە یا نا!

ئیمامەی پساوە:

کۆگە؟! کۆ...گە...کۆ... گە نامۆ نیە! لە کوێیە کوێ؟ لە کێم بیستووە! ئا ئا ناویم بیستووە،بەڵام نازانم دیتمە یان نا، ئا بیرمکەوتەوە، جوامێرێ باسی کرد، خۆ دەیناسن! پێکەوە لە بازاڕێکی ئەو خوارە، بە دوای شتێکدا دەگەڕاین، دەمانچە بوو شتەکی ئەوها، هەینێ ئەوێ بازاڕێکی گەورەی دنیایێ بوو، هەرچی بەرهەمی خوا و مرۆڤە لەو بازاڕەدا دەستدەکەوت، هەموو بازرگانە گەورەکانی دنیا روویان تێدەکرد، باشترین چەکو تەقەمەنی، باشترین تریاك، شەراب، هەنگوین، جوانترین کچ لەو بازاڕەدا هەراج دەکران، لەوێ جوامێر قسەی هێنایە سەر ئەو کۆگەیە:

ئەها لەو بەرزاییەی ئاودیو بیت، جێگەیەك هەیە کۆگەی پێدەڵێن، من خۆم نەمدیوە، دەڵێن کۆگە هەمیشە بزرە و کەس نایبینێ، بە چەندان ساڵ جارێك بە دیاردەکەوێت، لەو کۆگەیە وێنەی ئێرەی هەموو تێدایە، بە هی من و تۆشەوە، ئەو قسەی لێیدەکەن، وەك تەلەفزیۆنە، نا نا لەو عەنتیکەترا مەسەلەن تۆ شتێکت لێ ون دەبێت، ئەگەر بچیە کۆگە، لە وێنە شوێنەکە دیار دەخات و دەڵێ: بڕوانە ئەوەتە شتەکەت.

بیستوومە خولە لێرە، تەزبێحەکەی بزر دەبێت، چەندی دەگەڕێ نایدۆزێتەوە، خۆی دەگەیێنێتە کۆگە، کاتێ دیتەوە بێ

پرسیارکردن راستەو راست دەچێتە سەر ئەو جێگەیەی تەزبێحەکەی لێ کەوتووە و هەڵیدەگرێتەوە، بەڵام نەمبیستووە لە خولە بترازێ کەسیدی بە چاوی خۆی کۆگەی بینیبێ.

ئیمامەی پساوە بە ئاخ هەڵکێشان و دەست لە چۆکدانەوە:

بەڵام من بە هەندم وەرنەگرت و وەك سووکە بایەك بە بن گوێمدا رەت بوو

فاتیمە بە پرسیارەوە، لە سەر سەرم راوەستاوە:

ئەو ناوە لە لای من ئاشنایە ئاشناتر لە ناوی خۆم، بەڵام هیچ لە بارەیەوە نازانم، نازانم لە زەویە یان لە ئاسمان، پێمبڵێ تۆ ئەو پرسیارەت لە کوێ هەڵگرتۆتەوە؟ خۆت چی لە بارەیەوە دەزانی؟

لە سەر سەرم راوەستاوە، وەك بڵێی من بیری ئاوبم و ئەو پەقرەجی شۆڕکردبێتەوە و لە چاوەڕێی پەقرەجەکە بێت بە پڕ ئاوەوە، فاتیمە زۆر تینوو بوو، تینووی وەڵام لە منەوە، خۆزگەم دەخواست ببمە پەقرەجێ پڕ لە وەڵام و بڕژێمە فاتیمەوە و بۆ هەتایە تینوویتی بشکێنم، ئای خولە لە کوێی! ئەگەر بە هێمای ئاڵۆزیش بێت، چۆرێك کۆگەم پێ ببەخشە، لە فاتیمە تینووترم.

**ها بۆ قسەیەك ناکەیت؟**

ئۆهـ، خۆ فاتیمە هەر لەسەر سەرم وەستاوە و چاوەڕێی وەڵامە، ئەوە جاری یەکەم بوو، فاتیمەی دوورە دەست هەڵمبگرێ و لە فاتیمەی بەردەستمم دووربخاتەوە و ئاگام لێی ببڕێ.

- دەبێت بیگەمێ، خولە ببینم، دەنا هیچی لێ نازانم.

+ ئێ دەڵێی چی ڕۆیشتنت پێباشە یان بمێنینەوە؟

- باشترە جارێ بمێنینەوە، ئەگەر ئیمامەی پساوە پێی باش بێت.

هەرحەفتمان دنکە تەزبێحی پساوە بووین، جیاوازیی ئیمامەی پساوە لە ئێمە ئەوەبوو ئەو ئیمامە بوو، دنکە تەزبێح بە تەزبێحەوە واتایەك دەبەخشێ، تەزبێح لە پسانەوەدا بە واتاوە دەپسێ، لە پسانەوەدا ئیمامەکەشی هەر هێندەی دنکە پساوەکانیدی واتای بۆ دەمێنێتەوە، داماننا بمێنینەوە، رووم لە سێیەکەیدی کرد:

باشترە بچینە راوێ.

چووین، بەو پەڕی نائومێدیەوە هەنگاوی راویمان دەنا، چەند تەقەیێ، کوشتی، هاوڕێی گیڤارا کوشتی، فیلەتەنێ بە بۆڕە بۆڕ غلۆر بۆوە، کەس دەنگی نەناسیەوە، پۆلای فاتیمە بەو بێدەنگی و تێرامانە قووڵەی خۆی نەیناسیەوە، سەردەستەی مراویان دەستی بە کەولکردنی کرد نەیناسیەوە، داغستانی کە کەلو پارچەی کرد نەیناسیەوە، سەری فیلەتەنی لە پێش خۆی دانابوو، تەماشای ناو چاوی دەکرد، ورد ورد لێی وردەبۆوە، لە لمۆزی، لە کەپووی، دەوی، ددانەکانی، گوێی، وردەبۆوە، نەیناسیەوە، دەیگوت:

لە هیچ چیایەك، لە هیچ جێگەیەکی دنیا ئاژەڵی ئەوهام نەدیتووە.

هێنامانەوە، نەماننناسیەوە، وا لێی دەخۆین هەر نەناسرایەوە، داغستانی بەدەم تکە لێدانەوە:

- خۆشترین گۆشت ئەو گۆشتەیە.

نەیناسییەوە.

- ناخۆشترین شتیش ئەوەیە، بکوژی و نەزانی چیە.

- ئەدی کەوڵی بکەی و نەزانی چیە؟

ئیمامەی پساوە:

لە ئاقاری قەندیل ئەو قسانە و زۆر پرسیاریدی بە بادا دەچن، وەڵامتان دەست ناکەوێت.

تا دەگاتە بەردەم دەروازەی دڵنیایی دڵنیابوومەوە لەوەی قەندیل لە ساڵەکانی خۆیدا، دەبێت چەند رۆژێکی نامۆی لە خۆیدا هەڵگرتبێ، چەند رۆژێ تەواو نەوازە، رۆژەکانی و بە شێوەیەکی جیا، جووت دێنەوە لەگەڵ رۆژەکانی دەرەوەی قەندیل، هەبێ نەبێ هەر دەرچوونێ لە قەندیل دەکەوێتە رۆژێ لە رۆژە نەوازەکان، بەڵام ئەو رۆژانە لە کوێن و کەی دێن!

**ئەودەمانێ خەیاڵ، خەیاڵ**

**خەیاڵ باڵی هەموو باڵندانی هەبوو**

**بە سەر دەریا بە سەر شاخان**

**لە ساتێکا گەرمیانی دەکرد، کوێستانی دەکرد**

**وەلێ ئێستا لە جاسووسانا**

**لە دەرەوەی فڕین هێلانەی چێکریە**

**باڵی نیە بۆ تاوێ فڕین**

هەر بایێ لە جاسووسانەوە نێ

ئومێدی پێ ناشنێتەوە

هەر دەنگێ لەوێوە هەڵنەکا

گوێ شك نابەم بۆ بیستنی

هەر رەنگێ لەوێوە دانەکا

دیدەم نیە بۆ دیتنی

(سترانی جەنگاوەر)

## ٥

کـۆڕی گەرمـی ئاگرپەرسـتان، ئەگەر چیلکەیـێ نەمێنـێ بـۆ سـووتان، بڵێسـەی لێنـابڕێ، ئـێمە و ئـاگر دەڵێـی جمکـانەی قەندیلین، لە بێ دادەوە هەرچی تۆپی دنیـا هەیە، رووەو قەنـدیل لـوورەی دەهـات و نەیـدەگرتینەوە، دەنگـی تـۆپ هەنـدێ جـار ئـاوێتەی دەنگـی سەردەسـتەی مراویـان و کەمتـریش ئـاوێزانی دەنگی هاوڕێی گیڤارا:

قەندیل بوو ئاگری وەهای خستە جەرگەوە

بە عەشقەوە وا دەڕۆین بەرەو پیری مەرگەوە

سەردەسـتەی مراویـان دەیزانـی کەس گـوێ لە شـیعرەکانی ناگرێ، دەیدیت لە ترسی شـیعری ئەو، هەمـوو پەنـجە دەپەسـتنە گوێی خۆیـانەوە، بەڵام دەنـگە شـیعری سەردەسـتەی مراویـان لە پەنـجە دەگەڕێـتەوە! نەدەوەسـتا هەتـا دەگەیشـتە بنەبـانی مێشـك، بەردەوام بزمـاری لە سـەبە دەکـوتی، بەڵام خاتریشـی دەگـرتین، ناوە ناوە دەچووە بێدەنگیەکی زۆر قووڵەوە، دەمـدیت لە پـۆلای فـاتیمەش قـووڵتر رۆچـووە، لە قـووڵایی بێـدەنگیەوە لەهـیکەوە قسەیەکی دەهاویشت:

قسەیەك دەکەم رەنگە باوەڕنەکەن بەڵام بە راسـتیمە، لەوەتەی بە بیرمدێ هەر ئەو شەرواڵەم لەبەرە و نەمگۆڕیوە!

ئیمامەی پساوە:

چۆن باوەڕناکەین! دەزانم ئەو مامانەی لە کن لاقی داکت دانیشتبوو بە دەستی خۆی ئەو شەروالەی لە پێکردی.

لە شەروالێ سەردەستەی مراویان، تێر تێر زەینم دایە شەروالی خۆ، بەشەروالدا شۆڕبوومەوە پێدا سەرکەوتمەوە تا نە گەیشتمەوە ئەوێ دانەسەکنام، لەوێ شەروالێکم لە پێ بوو سەد سووندت دەخوارد لەبەردەم سەگەکانی ئەتاتورك هەڵگیراوەتەوە، چەند کون لەو دنیایە هەیە هێندە کونەی تێدابوو، دیتم جەنگاوەرێ ورد دەڕوانیە شەرواڵەکەم، دەتگوت لە کونەکانەوە نهێنیی دنیای بینیوە، هاتە پێشێ:

+ شەروالێکی زیادم پێیە، ئەوە فڕێدە.

- یادگاریی دایکمە

+ دەزانم بەلام...

-نا فێرە شەروال گۆڕینم مەکە.

بەزۆری زۆردارەکی پێی داکەندم و لە پێیکردم.

لە قسەکانی ئەو جەنگاوەرەوە تێگەیشتم لە هیچ شتێك دڵنیا نیە، هەتا لە گووکردنێش، بۆئەوەی دژایەتی خۆی بکا و لە خۆی یاخی بێت، دڵنیایی بە خۆیەوە ناوە،گێڕایەوە:

*ئەز هی تووڕەقیم، ئەو جێیەی لە شەیتان رەقەکارترە، نەك هەر تووەکەی، هەموو شتەك لەوێ بە رەقی شین دەبێت و گەورە دەبێت و وشك دەبێت بە منیشەوە، لە بیرمە بابم بردمیە حوجرە بۆوەی دواتر رێی بەهەشتێ نیشانی خەڵك بدەم، حەزم*

لێنەبوو، بەزۆر بردمی، مەلای حوجرە لە هەمووان رەقتر بوو، هەتا ئاویشی بە رەقی دەخواردەوە، ئێ، نەحەوامەوە،گۆتمە بابم:

بشمکوژی ناچمە حوجرە.

نیوە مردی کردم، بەلام چاوم بە مەلا نەکەوتەوە، ئەوجارە بردمیە قوتابخانە بۆ وەی دواتر بە قسەی خۆی رێی دۆزەخ پیشانی خەڵك بدەم، چ ببینم! دیتم کوڕی مەلا مامۆستایە، کوڕ لە باب رەقتر، هەواشی بە رەقیەوە هەڵدەمژی، نەحەوامەوە، گۆتمە بابم:

نیوە مردیت کردووم، نیوەکەی دیکەش تەواوکە.

دایکم زوو گەیشتێ دەنا تەواوی دەکرد.

گوتیان: لەو دنیایە دوو رێ هەیەو هەردووکت لە پێشە رێی سێیەم نیە، یەکیان دەتباتە کن کوڕ ئەویدیش دەگاتەوەکن باب، چارت نیە و هەڵبژێرە.

زۆر لە رێی سێیەم دەگەڕام نەمدیتەوە، شەوەك لە خەونێدا پیاوەك هاتە سەر سەرم:

وەرە ئاقاری کونەگورگ، خولەم.

هەر هێندە و بەئاگاهاتمەوە، یەکسەر هەستامەوە، هێشتا شەو زۆری مابوو، کەڵەبابیش لە خەوێدا بوو، راستەو راست چوومە سەر سەری بابم:

+ بابە، بابە هە کورە بابا، ئۆندەی لە خۆی هەڵدا.

- ئەوە چیە، چ بووە!!

*+ هەڵمبژارد.*

*- حوجرە یا مەکتەب؟*

*+کونەگورگ*

*-کونە گورگ چیە، کورە شێت بووی؟*

*ئیدی چاوم بە بابم نەکەوتەوە.*

لەو پسانەوەیە، دەنک دەنک، دەنکە پساوەکانم بیردەکەوتەوە، بە خەیاڵ هەڵمدەگرتنەوە، ئەو دەنکەیان ئەوەیە کە میزی بە خەسار نەدەدا.

بە تۆبزی دەیبەنە سەربازی، شەڕەك دێتە پێشێ، سەرکردە گوتارێ دەدا:

ئەو کەسە بە هەڵوێستە کەسینگی خۆی بداتە بەر گوللە و نەگەڕێتەوە، ئەوەی رابکات بێ هەڵوێستی کوڕی بێ هەڵوێستە.

کوڕە لە دڵی خۆی دەڵێ:

من هەڵدێم و بە هەڵوێستیشم.

ئیدی بە هەڵوێستەوە هەڵدێ و دەگاتە دەستەی خولە.

رۆژێ بە نیازی گرتن دەچێتە سەر مۆڵگەی سەربازان، دەبینێ سێ چار سەرباز وەك مەڕبۆخۆیان نووستوون، لەو کاتە میزی دێت، دەڵێ:

پێش ئەوەی دیلیان بکەم، با میزەکیان پێدا بکەم.

مەسینەی میزیان لە سەر رادەگرێ، سەربازێ لەوانیدی پتر بەر میزێ دەکەوێ هاواردەکات:

کورە هەستن رێژنە بارانە!

کورە لە پێکەنینا لە سەر پشت دەکەوێ، هێزی دۆخین بە ستنەوەشی تێدا نامینێ، ئیدی تەقەی لێدەکەن، پوختە گوللەك بە قوونی دەکەوێ، ئەوجا پێکەنین بەری دەدا و هەر کووەك دەبێت خۆی رزگار دەکات، دوایی گوتبووی:

قوون هیچ نیە، چابوو بە جێی میزم نەکەوت.

ئەو کورە، پێچەوانەی کوڕانیدی، لە باب نا، لە دایکی یاخی دەبێ.

فاتیمە لەناو دەنکە پساوە بزربووەکان، دەستمی دەگرت و دەیهێنامەوە دیار رووناکیی خۆی.

رووخساری فاتیمە ئاگرێ بوو نەدەکوژایەوە، ئاگر لەودا بڵێسەی دەدا و لە دوورەوە دەدرەوشایەوە، کە لێم نزیك دەبۆوە، گەرمایيەکی دەرژاندە گیانمەوە، هیچ پیری تەریقەتێ نەیرژاندۆتە دەروونی موریدەوە:

+ ماوەیەکە زۆر سەردانی بێدەنگی دەکەی، بە مالی قسە ناکەویەوە! وابروا ناوت دەنێین ( پۆلا٢)

- چەند رۆژێکی سالی قەندیلم بزرکردووە سۆراخیان دەکەم.

+ ئەو رۆژە بزربووانە، دوورە لە مالی بێدەنگیدا بدۆزرێنەوە.

- فاتیمە تۆ پێمبڵێ....

+ ئا سەرە داوی سەرهاتێکم دیتەوە، لە بیرتە کە لە دۆڵە رەقە دەوردرابووین و بێ داد زۆر لە ئێستا تونـدتر دەیکوتـاین، لەوێ لەکوڕی زار پڕقسە گوێم لێی بوو:

خواوەنـد هەڵیـداین، تـا لە کـۆگە بنیشـینەوە، بە هەڵە لە رەقە کەوتینەوە.

لێمپرسی:

کۆگە چیە؟ لە کوێیە؟!

گوتی:

نەمـدیتووە، بەڵام بیسـتوومە کە خۆشـترین جێیە لە دنیـایێ، ئەسحابەیێ بە هەڵە رێـی کەوتبـووە ئەوێ، لە دیـن وەرگەڕابـوو گۆتبووی بەهەشـت لەسـەر دنیـایە نەك لە بـن دنیـا، هەواڵـی ئەو کۆگەیە دەڵێن لە زاری خولەوە دزەی کردووە و کەوتۆتە سـەر زاران.

مـن بە هەنـدم هەڵنەگـرت و لە سـەری نەڕۆیشـتم، وەك نوکتەیەکی خۆش وەرمگرت، خۆت دەزانی ئەو کوڕە گیرفـانی پڕ نـوکتە بـوو، نوکتەکـانی خـولەی لە سـورەتی فاتیحـا رەوانتـر لەبەر بوو، خۆ دێتەوە بیرت، دەیناسی؟

- ئا ئا ئەوە نەبوو، تاکەکەس بۆ تەوقەکردن لەگەڵ ئیمـامەی پساوە پێویستی بە چوونە سەر بەردی گەورە نەبوو؟

+ با با، تا بن قەندیلیش لەگەڵمان بوو، دواتر تۆپەکە پەرتـی کردین و تەزبێحەکە جارێکیدیش پسایەوە.

- ئێ چیدی!

+ لە بیرەوەریمدا، جارێ کۆگە هەر هێندە جێیەی هەیە.

نۆبەتـداری لەگەڵ تەمەنەو نـابڕێتەوە، زنجیـرەیەکە بە چـاوی گورگیش چاوی بدێ، جێ پسانەوەیەکی تێـدا نـابینیەوە، بەهـای نووستن لە ساتەکانی پێش نۆبەتداری، پڕە لە واتـاو لە واتـاوە بە ئاگا دێت، لە خەوی خەوناوی خەوتبـووم، خەونێکـی گێـراوەی خەنـاوی، خەنەیەك لە خەنەی بووکـان خەنەتـر، بـانگیکردم و لە خەونی خەناوی کردم:

+ بەئاگام نەدەهێنایەوە، با دوو فڕ بادە بخۆینەوە.

- بادە! تەشتێ خەونی خەناوی بەلاگێڕی چۆڕێ بادە بێت.

هەندێ ڤۆدگای لە ناو کۆڵەپشتەکەی پاراستبوو، منیشـی لێـی بێ بەش نەکرد،

لە شەوی سپیی قەندیلی کە بەفری جێیان، لە چـاو هـی وێ، چـاو ب بە رەشـایی دەخوێنـدەوە، تـك تـك لە نـووری مەی دەتـوامەوە، تـوانەوەیەك کلـووە بەفـری سـەر هـیچ ئـاگرێ پێینەگەیشتبوو، پێشـیناگات، ئـاوێتەیەك لە مـن و ڤۆدگـا و بەفـرو ئاگر، چاوەڕێی توانەوەی پۆلای فاتیمەش بووم، ئێسـتا نـا ئێسـتا، لە توانەوەیدا دەچمەوە ناو رازە رژاوەکـانی و بە هەڵگرتنەوەیـان رانـاگەم، رەق رەق دەبـوومەوە، دەتـوامەوە، رژ رژ دەڕژامەوە، گیر گیر دەگیرامەوە، پۆلا هەر پۆلا بوو، شاراوەیی وی کونێکی تێـنەکەوت، کەوچـکە قسـەیەکی نەگـوتراوی لێـوە نەڕژا، سەردەسـتەی مراویـانیش بە شـیعری خەواڵـووەوە گەیشـتێ،

نەگوتراوێ لە پۆلاوەوە نەهات.

سەردەستەی مراویان بڕیاری خۆی دابوو، دەبێت ببێتە شاعیر، کۆڵەپشتەکەی شیعرێکیدی نەدەگرت، نەماندەزانی ئەو هەموو پارچە کاخەزە لە کوێ دێنێ، دەیگۆت:

ئاخ نەمردبام ئەو رۆژەم بە چاوی خۆم دیتبا، شیعری من سروودی سەر زاری و جەنگاوەرەرانی دنیا با، سپارتاکۆس بە شیعری من لە خەو هەستابا، خولە بە شیعری من خەوی لێبکەوێ.

سەردەستەی مراویان خڕ خڕ لە دەوری ئاگر دەخولایەوە و بەفر لە بن پێی کرتە کرتی بوو.

+ ئێ تۆ شتەکی لێ دەزانی، کەنگی دەبمە شاعیری تەواو؟!

- لە شیعر گەڕێ، ئەگەر سەربردەیەکت لە دەنکە پساوەکان هەیە، بگێڕەوە.

+ زۆرم لەبیرە، تۆ خولەی سەر منارەت بیستووە؟

لەمێژ نەبوو فەرمانی قەدەخەکردنی بادە لە بیابانەوە دەرچووبوو، هەرکەسێك بادەی بە دەستەوە گیرابا، دەیانگرت و بە جەڕە و جامی بادەوە هەڵیاندەدا، هەڵدانێ، لە بنەبانی دۆزەخێ بە عەرد دەکەوت، ئەو فەرمانە بووە فەرمانی پاشای شاری خۆریش، بە پێی خۆی کۆڵان کۆڵان دەگەڕا، دەرگا دەرگا بۆنی دەکرد، لە هەر ماڵێکەوە بۆنی بادە هاتبا، بە ڕێی بیاباندا ڕەوانەی ئەو دنیای دەکرد، تا وای لێهات فەرمان بووە دەستوورێك لە سەر خەڵکی چیا و چۆلانیش پێڕەوکرا، دەگێڕنەوە: خولە تا ئەوەدەمانێ بۆ دەرمانیش فرە بادەیەکی بە

لێوی نەکەوتبوو، دەیانگوت: هەر بۆنی بۆی هاتبا، هێلنجی دەهاتێ.

بەڵام دەمەو عەسرانێك، خولە بە گۆزەیێ شەڕابەوە دەچێتە سەر منارەی چۆلی و بانڕادەدێرێ:

مادام فەرمان لە پاشاوەیە، سوڕ بزانم پێشی دەمرم، دەبێت لەمەودوا لە باتی ئاو، هەموو سبەینانێکی قومەك لە شەراب بە حەڵاڵی بخۆمەوە.

جەندرمە لە سەر قەڵات بۆی شۆڕدەبنەوە، هەتا دەگەنە بن منارە، خارە گەیشتیتە کونەگورگ، هەتا ڕێی کونەگورگ دەبیننەوە، خولە لە کونەکۆتر دەنیشێتەوە، تێکەڵ کۆتران دەبێ، دنیای لە دوو دەکەن نایبیننەوە.

## *کوڕینە، ئێوە بۆنی میزی شەیتان نەکەن؟*

داغستانی بە بۆنی میز منی لە بادە و خەیاڵی بادە و سەربردەی بادە کرد:

ئێمەی حەوتەوانە هێشتا وا لە هۆڵی کۆبوونەوە، ئەو هۆڵەی سەروەختانێ فریشتەکانیش ئێمە ئاسا، بۆ کۆبوونەوە تیایدا کۆدەبوونەوە، پێدەچێت قسەو باسی ئەوانیش لە بارەی نهێنیی زەویەوە بووبێ و ئاکامیش بە جانتای بەتاڵەوە و بە دلشکاوی پایدۆسیان لێکردبێ، بۆیە سەروەختانێکدی لە سەردەم وەگەڕێکیدی، شەیتان بە نا بەدڵی و لە ناچاریەوە کردبێتیە ئاودەست.

## کوڕینە، ئێوە بۆنی میزی شەیتان ناکەن؟

ئاودەست بە رووخسەتخوازی لە شەیتان دەبێتەوە هۆڵی کۆبوونەوە، کۆبوونەوەیەك جێگە بۆ تەمەنی بە جێماوی هەموو کۆبوونەوە عەردی و ئاسمانیەکان دەکاتەوە، کۆبوونەوە هێندەی بە لارێی بێدەنگیدا رێدەکا، دەڵێی بە ساتمەی پسانەوەیەك ناگات، هێندە ناچێتەوە سەر راستە رێی قسە، ئەو قسانەی لە پساوەیی تەزبێحەوە کەوتبوونەوە، لێرەوە سەری قسە (جاسووسان)ە و بنی قسە (کۆگە) لە نێوان سەر و بنیشدا، دەکەوێتە ژێر بەزەیی (چەکوچ)ەوە و لە دنکە پساوەکانی تەزبێح پەرت و پەرتتر، لێرەو لەوێ بە دنکە بەجێماوەکان، بە دنکە پساوەکان، بۆ چەند ساتێکی خاترانە بە یەك دەگەینەوە، لەوانیشەوە بەو سەردا بە کەلاوەکەی حەواو ئادەم دەکەوینەوە و بە سەرەکەیدی دێینەوە بەردەم (چەکوچ) و دەستی خۆ بەدەستەوەدان بەرز دەکەینەوە، بەفر، ئاگر، گۆشتی نەناسراو، چایە، جگەرە، سەما، خەوتن، لە توێی هەموویان، نۆبەتداری دیسانەوە نۆبەتداری، نۆ بەت دا ری.

ئەوە فاتیمەیە بە لەنجەولاری ئاگراویەوە کە بەفر لێیەوە پرووشەی دەکات، وا هات وەلامەوە، بە سەرمەوە وەستاوە، وا کەوتمە بەر سێبەری نادیاری هەیکەلێکی یۆنانیەوە، پرسی:

من دەمێکە داوم بە داوی خەیاڵێکی دوو سەرەوە بووە، هەریەکەی بۆ کونێکم رادەکێشێ (کۆتر) لەو سەر (گورگ) لەوسەر، دەمەوێ تێبگەم ئەو دووە لە کوێوە تێکدەکەنەوە، تۆ چی لە بارەوە دەزانی؟

ئەو پرسیارەی بە نیوەچڵی لە خۆمم دەکرد و دەمێدی

پیاسەی پچڕ پچڕم لە ئاقاریدا دەکرد، ئەوەتا فاتیمە بە گۆڕێی وەرکرد، ترسام، لە فاتیمە ترسام، هەستمکرد فاتیمە سیخوڕی خوداوەندە بە سەر نەستی منەوە، خۆزگە دەخوازم فاتیمە لەبیرچوونەوە بێ، ئەگەر مرۆڤ نەوەی لە بیرچوونەوە با و گیانداران هەموو، بە باڵدارو بێ باڵەوە لە رەچەڵەکی لەبیرچوونەوە بان، ئەو دنیایە کێشەیەکی ئاڵۆزی تێنەدەکەوت، کێشەکان لەو پرسیارانە دەکەونەوە کە هەرگیز لە بیرناچنەوە و هەمیشە بە پێوە وەستاوین بۆ تیلمە وەڵامێ، فاتیمە دەپرسێ:

ها قسەیەکت نیە؟

ئای فاتیمەی بۆ وەڵام بە پێوە وەستاو!گوتم:

تۆ بە بای وەڵام بشنێیەوە جوانی، هێندە بە بای پرسیار لەنجان مەکە!

گوتی:

جوانیەکان لە سیمای وەڵامەوە خۆ نمایش دەکەن، بەڵام هەناسە لە پرسیارەوە وەردەگرن، هەموو جوانیەکان سەر بە ئاقاری پرسیارن، جوانیی قەندیلیش لەوە دایە، دەتخاتە بەر ریژنەی پرسیارەوە، من جاری پێشی لە قەندیلێ کەم مامەوە، هێندە نەکەوتمە ناو سێرەی پرسیارانەوە، من دەمەوێ کەمێك نزیك ببمەوە لەو سەرە داوەی وا لە کونێك لە کونەکان بزربووە و سەرەکەیدی دەگاتەوە کونەکەیدی.

گوتم:

منیش هیچی لێ نازانم، پێناچێ کەسیش... وای بۆ دەچم هەردوو سەرەکەی وا بە پەنجەکانی خولەوە، ئەو پەنجانەی لە

تفەنگ نابنەوە، هیچ نازانم، ئەوە نەبێت دەڵێن:

لە نێوان ئەو دوو کونە سێ ڕێگە هەیە، سێ ڕێـگە ئەو دوو کونە بە یەکەوە دەبەسـتنەوە، ڕێـگەی زەوی، ڕێـگەی ئاسـمانی، ڕێگەی سێیەم بن زەوی.

کەڕەتێ وا بـزانم ڕێـم بە ڕێـی سـێیەم کەوت، لە پێدەشـتێ تووشـم بە تووشـی دێـوێکی زنجیـرداری ئەنفـالەوە بـوو، چەنـد پێوەنـا، دەتگـوت لەگەڵ ئەویشـم نـیە، هـات و نەگەڕایەوە، دوو پـێم هەبـوو، دووانیشـم خواسـت، کەوتە دوام، هێنـدەی نەمـابوو بمگرێت، چاڵێکم هاتە پێش خۆم هەڵدایە نـاوی، چـاڵ چ چـاڵ! لە بنی کونێکی لێدەبۆوە، کون و کـون ڕۆیشـتم، ڕۆیشـتم، هەر ڕۆیشتم، نـازانم چەنـد ڕۆیشـتم، لە جێـیەك دەبیـنم هەر کـونە لە کون دەبێتەوە، نەمزانی بە کام کونـدا بـڕۆم، دانیشـتم پشـووێکی باشم دا، ترسام زۆر ترسام، نەمـدەزانی کـام ڕێگەیـان دەمبـاتەوە ئەودیوی ئەنفال، چەنـدی دەمکـرد، ڕێـم دانەدەگـرت، هەنـدێك دەڕۆیشـتم، دەگەڕامەوە ڕێیەکیـدیم دەگـرت، لەویـش پەشـیمان دەبوومەوە، ئیدی تەواو بێدەسەڵاتی و نائومێـدی دایگـرتم، چـیم بە دەستەوە نەما، شمشاڵ نەبێت، شمشـاڵ ئەو هـاوڕێیەی هەمیشـە بە هانـام هـاتووە، فـووم بە شمشـاڵدا کـرد، بە مەزەنـدەی خـۆم هەرچـی زینـدەوەری بـن زەوی هەیە، گوێیـان لە شمشـاڵی مـن بـووە، نـازانم چەنـد بەنـدم چـڕی! هێنـدە دەزانـم لە کونێـك لە کونەکـانەوە لایتێـك لە چـاوی دام، لێـوم لە سـەر شمشـاڵ هەڵگرت،گـوێم لە دەنگێـك بـوو، دەنگێـك دوور زۆر دوور، دەتگوت لە بن عەردەوە لەو سەری دنیایە:

وەرە، بێرەدا وەرە، ئێرە کونەکۆترە.

به گۆتەی گۆتیاری خوله فەرموویەتی:

هیچ پاشایەک ناتوانێت لە یەك کاتدا هەر سێ ڕێگاکە بگرێت، خۆی بکوژێت، هەرچی جەندرمەی دنیایێ هەیە بیرژێنێتە نێوان ئەو دوو کونەوە، ڕێگەیەکی پێدەگیرێ، ئەوپەڕی با دوو ڕێگە بگرێت، ڕێگەیەگ هەر دەمێنێتەوە، بۆیە بۆ جەنگاوەران ڕێگەی نێوان کونەگورگ و کونەکۆتر هەمیشە کراوەیە و هەرگیز داناخرێت.

لە کونەکۆترێ کەوتمە ناو کۆتران، هەرچی ڕەنگ و جۆری کۆتر هەیە لەو کونەوە، پۆل پۆل لە شەقەی باڵیان دەدا و لە ئاسمانێ قەتارەیان دەبەست، پۆل پۆل دەگەڕانەوە و لە ناو هێلانە دەنیشتنەوە، نازانم خەون بوو، یان زیندەخەو، دەنگێک هەر لە دەنگی کۆتر دەچوو، گماندی، زۆر گماندی، هێندەی تێگەیشتم:

ئەگەر بتەوێ ببیە کۆتر، دوو باڵی نەخشینت دەدەمێ.

خۆزی دەبوومە کۆتر، کۆتربوونم نەویست، ئەو قەندیلە لە وەڵامدا دەتمرێنێ و لە پرسیاران زیندووت دەکاتەوە، جاسووسان پرسیار، کۆگە، چەکوچ پرسیار، دوندی بەرز پرسیار، کونی گورگ و کۆتران پرسیار، ؟ ؟ ؟ ؟ ؟، فاتیمەش پرسیار.

+ منیش پرسیار؟

- ئا فاتیمە ئاڵۆزترین پرسیار.

+ لە کونەکان و... ئاڵۆزتر؟

- ئەوەش وەك پرسیارەکانیدی.

+ کۆتر کۆتر...

نۆبەتداری هەڵیگرتووم

هەڵۆ ئاسا لە شاخانا

بە بای بێداری دەشنێمەوە

تەنێ چاوی تۆ شك دەبەم

لە دنیایێ هێلانەیێ بۆ خەو نابینمەوە

دەستت بێنە

لیمۆ ئاسا بمگوشە

بە لێویش تامی نەکەی

گوشین بۆ خۆی تامی ژیانە

بمرژێنە خۆتەوە

بەردیش بم دەتوێمەوە

وەرز وەرزی رژانە

(سترانی جەنگاوەر)

## ٦

من و فاتیمە بە ئەسپایی و بە چرپە دەدواین، دڵپیسێ چاوی لێیایە، بێ یەك و دوو، قسەکانی دەبردەوە جێژوانێ و دەیگەیاندەوە ماچ و راموسانێ، بەڵام رێیەك نیە دڵپیسان بباتەوە قەندیلێ، ئەگەر لە تیرەی ئەهریمەنیش بن و لە رێی ئەوەوە پێ بنێنە ئاقاری قەندیل، لەوێ لە سرووتە ئاگریە بەفراویەکان وەك بەفرو ئاگر پاکدەبنەوە، سەردەستەی مراویان لەولاوە دەیویست لاسایی عەلی بەردەشانی بکاتەوە و لێی نەدەهات، لێمان نزیکتر دەبێتەوە:

- پساوەکان خڕ ببنەوە چا چا!

- بە جگەرەوە.

- بە سروودەوە.

- بەس شیعری لەگەڵ نەبێ.

- بە پرسیارەوە.

- بە سەماوە.

دڵنیام قسەی پۆلای فاتیمەش بە ( بێدەنگیەوە) بووە، بە

گـوێی دڵ گـوێم لێبـوو لە جـاری زیـاتر و بە دەنگـی بەرزی بێدەنگی گـوتیەوە، سەردەسـتەی مراویـان حەفـت چـای تێکـرد، داغستانیی پێنج جگەرەی پێچایەوە.

**لێرەش لە ناو بەفر و گڕ و کڵپەدا...**

هێشتا دوا وشەی سروود هەر لە هەوکی هاوڕێی گیڤارا بوو، سەمای پساوە دەستیپێکرد، هێشتا سەما دەستی سـەمای لە دەسـتا بوو.

+ ئەگەر زمـانی شیعریشـم ببەسـتن، زمـانی پرسـیارم ئـازادە، ڕووی پرسیارم لە هەمووتانە بە پۆلاشەوە، پرسیارەکە:

بۆ یەکەمین جـار کە چەکـت لە شـان کـرد، لە کـوێ و لە دەستی کێ وەرتگرت؟ ئەوەی بە بیری نەیێتەوە، گەمژەیە!

داغستانی:

ئەو کوڕە پرسیاری سەیرو سەمەرە دەکات!

- من وەڵامدەدەمەوە، ئەو چەکەی دەستم دیـاریی گیڤـارایە، بەڵام تفەنگی یەکەم لە بیرمە لە ئاقاری کونەگورگ، لە دەسـتی خولە وەرمگرت.

- لە وەتەی بە بیرمدێ، ئەو تفەنگە تفەنگی مـنە، کە چـوومە مۆسکۆش لە جێگەیەك ( ئاشکرای ناکەم) جـوان جـوان تەقەتـم کرد، کە گەڕامەوە بە سـانایی دیـتمەوە، ئەو سـاڵەی ناویـان نـام جاشیش هەر ئەو تفەنگەم هەبوو، ئا شەوێك ڕێم کەوتە کۆڵانی لە سـەری کـۆڵانێ تووشـم بە تووشـی خـولەوە بـوو، بە دزیەوە دەچـووەوە مـاڵی خۆیـان، دوو تفەنگـی پێبـوو، وەکـو پیـاوان ئەوەیانی دایە مـن، لەگەڵـی نەچـوومە ژوورێ، بەڵام کە هـاتەوە

بەگەڵی کەوتم، ئەوەش وەڵامی پرسیارە سەیرەکەت.

- لە وەڵامی پرسیارەکەی خۆم، منیش وەکو ئێوە، رۆژێك لە بابم تووڕە بووم، گوتم با ئەو جارە بەگەڵ مراویان نەکەوم، پشت لە رۆژێ سەری خۆم هەڵگرت، رۆیشتم، رۆیشتم، گوندێك کەوت، دیتم پیاوێك لە دەو رێ لەسەر بەردێ دانیشتووە، دوای چاکوچۆنی گوتی:

بڕۆ گوندی بزانە جاش و ماشی لێ نیە، کە هاتیەوە تفەنگەکت دەدەمێ، هەر باڵم گرت، چ ببینم! جاشی دنیایێ وا بەرەو گوندی دێن، بە فڕین گەیشتمەوە لای، چیم دیت بێ لێقرتان و بە سەرەوە نان، ئەوەم پێگۆت، گۆتی:

وەرە.

لە بن غەرە بەردێك تفەنگێکی دەرهێنا، گۆتی:

ئەوەش دیاریی خولە بۆ تۆ.

- من تێناگەم لەو کونەگورگ و خولەیە! دەڵێی دنیا لەوێوە لە دایکبووە و هەر لەوێش دەمرێ، منیش هەر لەو کونە و دەستەوە، تفەنگم بە دەست هێنا، ئەوەشی گوت:

تۆ یەکەمین ژنی ئەودیوی حەمرینی، کە تفەنگی پێ ببەخشم.

دوایی نازانم خەون بوو چ بوو، هەستمکرد دەفڕم، لە ناو دنیایێ کۆتر نیشتمەوە.

- من پێشتر تفەنگێکیترم لە شان بوو، لە بیرم نیە چۆن بە دەستمکەوتبوو، بەڵام ئەوەیان، لە دەورووبەری کونەگورگ

دەسوورامەوە، جاشەکانی جاشاغا بۆنیان کردبووم، ئێ، زۆرم تینوو بوو، ڕێم کەوتە سەر بیرەك دیتم باوەش باڵدار لێی دێنە دەرێ، سەرم شۆڕکردەوە، چاوم لە تەڕایی دەگێڕا، لۆ تفەنگ بەر نەبۆوە! تفەنگ ڕۆیی و ڕۆیی، هەر ئەو دەمەو عەسرە، خولەم دیتەوە، پێشتر دەمناسی،گۆتی:

خەمی لێ مەخۆ.

ئێستاش نازانم لە کێندەرێ تفەنگەکی بۆ پەیداکردم، سەد سووندت دەخوارد تفەنگە گۆڕینەی خۆمە.

پۆلای فاتیمە و من، متەقمان لە خۆمان بڕیبوو، وەلامەکان زراویان بردبووم، ئەوە پرسیار نەبوو، گوللەی حەفت کەس بڕ بوو، نزیك لە دڵنیایی دڵنیا بووم، وەلامی پۆلاش لە هەمان کونەوە سەردەکا و بە هەمان دەستا گوزەر دەکا، سەردەستەی مراویان بە گوللە پرسیارەوە لە سەر سەرمان وەستاوە:

دەی وەلام بدەنەوە، با گەمژە دەرنەچن.

پۆلای فاتیمە:

ئەوانە هیچیان وەلام نەبوون، هەموو پرسارێکن ئاڵۆز ئاڵۆز.

ئیمامەی پساوە:

بە خودای پۆلاش شێت بوو.

دەمویست چەندێ زووە بچمەوە ئاقارە بێسنوورەکانی بێدەنگی، لەوێوە ئاوێتەی پیاسەی تێڕامان ببم، تێڕامان لە پرسیاری ئاڵۆز ئاڵۆز،گوتم:

کاکە من (گەمژە)کەم.

فاتیمە:

له دەستمچوو خۆزی من (گەمژە)کە بام، هەڵەی پۆلا بوو درەنگ، نا هەڵەی خۆم بوو زوو.

لەو رستە تژی لە ناوکە قەسپیەوە، لەو (گەمژە) شیرینەی بە زاری فاتیمەدا چۆڕاوگەی بەست، رستەی تەڕ تەڕ، تەڕ لە خۆزگە، تا دەگەینەوە رستەیەکیدی، بە (گەمژە) بمناسنەوە.

ناسینەوەی حەفتاو حەفتەمین، لە چوونە سەر جێی چوارخواندەوە، شاری خۆر حەفتاو حەفت پاشای خستۆتەوە، هەر لەو شاری خۆرە حەفتاو حەفت جۆری شێت، شەوو رۆژ بە شەقامەکاندا دەسووڕێنەوە، شار ئەو دایکە میهرەبانەیە، حەفتاو حەفت مەزاری پیرۆز دەلاوێنێتەوە، منیش ئەوە جاری حەفتاو حەفتەمینە، سەختەکاری لە ناوی خۆم دەکەم.

ئیمامەی پساوە بە دەنگی چاییانە، دەنگێ سەرریژ لە هەورازو لێژی، لە هەورازان بەرزتر، لە لێژیان لێژتر، دەنگێ لە گوێی گوێگراناں، سەداینکە لە تەزبێحی پساوە پساوەتر، بەڵام لە قەندیلێ بۆ خۆ فریودانیش، گوێ گرانێ نابینییەوە، ڕێبوارانی قەندیل لە خواوەندەوە، سووکترین گوێیان بەر کەوتووە، حەفتاو حەفت مشك بە قەد قەندیلیەك، گوێیان لە خشپە و چرپەی رستەیەکی گۆکراو نابێ، لەو قەندیلە هەموو ئازای لەش لە بەفردا دەیبەستێ و دەبنە بەرد، گوێ هەر لە جوولەیە و لە با بزۆزتر، هەموو ئازای لەش لە ئاگردا دەتوێنەوە دەسووتێن، گوێ لە بایەتی خۆی ناکەوێ و بێ پسانەوە باوەشێنی لەش دەکات، گیان پرخە پرخی خەویەتی، گوێ هەر بێدارە، گیان دەستی لەش دەگرێ و دەفڕن، دنیا تەیدەکەن، بەسەر دەریا و دەشتا پیاسە دەکەن، گوێ هەر نۆبەتدارەکەی قەندیلە، ئەو

دەنگە لە پیاسە تێڕامانیەکانی کردم، ئەو پیاسەی دوور زۆر دوور لە ئاقاری قەندیل.

+ هەمووتان جاشاغا دەناسن.

- کیهان! مەبەستت حەمەکە نەبێت؟

+ ئێ، ئەوە لە وەڵامی پرسیارەکە ناوم هێنا بۆیە دەیکەمەوە پرسیار:

ئەوە کێیە کە دووەم کەسە دەستی بە تفەنگەکانی ئێمە کەوتبێ، تەقەی پێکردبێ؟!

داغستانی:

ئەوە قۆڕترین پرسیارە لە عومری خۆم گوێم لێی بووبێ.

+ نا پرسیارەکە قۆڕ نیە رەنگبێ من بە قۆڕی کردبێتم، ئێ، بیستوومە، قسەی من نیە، وا گۆترایە، هەرچی تفەنگ هەیە تا جاشاگا تەقەی پێنەکات، ناکەوێتە دەستی سێیەم، ئەوجا پرسیاری من لە دەستی یەکەم و سێیەمە.

- هی من تەنها دوو دەستی دیوە، لەو جێیەی تەقەتیشم کردبوو، دەستی شەیتانیشی پێنەکەوتووە تا بڵێم شەیتان دەستی سێیەمە.

بە پێکەنینەوە:

بەو قسەی تۆ بێت، خولە یەکەمە، بە خۆت دووەم، جاشاغاش دەستی لە گونم، کوڕە ئەمن دەڵێم جاشاغا کەسی دووەمە و بڕایەوە، تۆ ئەگەر کەسی حەفتاو حەفتەمینیش بیت باشە!

- ئەگەر بزانین، خولە و جاشاغا کامیان لە پێش کامیان لە دایکبووە، کەسێکیان ئاشکرا دەبێت.

ئەوە پۆلایە بە دەستی خۆی بێدەنگیی خۆی شلەقاند.

من تا ئەو ساتە پرسیارەکە بە جوولەی نەخستبووم.

+ من لە سەیدەوانم بیستووە، دەیگۆ:

دایکم لۆی گێڕامەوە: تۆ و جاشاغا و خولە لە یەک رۆژ لە دایکبوونە بەوەی دەزانم ماڵمان لە یەك کۆلان بوو، یەك مامانیش هەبوو هەرسێکمان نۆرەمان گرتبوو، خوا خێری مامان بنووسێ، منی لە پێشان رزگارکرد، ئا تازە دنیا رووناك دەبۆوە، وا بزانم لە پاشە من چووە کن داکی خولە، ئا ئا، جاشاغا عەسرێ هاتە سەر دنیایێ.

ئەوجا نازانم چەندێ راستی تێدایە!

داغستانی:

ئەتو کام سەیدەوان دەڵێی؟

+ چەند سەیدەوان هەیە! ئەو پیاوەی لە پێش ئەوەی لەو دەشتەی خوارێ،کەوچکە ماستێك بۆ هەوێنیش هەبێ، بەرکە کەنگرەگ بۆ بزنیش سەری دەرهێنا بێت، ئەو تفەنگی لە شانە.

داغستانی:

ئێ ئێ، باش دەیناسم، لە سەری بدەن درۆیەك ناکات، ناڵێم ئەگەر لە گێڕانەوەی سەرهاتان، لە سەهووەوە شت لەبیربکات و پاش و پێشیان بخات، باشی دەناسم، ئەو پیاوە کە سوپای هۆلاکۆ بەرەو وڵات کشا، عەردو ئاسمانی لێکردنە گۆرستان.

ئەو سەیدەوانە هاوڕێ پڵینگی ئێزیدیان بوو، ئێوە ڕەنگبێ ئەو ئێزیدیە نەناسن، کاتێ مەعاویە بڕیاریدا لە چار گۆشەی دنیایێ ئاگرکردنەوە قەدەغە بێت، پڵینگی ئێزیدی دنیای لێکردە ئاگر، چابوو قەندیل هەندێك هەوری بە قەرد دایە دنیایێ، دەنا نەك هەر عەرد ئاسمانیش دەبووە خۆڵەمێش.

دەڵێن: خولە لە کنە وی فێرە تەقەکردن بووە، دەڵێن: لەشکری بێ داد و شامێ دەوری چیای شنگالێ دەدەن، بۆوەی ئەو ئێزدیە لە ناو ببەن، هەر سەرباز بوو پەلەواژ دەبۆوە، بە قسەی خەڵکی ئەوێ: هیچ پایزەك لەو چیایە هێندە پەلکی دارانی نەوەراندیە.

ئەوە دەگاتەوە جاشاغا، دەڵێت:

ئەو پڵینگە بۆمن لێگەڕێن، حەنەشێکی بیابانی بەگەڵ خۆی دەدا، ڕێی شنگالێ دەگرن، هێشتا زۆر دەمێنێ لە چیای نزیك ببنەوە، هەردووکیان لە ترسان چۆڕە میسکەی دەگرن، ئەمن لە مۆسکۆ کابرایەکم دیت دەیگۆ: ئامۆزای پڵینگی ئێزدیم.

زریان هەڵیکرد، ئەوەتا هەرچی ڕقی خوداوەند و شەیتان و مرۆڤە، لە قەندیلێ گێژ دەدەن و لە بێ دادەوەش لوورەی تۆپە، لە تاران و تورانەوە لوورەی تۆپ، چووینەوە ئاودەستی شەیتان و وەك منداڵە هەتیوەکانی دنیا بەبێ نازی سەرمان بە کۆشی یەکتر کرد، من ڕێك لە ناو چاوی فاتیمە دانیشتبووم، بەڵام هەستمکرد نامبینێ.

گوێم لە دەنگی فاتیمەیە، نازانم بۆ کێ دەدوێ:

بیستبووم رۆمانسیترین شەو، شەوانی بێ دادە، هەوای ئەو شەوانە لە سەری دابووم، شەوی هیچ جێیەکیدی، لە سەرمدا شەوانی ئەوێیان نەدەڕەواندەوە، هەینێش هیچ ڕێگەیەك نەیدەبردیەوە ئەوێ، هەموویان تەلبەند و پۆلیسبەند بوون، بەڵام لە بابمم بیستبوو، ئەو کاتانەی بێ داد هەموو ڕێگاکان لەسەر خۆی دادەخات، دەرگای دیجلە لە سەر پشتە و داناخرێ، کلیلی هەموو دەرگاکان لە گیرفانی ئەوە، هی دەرگای دیجلە نەبێت، ئیدی دەمەو عەسرانێ گوێم لە ئاو بوو بانگیکردم:

ئەی کچە چاو ڕەشەکە، درەنگە...

بێ ماڵئاوایی لە دارخورماکەی بەر دەرگای حەوشەکەمان، بێ ئەوەی دایکم ماچ بکەم، جلکەکانمم کردە کۆڵەپشت و لە پشتی خۆم بەست، بە ڕووتی ڕژامە رووبارەوە...

/ئەها من فاتیمە بە ڕووتی دەبینم!/

ڕژانێ، بڕوا ناکەم رووبار لە تەمەنی خۆی ڕژانی وای لە ناو ڕژابێت، ئاو بەرەو دەریا منیش سەرەو بێ داد بە ڕێ کەوتین، چ ڕۆیشتنێکی بە چێژ بوو، لە هەموو لەشمەوە چێژ دەڕژایە گیانمەوە، چێژێ هیچ کچێ لە جووتیووندا، چێژی وای پێدا نەڕژاوە، چ ڕۆیشتنێ تامی ئەو ڕۆیشتنەی ناداکە لە ناو دیجلەدا بە دژی دیجلە ڕێبکەی، ئەگەر بۆ دیجلە رووت نەبیەوە وەك چۆن ژنی ئاوی بۆ مێردەکەی رووت دەبێتەوە، ڕەنگە دیجلە لە ژیان رووتت بکاتەوە، بەڵام کە رووت بوویتەوە، ژیانێك سەرڕێژ لە تەڕی، ژیانێك پڕ پڕ لە جوولەی جوان، نەرم نەرم دەڕژێتە گیانتەوە، تەواو جیا لەو ژیانەی مرۆڤ لە وشکانیدا وەك جرو جانەوەر دەیگوزەرێنێ، حەزمنەدەکرد دەسبەرداری دیجلە

بـم، به بیرمـدا هـات بـێ داد ڕێـیه‌که‌ی وا ژیـان به‌خـش بێـت، ده‌بێت شـه‌وه‌که‌ی چیـت پـێ ببه‌خشـێ! هێنـده‌م زانـی تاڵێـك له‌ شـه‌وه‌وه‌ له‌ تـاڵێكی قـژم ئـاڵا و له‌ دیجـله‌ی كـردم و به‌دیـار دیجله‌وه‌ به‌ نابه‌دڵی خۆم خسته‌وه‌ ناو جلكه‌ ته‌ڕه‌كانم، هه‌ڵـدرامه‌ شه‌وی بێ داده‌وه‌، سلاوێكی ته‌ڕتر له‌ جله‌كانمم له‌ شه‌وی ئه‌وێ كرد، به‌ وه‌رگرتنه‌وه‌یه‌ك داینیشاندم، ته‌ڕیم تێیدا هه‌ست پێنه‌كرد، ڕه‌نگبـــێ ئه‌و ته‌ڕیـــیه‌ی نه‌بـــووبێ كه‌ له‌ ســـلاوه‌كه‌ی مـــن ده‌چۆڕایه‌وه‌، ئێستا مێـوانی شـه‌وی بـێ دادم، له‌ چایخـانه‌یه‌ك كه‌ ده‌رگـای به‌ســه‌ر شـه‌قامێكی فراوانـدا كـردۆته‌وه‌، چـایه‌كم به‌ ده‌سته‌وه‌یه‌ به‌ ئاوی دیجله‌، به‌ڵام بۆ خۆ فریودانیش خزمی ئـاوی دیجــله‌ نــابێته‌وه‌، وێنه‌یه‌كــی گه‌وره‌ به‌ دیــواری چایخــانه‌كه‌وه‌ هه‌ڵواســرابوو، بـۆیه‌ كه‌وته‌ به‌ر چـاوم، دیـواره‌كه‌ هه‌ر جـێگه‌ی وێنه‌كه‌ی تێدا ده‌بۆوه‌، له‌ سـه‌رووی وێـنه‌كه‌ به‌ خه‌تێكـی بیابـانی نووسرابوو:

سه‌رۆكی فه‌رمانده‌ معاویه‌

له‌ بیرمنه‌ماوه‌، معاویه‌ی ژماره‌ چه‌ند بوو، هه‌ر له‌و ساته‌ی مـن ده‌مڕوانییه‌ معاویه‌، گوێم لێبوو له‌ ناو شه‌قامه‌كه‌ پیاوێـك هـاواری لێهه‌ستا به‌ ده‌نگێكی بیابانی:

هه‌ر ئێسـتا هه‌مـوو خه‌ڵكـی شـار له‌ گۆڕه‌پـانی ناپـاكی كـۆ ببـنه‌وه‌، ئه‌وه‌ی خـۆی دوابخـات سـه‌ری ده‌نێـرمه‌ كـن سـه‌ری حوسێن و لاشه‌شی ڕه‌وانه‌ی قه‌ندیل ده‌كه‌م.

دوای كه‌مێ تێڕامان له‌ سه‌روسه‌كوتی ئه‌و پیـاوه‌، ناسـیمه‌وه‌، ئا هه‌وه‌، ئه‌وه‌ ئه‌و پیاوه‌ بوو له‌ سه‌رێ كۆڵانی خۆمان، به‌ هه‌مـان ده‌نگی بیابانیه‌وه‌ هاواریده‌كرد:

برۆنە ماڵە کاولبووەکانتان، فەرمانی میرە، منداڵی یەکساڵەش لە دەرەوە ببینم، بەم شیرە ملی دەپەڕێنم.

گوێم لە خەڵك دەبوو بە دەم دەرگا داخستنەوە لە بەر خۆیانەوەو بە ترسەوە: حەجاج حە حە جاا ج...

من لەوە تێنەگەیشتم ئەو پیاوە لە بەسرا بەزۆر خەڵکی لە ژووری دەکرد، هەر ئەو پیاوە لە بێ داد بەزۆر خەڵك لە ماڵان دێنێتە دەرەوە، ئیدی هەرچی خەڵکە لە گۆڕەپانی ناپاکی خڕبوونەوە، لە سووچێکەوە راوەستابووم، باش ئەو بۆشاییەم لێوە دیاربوو کە خەڵك بازنەیان لە دەور بەستبوو، دیتم کچێکیان هێنا، خوێن لە تیسک تیسک قژی دەچۆڕایەوە، سەیربوو لە جیاتی زمانی گریان و پاڕانەوە، بە زمانی هێز دەدوا، من هیچی تێنەدەگەیشتم کەسێك لە تەنیشتمەوە گوتی:

ئەوکچە قارەمانە بە زمانی چیایی دەدوێ.

دیتم گوریسەك لە ئاسمان هێواش هێواش شۆڕ دەبۆوە، چەندی تەماشای ئاسمانم کرد بنی گوریس بە دیار نەکەوت،گوریس هەر شۆڕبۆوە، رێك گەیشتە ناوقەدی کچەکە

/ ئەوەتا گوریسەکە دەبینم!/

لەو کاتەدا دەنگەك لە نادیارەوە بەرزبۆوە:

ئاگادارتان دەکەینەوە، ئەو کچەی وا دەیبینن، قەحپەیە، جاسووسە، ناوی لەیلێیە، دەسکیسی بۆ مەلا مستەفا دەکات، ئەو ناپاکەی هەر لە سەردەمی نوحەوە، لە رۆژانی فەقێیایەتی وانەی ناپاکی خوێندووە، ناپاکی لە خواو پێغەمبەر دەکات، ناپاکی لە بێ داد دەکات، ئەو کچە لە ناو جانتایەکەیدا، نەخشەی بێ داد

دۆزراوەتەوە، ویستوویەتی بینێری بۆ ئەو گاورانەی وا لە قەندیلەوە، نەخشەی داگیرکردنی بێ داد دەکێشن، نەخشە بۆ دزینی بەردە پیرۆزەکەی قیبلە دەکێشن، بۆیە بە ناوی خودای گەورە و بە ناوی ئێوەوە، ئێستا لە ڕێی ئەو گوریسەوە دەینێرینەوە بۆ قەندیل.

حەجاج بە دەستی خۆی گوریسەکەی لە ملی کچە شەتەك دا، تا ئەو ساتەش کچە هەر لە هێزەوە دەپەیڤی، دوا وشەی (کوردستان) بوو،کچە بەرزبۆوە، بەرز بۆوە، بەرز لە چاو ون بوو، نازانم چەندی پێچوو، برژانگم هەر بە ئاسمانەوە هەڵواسرابوو، دوو سێ جەندرمە چاویان لە ئاسمان پساندمەوە، هەڵاتم بەر دەستیان نەکەوتم، چوومەوە سەر دیجلە، چیم لە دەست نەدەهات، ئەوە نەبێت بەرد بەرد بەردی نەفرەتم دەخستە دیجلەوە، بە دیجلەم دەگوت:

ئەو بەردانە بگەیەنە، دەرو دراوسێ، ئەو دەرو دراوسێ بەسراویانەی کە هەوای شەوانی بێ دادیان خستبووە سەرمەوە.

هەستمکرد لە دنیایێ تاقە خوشکەکم هەبوو ناوی لەیلێ بوو، بە زمانی چیایی دەپەیڤی، پیشەی دەسکیسی بوو، بە بەر چاوی خۆمەوە ئاسمان بە خنکاوی هەڵیکێشا و بردی، ئەو پیاوەی جارێ لە بەسرا لە دڵەوە چەپڵەم بۆی لێدابوو، ناپاکی گەورەیە.

نەمدەزانی دەسکیسی چۆنە دەنا دەمکرد، هەر بۆ ئەوەی بە ڕێی گوریسەکە بگەمەوە لای خوشکە چیاییەکەم، چیم لە دەست دێ! بە دوای کەرەستەیەك دەگەڕام خۆمی پێ بکوژم، لە نەگبەتیما کەرەسەیەك دەستنەکەوت بۆ خۆکوشتن، چەند

تەنیام لە دەو دیجلە، دڵم لە بەسرا ئێشاوە ئیدی ئەوێ لە من حەرام بێت، دەست نادەمە دەستی دیجلە بەرەو ئەوێم بباتەوە، بێ دادیش نە رێیەك تێیدەکاتەوە نە رێیەك لێی دەبێتەوە، هەیە و نیە دیجلەیە، بڕیارمدا لە دیجلەوە بە پێچەوانەی دیجلە ئاو ببڕم، بەڵام دیجلە ئەو جارە دەمداتە شەوانی کوێ؟!

ئەو پرسیارە سووکە بایەك بوو بە قژما شنەی کرد، دەستم بۆ دوگمەی کراسەکەم برد تا خۆم رووتبکەمەوە، رووتتر لە دیجلە، هێشتا گۆی مەمکەکانم بە دیجلە پیشان نەدابوو.

/فاتیمەی کەنار دیجلە پشتی لە من بوو، سینە و بەرۆکیم نەدیت/

پیاوێك لە تەنیشتمەوە وەستا، ترسام، لەرزیم، تیچاوێکم دایێ ریشێکی جوانی هەبوو، وام زانی حوسێنە، نا ریشەکەی لە هی حوسێنیش جوانتر بوو، بە پیاو خراپان نەدەچوو.

- حەزت لە مەلەیە؟

+ نا هەر ئەو رێگەیە هەیە.

- بەرەو خوارێ یان سەرێ؟

+ خوارێ نا سەرێ.

- رێگەیتر هەیە، بەڵام بۆچی شەوانی ئێر بە جێدەهێلی؟

+ خوشکەکەم هەبوو، بەجێیهێشت، ئاسمان هەڵیکێشا، منیش بە جێی دەهێلم.

- ئەو کچەی لە رێی گوریسەوە دەرچوو؟

+ ئا ئا، دیتت؟

- من ناوم ریشەیە، ئەو ناوەت بیستووە؟

+ ئا، بەڵام نابێ تۆ هەو بیت، خەڵك دەڵێن: وەحشەك هەیە ناوی لە خۆی نایە ریشە، پیاو دەخوات، ژن دەخوات، منداڵ دەخوات، هەرچی جەندرمەی بێ داد هەیە بە دوایەوەن، ناگیرێ، ناکوژرێ، دەڵێن: ئەو وەحشەش لە هەموو جێیەك هەیە و بە دڵی خۆی دەسوورێتەوە، ئا بیستوومە بەڵام تۆ هەو نیت.

- من هەوم و برای ئەو کچەشم کە تۆ بە خوشکی خۆتت داناوە، بەڵام ناهەقت نیە باوەڕ بە من نەکەیت و باوەڕ بە قسەی ناو خەڵك بکەیت، خەڵکی ئێرە بەنجکراون، پادشاکان کە لە نەوەی وەرپینن، رۆژانە دنکە حەبەك دەخەنە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە، بەو دنکە حەبەش دەڵێن:

خۆشەویستیی پاشا

+ واتە من و تۆ خوشك و براین!

- ئامادەم بە خوشکی خۆم وەرتبگرم.

+ تۆ خزمی مەلا مستەفا دەبیەوە؟

- خزمی نزیك

+ ئەدی ئەو ناپاکی گەورە نیە؟!

- تۆ هێشتا لەژێر کاریگەریی دنکە حەبەکەی، ئەگەر دێی، با بڕۆین، درەنگمە.

بێ یەکودوو بەگەڵی کەوتم، هەستم بە بزربوون کرد، ئا وا

بزانم بوومە تاڵێ بە ریشی ریشەوە، نازانم لە کوێ بووم چەند رۆیشتین، هێندەم زانی بە تەنیشت یەکەوە راوەستاوین.

- ئەو ئاگرە دەبینی؟ ئەوە بابەگوڕگوڕە.

+ ئەها! دەیناسمەوە، ئاگرەکەی پرۆمیسیۆس نیە؟ کە لە خوێری دزی و لێرەی شاردەوە، بەڵام بیستبووم ئاگرێکە دووکەڵ ناکات، ئەو هەموو دووکەڵە چیە؟!

- ناسیتەوە، بەڵام منیش نازانم لە کەیەوە و بۆچی دووکەڵ دەکات، هێندە دەزانم ئەو دووکەڵە لێلایی سەر بینایە و زۆر جار چاوەکان بە هۆی ئەو دووکەڵەوە وێنەکان بە تاریکی و شێواوی دەبینن، زیاتریش دووکەڵەکە دەچێتە بینایی چاوەکانی ئەو دیوی حەمرینەوە، ئەو شوێنەی لێی وەستاوین، بەرزایی حەمرینە، ناوی حەمرینت بیستووە؟

+ لە تۆوە گوێم لەو وشەیە دەبێت.

- ئەها! لە کتێبە زۆر کۆنەکان، وشەی (حەمرین) بە واتای جیاکەرەوە دێت، جیاکردنەوەی چیا لە بیابان، واتە لێرەوە هەرچی چیاو بیابانی دنیا هەیە، لێرە ماڵی خۆیان دەکەن و ێکدی جیا دەبنەوە.

+ ناکرێ بە یەکەوە هەڵبکەن؟

- ئێستا زەحمەتە، وەختی خۆی پیاوەك ناوی سەلاحەدینی ەیووبی بوو زۆری هەوڵدا ماڵیان تێکدی بکەنەوە، سەری ەگرت، درەنگە با برۆین.

دیسانەوە خۆم بە تاڵە ریشی ریشەوە هەڵواسی، بزربووم، خەوتم، خۆشترین خەوتن خەوتم ، لە پێدەشتێکی بە هاری بە ١گایهێنامەوە.

- من درەنگمە لەوە پتر ناتوانم لەگەڵت بێم.

+ ناپاکیت لێمکرد؟

- نەتهێشت رستەکەم تەواو بکەم، ئێرە تا ماوەیەکیدی ئاقارێکی بێ مەترسیە، ئەو سێ چوار بنە دارەت دیوە؟

+ دەیانبینم بەس دەترسم، لەگەڵ تۆ دێم.

- من لەو جێیەی تۆم هەڵگرت دەچمەوە ئەوێ، ناکرێ! تۆیان لەگەڵ من دیوە.

+ ئێ؟

- تۆ کەوتیە ئەو لیستەوە کە بێ داد ناوی ناوە لیستی ناپاکان، کە گەیشتیە بن دارەکان زۆری پێناچێ دەنگت دەدەن، مەترسە، بڵێ من خوشکی قەندیلم، لەوێوە هەموو دەتگەیەننە قەندیلێ.

+ باشە، حەزدەکەم بگەمە قەندیل، بەڵکو لەوێ خوشکەکەم ببینمەوە.

بەر لەوەی بفرێ، دوو سێ وشەی چیایی فێرکردم، لە چاو تروو کانێکدا ون بوو، منیش بەرەو بن دارەکان هەنگاوم نا.

***ها چی لە چاوی فاتیمە دەخوێنیتەوە؟***

سەردەستەی مراویان بەو رستە ناوەختیە و بە ئانیشکە بزماریەکەی کە رۆچووە رانمەوە، لە ناو چاوی فاتیمە دەریهێنام، دەنا هەر لە چاوەکانی فاتیمە دەمامەوە.

ئەوە چەند لاپەڕەیەکی دزراو بوو لە دەفتەری یادەوەریی

فـاتیمە، ئەو یادەوەریـانەی لە دەروونـی فـاتیمە، دەڵێـی ئـاوی خەوتوون، هێشتا دەفتەرێکی نەنووسراوە، هێشتا بای دنیا پێی پێدا نەخشـاندووە و پەڕەکـانی هەڵـنەداوەتەوە، هێشـتا رسـتەیەکیش لەوانە لە پەنجەی فاتیمەوە تکەیان نەکردووە، چ پەنجەیەکیدیش نەینووسـیوەتەوە، هێشـتا لە لێـوی فـاتیمەوە، کەس کەس نە بە شـــیرینی نە بە تـــاڵی ئەو یادەوەریـــانەی نەمژیـــوە، لە چ لێوێکیدیشـــەوە چۆڕاوگەیـــان نەبەسـتووە، کەچـی بە وێـنە و دەنـگەوە وا لە چـاو و گـوێی منـدا، پـارێزراون، لـێم دزیـن و لەوانەیە هەرگیزیش هەست بەو دزینەی لێکراوە نەکات.

ئەو جۆرە دزینە لە دەنـکە پساوەیەکی بزربـوو فێربـووم، بە ئەسـحابەکوژ ناویـان دەهێنـا، فێریکـردم چـۆن بـبمە دز، دزی بیـرەوەریە نەنووسـراوەکان، بیـرەوەیە نەگوتراوەکـان، بە وێـنە و دەنگەوە، ئەو وێنانەی ناکەونە چێوەی کێشـانەوە، ئەو دەنگـانەی هەمیشـە لە دەرەوەی بـازنەی بیسـتن دەمێنـنەوە، بەرەبەیـان بـوو ئەودەمەی ئەسحابەکوژ هونەری جوانترین دزینی، پەیـامبەرانە بـۆ شرۆڤە کردم:

لە گەڕانێکی قەندیلی، لە کاتی بەفر شـکاندنا کە بە سـینگ بەفـرم دەشـکاند، چـۆکم بەر تیشـە بەردێ کەوت، خـوێن هەر هات و نەوەستا، هەموو جلکەکانم داکەند و لە چۆکمم بەستا، خـوێن هەر نەوەسـتا، حەفتاوحەفـت بەرازان بکـوژیەوە، هێنـدە خوێنەیان نـیە، لـۆ یەکەم جـار ئەمـن بـووم، رەنگـی قەنـدیلم لە سـپیەوە گـۆڕیە سـەر سـۆری، ئـێ، رقـم لە تیشـە بەرد هەسـتا، رقلێبـــوونەوەیەك، ئەســـحابەی گـــۆڕینێش هێنـــدە رقەی لە مـــن هەڵنەستایە، لەگەڵ تیشە بەرد کەوتـمە شـەڕێکی حەفـت شـەو و رۆژە، سووندم لێخوارد دەبێت بتبەزێنم، ئاکـام بەرد بەزی، بەرد

چ بەردا! بنی لە کن دەریا بوو، بەردم لە سەر بەفر درێژکرد، زۆر ماندوو بووم، هەر لە دەو چاڵە قووڵەکە، چاوەکم گەرمکرد، کە بە خەبەر هاتم، زوو دوو سێ جاران خەونەکەم بۆ خۆم بە دەنگی بەرز گێڕایەوە نەبادا لە بیرمبچێتەوە، ئەوجا با خەونەکەت بۆ بگێڕمەوە:

*دیتم ژنەك گەلەك گەلەك جوان، جوانی ئەوها نە لە دنیایێ هەیە نە لە پەسلانێ، لە مەستوورەش جوانتر، لە سەر سەرم راوەستایە، خەنیبووم، باوەشم لێ کردەوە، گوتی:*

*باوەش مەکەوە، مێشکت بکەوە.*

*هۆیەکم لە خۆم زانی، گۆتی:*

*من زۆر مەمنوونی تۆم کە ئەو بەردە گەورەت لە سەر پشتم هەڵگرت، هەرگیز چاکەی تۆ لە بیرناکەم، لە باتی ئەو چاکەیە رازێکت پێدەڵێم، لە ژیانتا زۆر کەڵکی لێوەردەگریت، بەڵام بە مەرجێ بۆ کەسی نەگێڕیەوە، قەینا ئەگەر هەر حەفت ساڵەك بۆ یەك کەسی بگێریەوە، بەڵام سوێندی بدەی ئەو کەسە بۆ کەسیدی نەیگێڕێتەوە.*

ئەسحابەکوژ چاوی لە چاوم نا:

+ وا بزانم حەفت ساڵ دەبێت بۆکەسم نەگێڕاوەتەوە، ئەگەر سوند دەخۆیت بۆکەسی ناگێڕییەوە، لۆت دەگێڕمەوە.

- بە سەری تۆ و بە سەری کچە خەونیەکەش کەس لە زاری منەوە نایبیستێ.

+ متمانەم پێتە، کچە گۆتی:

*ئەگەر بتەوێ لە ئاقاری قەندیلێ، سەرهاتی کەسەك بزانی، رابردووی ئەو کەسە بە دەنگ و رەنگەوە ببینی، ئەو ساتانەی کەسەکە دەچێتە بێدەنگیەکی زۆر قوولەوە، بە دزی زۆر بە دزی، نابێ ئاگای لە جولانەوەت بێت، خشپەی پێت نەچێتە گوێی وی، برۆ لە بەرانبەری دانیشە، چاو لە چاوی ببڕە، خەمی ئەوەت نەبێت کە چاوی کراوەیە، ئا ئەو کاتە ئەو کەسە چ سەرهاتەکی خۆی بۆ خۆی بگێڕێتەوە، لە چاوی کراوەی ئەوەوە هەمووی دەبینی لە لێوی داخراوی ئەوەوە هەمووی دەبیستی، ئا ئا بە رەنگ و دەنگەوە سەرهاتەکە لە پێش چاوتە، لە ناو گوێتە.*

گۆتمە کچەی ئەتو فشەم پێدەکەی! ئەمن لە پێش ئەو کەسەی دانیشم و چاو لە چاوی ببڕم، هەر دەمبینێ خۆ کۆرە نیە!

کچە گۆتی:

*کە تۆی دیت ئەوە بزانە نەچووەتە بێدەنگیی قوولەوە، لە من تێنەگەیشتی، ئەمن گۆتم بێدەنگیی قوول، قوولتر لە بەژنی ئەو بەردەی لە سەر پشتی من راوەستابوو، ئەو بەردەی تۆ هەڵتکێشا و منت رزگارکرد، کە من رۆیشتم سەیری چاڵەکە بکە، بێدەنگی دەبێت ئەوها قوولبێت.*

ئەوەی گوت و بزربوو، ئەمن بۆوەی بزانم کچە راستی گۆ یان درۆی لەگەڵم کرد، بێ جوولە و خشپە چوومە بەر دەمی زۆر ئەو کەسانەی رۆ دەچوونە بێدەنگیەوە، سەد جارە ئەوەم کرد، هەموو پیاوە لە بێدەنگی رۆچووەکانی ئەو ناوەم جەڕباند دەرنەدەچوو، کابرا دەیگۆت:

ئەوەبۆچاو لە چاوم دەبڕی، چاوم چی تێدایە؟

به سەر خۆدا دەشکامەوە، وازم لەو دزینە دزێوە ئاشکرایە هێنا، هەزار جوێنی پیسم لۆ کچەتیوەی بن بەر هەنارد، نازانم پێیدەگەیشت یان نا، ئێ، هەر لە قەندیلێ، پیاوەك هەبوو، (فەلاك)یان دەگۆتێ زۆر برادەرم بوو، تا بلێی ژیر و زیرەك بوو، ئەمن زۆر شت لە وی فێر بووم، هەمیشە کتێبانی دەخوێندەوە، کەمدوو بوو، دەمدیت هەندێك جاران دەچووە بێدەنگیەکی گەلەك قوولەوە، بێدەنگیەك پیاو نەیدەوێرا لێی نزیك بکەوێتەوە، ئا بێدەنگیەکەی زۆر بە سام بوو، نازانم کوو بوو قسەی کچە خەونیەکە لە گوێم زرینگایەوە، لەمێژبوو قسەکەم لە بیری خۆ بردبۆوە، گۆتم قیروسیا با ئەو جارەش تاقی بکەمەوە، دەمەو عەسران بوو دیتم فەلاك کەوتیتە ئەو چالەی من هەلمقەند، بە مەزەندەی خۆم کەوتبووێ، لە دلی خۆم گۆتمە کچەکە ئەگەر قسەکەی تۆ بە سەر فەلاك راست نەکەوێتەوە، بەسەر هیچ کەسدا راست ناکەوێتەوە و تۆ ئەمنت فریو دا، هەر بۆ ئەوەی لە باوەشێت نەگرم، ئێ بە زیادەوە مەرجەکانی لێك نزیك بوونەوەم جێبەجێکرد، نە خوداوەند نە شەیتان هەستیان بە جوولە و خشپەم نەکرد، چووم، چووم، وەك پشیلە لە بەر دەمی هەلکوڕمام، هیچ قسەی نەکرد، وەکی منداڵان چاوم خستە ناو چاویەوە، هیچی نەگۆ، لە دلی خۆم گۆتم ئیستا تەریقمدەکاتەوە، چ ببینم!

ئەوە فەلاکە هێور هێور بەرێکەوت، دەرگەیەکی کردەوە، هۆدەیەکی گچکەیە، دوو وێنە بە دیوارەوە رێك بەرانبەری یەکتر هەلواسراون، ناسیمەوە هەردوو وێنە فەلاك خۆی بوو، یەکیان قەلەمی بە دەستەوە، دیاربوو شتی دەنووسی، ئەویدی تفەنگی لە شانی بوو، بلندگۆیەکی لە دەستی بوو دیاربوو قسەی بۆخەلکی دەکرد، لە وێنەکە چەند سەرکەك دیاربوون، پێدەچوو

بۆ ئەوان قسان بکات، ئێ دیتم چاوەکی لە سەر وێنەی قەڵەم بوو، چاوێکیش لە سەر وێنەی تفەنگ، بەو گوێیانەی خۆم لە زاری فەلاکەوە گوێم لێبوو:

خۆزگە هەر ئەوەیان دەبووم / دەستی بۆ وێنەی قەڵەم بە دەست درێژکرد/ من پیاوی رۆمان نووسین بووم، بە هەڵە کەوتمە ئەو بەرەی /دەستی بۆ رەسمەکەی دی درێژکرد /

بە راستی ئەمن زۆر ترسام موچڕەکەك بە دڵمدا هات، قیچەك بە ئاگاهاتمەوە، دیسان بە دزیەوە خۆم لێی دوور خستەوە، لە دووری وی وەستام، لەو ساتانە ئەو نهێنیەم لە بیر نەمابوو کە کچە پێیگۆتبووم، هەر وەخت بوو شێت بم، بە هەر دە پەنجان چاوی خۆم هەڵدەگلۆفت بۆ ئەوەی بزانم خەون نیە. زۆری نەبرد فەلاك لە چاڵی بێدەنگی هاتە دەرەوە، نەمدەزانی چۆن پێیبڵێم شتەکی وام لێت دیوە، دەترسام بە شێتم دابنێ، دوایی قسەی کچەم بیرکەوتەوە، بەڵام دڵم ئاوی نەدەخواردەوە، هەر لە قسەی کچە بە گومان بووم، کێ دەڵێ ئەوەی بە چاوی خۆم دیتم و بە گوێی خۆم بیستم، کێ دەڵێ لە زار و چاوی فەلاکەوە بووە، رەنگبێ هەر ئاگاشی لەو بەزمەی نەبێ، ئێ گۆتم با تامەکی زاری فەلاکی بکەم، گۆتم:

- دوو وێنەی تۆم بینیوە بەرانبەری ئێکدی وەستاون، لە چاوی تۆوە کامیان جوانترن؟

+ وێنەی چی برا؟!

- وێنەیێ قەڵەمی لە دەستە و رۆمان دەنووسێ، وێنەیێ تفەنگی لە شانە و قسان دەکات.

+ رۆمان!! ئەوەت لە کـ ێـ ز ا نـ ی!!

- ئەدی تازە تۆ...

فەلاك تەواو حەپەسـا، دیـتم قسـان پەرت دەکـات ترسـام شتەکی بەسەر بێـت، ئەمنـیش هەر وەکـوو وی بـووم، بە زۆر لە خۆکردن، قسەم بە رێیەکی دیدا برد، دواتر بانگیکردم و گۆتی:

یان من تێکچـوومە و لە بەر خـۆمەوە قسـاندەکەم و رسـتان هەڵدەبزرکێنم، یان تـۆ مرۆڤێکـی ئاسـایی نیـت، هەبـێ نەبـێ تـۆ جاسووسی، ئەوجـا یـان جاسووسـی ئـاهورامەزدای، یـاخود هـی ئەهریمەن.

هیچم نەگۆت، زۆر مانـدووی کـردم، ئێسـتا و ئێسـتا هـیچم نەدرکاند، بەڵام ئێسـتا ئەگەر ئەو لێـرە بـایە، لە بـاتی بە تـۆ بڵـێم بەوم دەگۆت، ئەگەر دوای حەفت ساڵێدی دیتمەوە پێیدەڵێم

.

تەمەنی یەکتر ناسینی من و ئەسحابەکوژ چلەی کاتژمێریشـی نەچووبـوو نەك رۆژ، رازەکەی بـۆ درکانـدم و فێـری دزینـی بیرەوەریی خەڵکی کردم، ئێستاش تێنەگەیشتم، بۆچی نـاوی مـن ژمارە دوو بوو لە لیستەکەی ئەسحابەکوژ، ئەگەر بە پێی تەمەنـی رۆژانی ناسین بێت، دەبوا من دوا کەسی ناو لیستەکە بـم، ئەگەر متمـانەش بێـت، منـی لە تەنگـانەیەکی ئەوتـۆ نەدیتـووە تـا وا بە ئاسـانی متمـانەم پێبەخشـێ، جـوان لە بیـرمە بەرەبەیـانێ ئـێمەی گەیانـدبووە سـەر چیـایێ، مـن خەو دەیبـردمەوە، خەوی نـازانم چەنـد شـەوی و رۆژی، بە لادا دەهـاتم، باوێشـك بـن پیلـی دەگرتم، وەنەوز رایدەکێشـام، گـوێم لێبـوو ئەسـحابەکوژ لە تێـر

خەویەوە باسی زیانەکانی خەو و سوودەکانی ئێشککگریی دەکرد، باوێشك دەمی بەستبووم، دەنا تێر پێیپێدەکەنیم، وەنەوز چاومی داخستبوو، دەنا بە هێمای چاو گاڵتەیەکم پێیدەکرد، دیتم لێم نزیك بۆوە، زۆر میهرەبانانە دەستمی گرت و دوای سووندان، نهێنیترین نهێنیی بۆم بەرەڵلا کرد، گرتمەوە و شاردمەوە، هەینێ ئەو نهێنیە لای من بایەخێکی نەبوو، بەڵام چیرۆکیکی خۆش بوو، باوێشك و وەنەوزی رەواندەوە، من دەمێك بوو، لە دوورەوە، دوورتر لەو ئاقارانەی لە ساتەکانی گزنگدا، دەکەونە بینایی دوندەوە، ئەسحابەکوژم دەناسی، ئەگەر لە پەرەگرافی شۆخیەوە بێت، دەنا دەڵێن کەس رستەیەکی لێ نەبیستووە، دوورو نزیك بە لای خۆهەڵکێشان و ئازایەتیی خۆی بکەوێتەوە، بیستبووشم ئازای وەك ئەو پیاوە کەمە لە دنیایێ، کەس بە بیری نایە لە کەنگێوە جەنگاوەرە و تفەنگ بە دەستە، هەر یەکەو بۆسەردەمەکی دەباتەوە و بە خۆشی لەو بارەیەوە بیشیکوژی قسەیەك ناکات، هەبوو دەیگۆت:

ئەو شەوەی تورکان کوڕەکیان بوو ناویان نا (عوسمان) بۆ سبەی زوو (ئەسحابەکوژ) یان دیتیە بە تفەنگەوە، پشت لە گوندی و روو لە چیا.

یەکیدی وای دەگێڕایەوە:

ئەو ساڵەی فیردەوس لە نووسینی شانامە دەبێتەوە، مەلای بانگی ئەسحابەکوژ دەکات و پێیدەڵێ، ئەمن تاقەتی تفەنگ هەڵگرتنم نیە ها ئەو تفەنگە لۆ خۆت.

ئەویدی دەیگۆت:

وا نیە، ئەمن دەزانم ئەسحابەکوژ لە کەنگێوە تفەنگی لە

شانه، کاتێ میدەکان ئاشبەتاڵ لە دەوڵەت دەکەن، ئەسحابەکوژ دەڵێ:

خودا یەکە و بێ هاوتایە، ئەمن دەوڵەت رادەستناکەم، دەچمە سەر قەندیلێ و دەوڵەت رادەگەیەنم، راشیگەیاند.

هەر لە بارەی ئەسحابەکوژ و تفەنگەوە، چیرۆکێکی لە سەر زاران بوو:

ئەو رۆژەی بێ داد مێوانداریی یەکەم پادشای کرد، بۆئێوارێ خەڵکی ئاوایی خڕدەکاتەوە و پێیاندەڵێ:

کوڕینە، ئەگەر ئەمن پیاو بم دەبێت تفەنگێ پەیدا بکەم، تازە ژیان بێ تفەنگ ناچتە سەرێ، ئەنگۆش بە قسەی من بکەن زیان ناکەن.

لەو دەشت و پێدەشتانەی ئەوێ، لە بەهارەکانیدا چەند بڕکە کەنگر شین دەبن، لە ئەسحابەکوژەکەشیدا هێندە سەرهاتی جیا جیا دەکەونە سەر زاران، خەڵك هێندەی لە زاری وی قسان دەگێڕنەوە و دەجوونەوە، ئەگەر هێندە هۆگرە بنیشت بان، بنیشتی دنیایێ بەشی ئەو دەفەرەی نەدەکرد.

دەگێڕنەوە رۆژێك لە بن کەپکە شاخێ ئەسحابەکوژ ئانیشکی لە سەر ملی بەردێ دانایە و بە دەم جگەرەکێشانەوە، لە دنیایێ رامایە، پیاوێکی لێ پەیدا دەبێت، شیر و تیری لە خۆ بەستایە، دەنگیدەدا:

- ها کابرا کێی؟

+ ئەز ئەسحابەم.

- دەڵێی ئەو ناوە لە کنە من نامۆ نیە! بڵێ چیت لێ بزربووە لە چی دەگەڕێی؟

+ هاتیمە دینی خوای لێرە بڵاو بکەمەوە.

- ئێرە سەر ڕێژە لە دینی خودا، جێی چۆرێکیدی لێنابێتەوە.

+ ئەنگۆ کەنگێ خواتان ناسیوە! هەی گاوری کوڕی گاور.

- تۆ دەڵێی تەواو نیت؟!

+ لەگەڵ تۆمە گاور. وەرە سەر دینی خوا.

- ئەها! خوا کەسی نەدیتەوە، تۆی کردە دەمڕاستی خۆی.

+ بە خۆشی دێی وەرە، وەرنا بە شیر دەتهێنمە سەر دین.

- هێشتا گەنجی، پیاوی چاکبە زوو ئەو ئاقارەی چۆلکە، دەنا دەتخەمە بن بەردێ لۆ خۆت هەتا هەتایە لە بنی پاڵدەیتەوە.

+ دێی یان شیر هەڵکێشم؟

- شیرەکەت هەڵکێشە.

دەڵێن ئەسحابە دەستی گەیشتبووە شیر و نەگەیشتبووێ، بە شیرو تیرەوە لە بن ئەو بەردە گەورەیە هاواری لێ هەستابوو، ئێستاش دیارە پەڕۆکەکی کەسك بە بەردەکەوەیە و بە بای دەور و زەمانان دەشەکێتەوە، خەڵك لە کاتی کارەسات و ناخۆشی لە دەوری بەردەکە بازنە دەبەستن و روو لە خوا دەکەن:

خودای گەورە بە زەییت پێماندا بێتەوە، بمانپارێزە، خودایە بە دەردی ئەو ئەسحابە بەستەزمانەمان نەبەیت.

من لەوە تێنەگەیشتم ئەسحابەکوژ و ئەسحابەکە بە چ زمانەك قسەیان لەگەڵ یەکتر کردووە و چۆن تێکگەیشتنە، بەڵام ئەوەم بیستووە:

هەموو مرۆڤێ لەو دنیایە، ئەگەر بە زمانی شەڕ یان زمانی ئایین پێکەوە بپەیڤن، بە ئاسانی لێکدی دەگەن.

ناوەکەشـــــی هەر لەو رووداوە بە ســـــەردا بـــــڕاوە، ئەو ئەسحابەکوژە لە دنیایێ تەنها یەك شت نەناسێ ئەویش خەوتنە، لای سەیر ئەو خەڵکە دەچنە خەوێ و ئەو تەمەنە نازدارە لە خەوێ لە ئاوێ دەکەن، بە گۆتەی گۆتیاری لە رووبارەوە فێرە رۆژ و شەونخونی بووە، هەندێك دەڵێن وا نیە! رووبار لەوەوە فێر بووە، هەتا ئێستا کەس بە چاوی خۆی ئەسحابەکوژی نەدیتیە راکشابێ و ئاگای لە خۆی نەبێ، دەڵێن لە خۆیمان بیستووە سالی یەکجار چاوێك گەرم دەکات، ئەویش بۆئەوەی خەونێکی خۆش ببینێ.

جارێك ئەسحابەکوژ بە دیار زێوە دادەنیشێ، زێ دەڕواو دەڕوا، وەرزی هاوین دەبڕێ، پایز دەبڕێ، زستان دەبڕێ، بە هار دەبڕێ، ئەو هەر دانیشتووە و وەرزان دەژمێرێ، زێ دەگاتە وەرزی باوێشکدان، ئێستاو ئێستا ئەسحابەکوژ باوێشکێ نادا.

ئەو لەگەڵ خولەش بە شەڕ هاتووە شەڕی نەخەوتن، نازانم چەند شەو و رۆژ چاو لە چاوی یەکدی دەبڕن و هیچیان نابەزن و نابەزن، ئەسحابەکوژ دەڵێتە خولە:

من رووبارم رووخاندیتە ناو خەوێوە، بەڵام وێدەچێ تۆ لە رووبار قایمت ربیت!

خوله دەڵێ:

با شەڕی من و تۆ کۆتایی بێت، چیدی خۆ لەو شەڕەی نادەین.

ئیمامەی پساوە، لە خەیاڵی ئەسحابەکوژی پساندمەوە:

*نەمانزانی دەستەی دەستەبەرەکە بۆ کام لا ڕۆیشتن، کێ دەڵێ هەر لە قەندیل نەماونەتەوە، ئای خوێنی لەبەر ڕۆیشت، مەگەر ئەو پێیەی من هێندە خوێنەی لە بەر ڕۆیشتبێ!*

چاوم پڕاو پڕە لە خوێن، ئەو خوێنەی لە پێی ئەسحابەکوژەوە رووبارێکە بە سەر بەفری قەندیل وەك ماری سوور دەکشێ و دەخشێ.

لەو رووباری خوێنەوە، تیچاوێ باریك، باریك بە قەد تاڵە قژێ، دوورتر لە رووبار دەیڕوانی و گەیشتەوە سەر ئەو دڵۆپە خوێنانەی لە جەستەی دەستەبەرەوە، ریز ریز ماچی بەفریان دەکرد، تیچاو گەیشتەوە سەر ئەو دڵۆپە فرمێسکانەی لە چاوی شۆڕە ژنێکەوە کە بە دوای دەستەبەرەکە کەوتبوو، دڵۆپ دڵۆپ ریك دەکەوتنە سەر دڵۆپە خوێنەکان، ببینە ئەو وێنەیە، خوێنی باوەشی بەفر، باوەش بۆ فرمێسك دەکاتەوە، لێرە سەیری ماچان دەکەم، ماچی لێوە گەرمەکانی دڵۆپە فرمێسك و دڵۆپە خوێن، ئەو ماچە گەرمانەی بەفریش ساردیان ناکاتەوە،گوێبگرە شۆڕەژن چ دەڵێ، ئەو سەردوولکەیە هی ژنانی چیاییە دەوران دەڕوا دەوران دێ، خوشکەکانی گاوان دەیلێنەوە و نایبڕنەوە، دەوران دێ و دەوران دەڕوا دەبێتە کۆپلەیەکیش لە سترانی جەنگاوەر، ئەوەتا ژنەکە بە هەمان ئاواز دەیلێتەوە:

پیاوی من جوانترین پیاوی دنیایە

دنکە هەناریێ بوو

بە قەد رەزێ خوێنیان گوشی

کەچی هێشتا روومەتەکانی

ئالیی هەموو دنیایان تێدایە

پیاوی من هەرگیز خەوی نایە

لەوەتەی ئەنفال نازل بووە

زریان دەنوێ، رەشەبا دەنوێ

با سەر گەرم دەکا، زێ سەر خەو دەشکێنێ

پیاوی من خەو ناناسێ هەر بە ئاگایە

ئەنفال گەیشت و دەوری داین

پیاوی من هەر شەڕ دەکا و هەڵنایە

(سترانی جەنگاوەر)

## ٧

بیستبووم، له دەرەوەی ئاقاری قەندیل، کوڕێ له کوڕەکانی پیری شالیار، له شەڕی ئایەتی ئەنفال، تیرێك ڕێك له جەرگی چەقیوە، وەلێ درەنگ زانیم ئەو ژنەی له سەر ریتمی فرمێسك سەردوولکان دەبێژێ، بووکی پیری شالیارە، منیش تا ڕێ برینێکی زۆر دەستێکم به دەستەبەرەوە بوو، له تەنکێشی دەستەبەرەوە دلۆپ دلۆپ خوێن، به دوای هەر دلۆپە خوێنێ دلۆپێ فرمێسك، دلۆپەکانم دەژمارد، خوێن و فرمێسك هاوشانی یەکدی سەردەکەوتن، دواتر دەبینم دلۆپە خوێنێ باوەشی ماچی بۆ دوو سێ دلۆپە فرمێسك دەکردەوە، لەوێ گوێم له جەنگاوەرێ بوو دەیگێڕایەوە:

ئەو کوڕەی پیری شالیار و ژنەکەی لەگەڵ ئەنفال دەکەونە شەڕێکی دەستەویەخەوە، درێژە دەکێشێ، ماندوو دەبن، هەندێك لێکدی دوور دەکەونەوە، ئەنفال پێیدەڵێ:

لەوە زیاتر ماندووم مەکە، ئەو ژنەم بۆ بەجێبێلە و بۆ خۆت بڕۆ، دەنا مەرگت مسۆگەرە و دۆزەخ چاوەڕێتە.

کوڕی پیری شالیار دەڵێتە ئەنفال:

من لەو پیاوانە نیم ژن ببەخشم، مەوەستە، فەرموو تیرو شیران بوەشێنە.

سەد تیر دەچەقێتە سینگی ئەنفالەوە هەر ناکەوێت و تیران دەهاوێژێ، تیرەك ڕۆدەچێتە سینگی کوڕی پیری شالیارەوە، ئەو ژنەی دەبینی وا فرمێسکان دەرێژێ، مێردەکەی لە پشتی خۆی دەکات و بە شابسک و کەزیان جوان دەیبەستێ، بەدەم تیر هاویشتنەوە و بە ناو تیران، دێ دێ تا دەگاتە ئێرە پشوو نادا.

ئیدی تیچاوێ نەما بۆ بینینەوەیان، نازانم لە ئاقاری قەندیل مانەوە یان بڕییان.

نیشانەکانی تەنگەتاوی و پەشۆکاوی لە هەمووان روونتر بە سەرو سیمای ئیمامەی پساوەوە دەرکەوتبوون، لە قسە و جولانەوەکانی روونتر دەبوونەوە، دەهات و دەچوو بە شەلینێ کە هیچ هەنگاوێکی بە ڕێی مەبەست نەدەکەوتنەوە، ناولەپی وای لە پشتی دەستی دەدا، دەنگیدەدایەوە، ئەو ناولەپە زلانە بە کەریش بکەوتایە جێی دەکردە ئەوجێ، برۆ و برژانگی دەتگوت غەزەبی شەیتانن، خوداوەند سلی لێیان دەکردەوە، دەتگوت زریانە ڕێی هەڵە کردووە، هەر بۆڵە بۆڵی بوو.

+ نا هەر ئێمە لە قەندیل نین، دڵنیام زۆریتر لێرە وەك ئێمە ماونەتەوە، بەڵام چۆن دەبینرێنەوە؟! دڵنیام هاوڕێکانی کوڕی پیری شالیار لێرەن، ئەوکورەی بە کوڕی ئاگری بانگیدەکەن، لێرەیە، ئا لێرەیە، دیتم لەو دیوەوە بەم دیودا دەهات، پڵینگی ئێزیدیانیش لێرەیە، مەستوورە و ئەوانیدیش هەر دەبێت لێرە بن، ئا دەبێت بیانبینینەوە.

- بە خودای ئیمامەش لە دەستچووا تۆ ئەوە چیتە بە کەیفی خۆت ناوان ریزدەکەیت؟!

+ نا، داغستانی لەسەرمانە بیانبینینەوە.

- باشه با ئەو زریانە نەفرەتیە سندانکوشتیە خەوەکی بکات، ئەمنیش هەر وای دەبینم، بریا ئەو کوڕی ئاگریەمان لەگەڵ بایە، هەر بە قسەی گەرم ئەو بەفرە ئەستوورەی دەتاواندەوە، ئەنگۆ باشی دەناسن؟

من دەیناسم رۆژێك لە ئاقاری کونەگورگ، دەبینم تفەنگی لە شانە و کوتك لە دەستی.

*- ها ئەو کوتکە چیە؟*

*+ ژ بۆ جەحشکێن جاشاغا*

*- جاش کوتکی بۆ چیە؟*

*+ ئەوانە گەلەك هیچوپوچ و بێ مەژینە، دەبێت بە کوتك سەریان پان بکەیتەوە، بە گوللە تێناگەن، ئا ئا بە کوتك، حەیفە ئەو گوللە نازدارانە لەوان خەسار بکەم،گوللە بلا ژبۆ عەسکەران بت.*

ئیمامەی پساوە:

ئەمن لەمێژە دەیناسم، هێشتا تەمەنی من وەرزی شەلینی نەدیتبوو، هێشتا لەو پێیەی مندا ئێسك سەنگەری بۆ پلاتین چۆل نەکردبوو، هێشتا لە رۆیشتنێ لە بەهاری گەرمێنێ تیژڕۆتر بووم، هێشتا ئەو سمێڵەی من بە روومەتی هیچ کچەك نەکەوتبوو، نازانم چ بایەك بوو دەستی گرتم و بردمی رۆیشتین رۆیشتین، لە سەر سەری ئاگری پشوومدا، لەوێ ئەو کوڕی ئاگریەم دیت، برنۆیەکی پێبوو لە خۆی درێژتر، هەر لە خۆوە ئەو کوڕە مندالکارە چووە دلمەوە، دوو سێ جاریدیشم دیوە، بەلام دیدارەکان دەکەوتنە کات و شوێنی هەند تەسك و

تروسکەوە، هەر جێگەی چاکوچۆنیان تێدا دەبۆوە.

داغستانی:

شەوێ لە بن دوندێ تووشی بووم، ئەو شەوە هێندە قسەی خۆشی کرد، شەوی کردە کورتترین شەو لە تەمەنی من، ئەو شەوەم لە بیر ناچێتەوە.

منیش زۆر سەرهاتی ئاگریم بیرکەوتەوە، بۆ کەس نا بۆ خۆمم گێڕایەوە:

لە بارەی کوڕی ئاگریەوە، دەڵێن:

پێش ئەوەی کەشتیەکەی نووح لەسەر جوودی بنیشێتەوە، کوڕی ئاگری لەوێ نیشتبۆوە و پێشوازیەکی گەرمی لە نووح و سەرنشینانی کردبوو، هەتا تێر چای نەکردبوون نەیهێشتبوو پەرتەی لێبکەن.

دەڵێن:

نووحیش لە یاداشتەکانی خۆیدا لە چەند دێرێك باسی تامی چایەی کوڕی ئاگریی کردووە.

دەگێڕنەوە:

لەو ساڵەی شەرەفخانی بەدلیسی (شەرەفنامە)ی تەواوکرد، کوڕی ئاگری دەستی داوەتە تفەنگ و گوتیتی:

ئەو کتێبە پێویستی بە تفەنگ هەیە بیپارێزێ.

هەندێک دەڵێن:

نا، دوای مەم و زینی شێخی خانی بوو.

هەندێك دەڵێن:

وا نیە، شەرەفخان کە تفەنگی کوڕی ئاگریی دیتووە، خەیاڵی بۆ نووسینی شەرەفنامە چووە.

لە بارەی تۆرانی کوڕی ئاگری لە (ئاگری)، دەڵێن:

بە شێخ عوبێدوڵای نەهریی گوتووە: جەنگاوەر و نوێژیان نەگوتووە! هەوڵدە لە کن خوا شتەکی بکە، بەڵکوو رازی بێت، نوێژ لە سەر جەنگاوەران هەڵبگرێت، ئەگەر بە قەردیش بێت هەر باشە.

لەسەر ئەوە شێخ بە کوڕی ئاگریی گوتووە:

تا زووە ئەو ناوە چۆلبکە، ئەگەرنا دوو قات نوێژت پێدەکەم.

کەسانێکیش هەبوون دەیانگۆت:

ئەو قسەیە هەر وا نیە، ئەمن با پێتبڵێم کوڕی ئاگری بۆچی پشتی لە ئاگری کرد و روو لە قەندیل:

نامەیەکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ناردبوو، تێیدا نووسیبووی:

لە کن خوا من و تۆ وەکوو یەکین، هەردووکمان بەندەی قوون بە گووین، چۆن دەبێ تۆ نەوەد و نۆ ژنت هەبێ، ئەمنیش هیچ، بە ناوی خوا داوات لێدەکەم نیوەی ژنەکانتم بۆبنێرە.

سوڵتان لەسەر ئەوە هەرچی تورکی دنیایێ هەیە لەگەڵ

نیـوەی کـوردی دنیـایێ، تفەنگیـان دەداتـێ و بە (ئاگری)یـان وەردەکـات، ئیـدی دەبێـتە شـەڕێك ئەو سـەری دیـار نەبێـت، کەسیش نازانێ کوڕی ئاگری چۆن خۆی دەربازکردووە!

لە مەڕ تۆرانی کوڕی ئاگری لە ئـاگری، لەولاوە شـنە یـادێ هەڵیکرد، دەنکە پساوەیەکیدم دیتەوە.

لەگەڵ کوڕە شەرابی بە دیـار شـەرابەوە دانیشـتبووین، کـوڕە شـەرابی جەنگـاوەرێ بـوو، کاتێـك لە گەرمەی شـەڕ تەقەی دەکرد، نزای دەخوێند:

خودایە ئەمن وا دەیهـاوێم، بەس تـۆ رێنەدەی پێبکەوێـت، بیدە لە بەردێك، بیدە لە دارێك، بیدە لە پـارچە ئاسـنێك، ئەوەی گیانی لەبەرە خودایە، گوللەی منی پێنەکەوێت.

بە ژمـارەی ئەسـتێرەی هەیوەشـەویەکانی ئەو شـەوە هـاوینیە پێکمــان هەڵـدا، هەر قسـە بـوو قسـەی لە دوو بـوو، قسـەی رادەکێشا، وەك چۆن پێکەکان لە رێی لێو رێژیان بەستبوو، وەك چۆن جگەرە چاوی لە چاوی ئاگراویی جگەرەیەکیدی بڕیـوو، ئاوا بنی قسە لە (ئاگری) بوو، سەری قسە بە قەنـدیلێ هەڵـدەزەنا و دەگەیشـتەوە زێـدی مەسـتوورە، لە نـاو رسـتاندا ئـامرازی پەیوەندی بوو، واتای دەبەخشیەوە بەو واتا بەدمەستانەی بە هـۆی ناسـکیی شـەرابەوە، زۆر جـار بە هەڵە لە لێـو بەر دەبـوونەوە و وێنەی شووشەی شەراب وردو خـاش دەبـوون و زرینگانەوەیـان بە رستە نەدەبوونەوە، چاوەکانی مەستوورە لە ناو پێکدا لە مانگ جوانتر دەدرەوشانەوە، هەر ئەو درەوشانەوەیەش بوو پێـك پێکـی رادەکێشا، پرچـی مەسـتوورە لە نـاو دووکەڵـی جـگەرە بە سـەر گیانــدا دەشــنایەوە، هەر ئەوەش بــوو جــگەرە جــگەرەی دادەگیرساند.

- دەزانی بۆچی کوڕی ئاگری (ئاگری) بەجێهێشت؟!

+ ڕستەکەت ڕاست دەکەمەوە بۆچی لە ( ئاگری) تۆرا!

- نا ڕاستی مەکەوە، تێکی مەدە، ئەگەر ڕاستت کردەوە ئەو وەڵامەت لە دەست دەچێت کە لای منە.

+ دەی ڕستە بە ناڕاستیەوە جوانە، لە ناڕاستیەوە ڕەنگە بچێتەوە سەر وەڵامی ڕاست.

- لە پایزەکی سەر سنووری لەبەر نمەی باران، بە دەم ڕێی هەڵاتنەوە، ناوە ناوە، بە دزیەوە، سەری چارەگیمان دەکردەوە و قومێکی بەهاریمان لە ئارەقی قاچاخ هەڵدەدا، هێندەمان زانی درەختێ لە سەر گەڵای وەریو داینیشاندین، بە نازەوە گەڵای زەرد زەردی دەرشاند و پێیدا دەپژاندین، ئەو درەختە پایزە سنووریە، دواتر کوڕە هەندرێنێ ناوی نا درەختی دڵنەوایی، لەوێ لەسەر گەڵاو ژێر گەڵای دڵنەوایی، بەو چاوانەی خۆم دەمدیت، ئەو ترسانەی بە درێژای هەڵاتن لە گیانم سەوز بووبوون، ڕەنگی گەڵاکانیان دەگرت و بە بەر چاومەوە گەڵا گەڵا هەڵدەهاتن، ئیدی ئێمە لە بن ساباتی پایزدا، خۆمان دابووە بەر باوەشێنەی پشوو، هەڵات هەڵات، گەڵا گەڵا، هەڵاتنی ترس و گەڵامان دەژمارد، دەماندیت لە پەلە هەورەکانەوە، تەڕایی لێوەکانی مەستوورە دادەباری، دەماندیت لە درزی پەلە هەورەکانەوە، چاوی مەستوورە خۆی پیشان دەداین و گیانمانی ڕووناکدەکردەوە، من هەموو پەنجەرەکانی گیانم بۆ نمەی باران ئاوەڵاکردبوو، حەیفم لەوە دەهات ئەو ساتانەی هەندێ نمە دوور لە من دەنیشتنەوە، حەزم دەکرد یەك یەکەی نمەی لێوی مەستوورە بڕژێنە منەوە.

+ ئیشی شەراب وایە قسە بە لارێدا درێژدەکاتەوە و دەیباتەوە جێگەیەك پرسیار شەرمەزاردەکات، وەرەوە سەر خەت، پرسیار لە تۆرانی پیاوە (ئاگری) یەکە بوو، تۆ لە تەڕایی لێوی مەستوورە بزربووی!

- قسە راستە رێی گرتووە، ئارامت بێ، ئێ، لەوێ لەبەر لێو و لە ژێر برژانگەکانی مەستوورە، پیاوە ئاگریەکەش لە پەنای رستەیەکەوە، بە دیار کەوت و چەند ساتێ، هاتە ناو قسە و باسەوە، کوڕە هەندرێتی گوتی:

دنیا پڕ بووە لە ئەفسانەی تۆرانی پیاوی ئاگری، با من پێت بلێم نە تۆرانە و نە هیچ، من لە خۆیم بیستووە:

- دەزانی من بۆچی (ئاگری)م بە جێهێشت؟

+ هێند چیرۆکی هەیە رەنگە خۆشت لە بیرتچووبێتەوە.

- هەموو شتێکم لە بیربچێتەوە ئەوە نا، راستیت دەوێ، شیعرێکی تۆ منی لە (ئاگری) کرد، دەزانی کام شیعر؟

+ باوەڕناکەم، بەڵام لەبەر خاتری تۆ با ئەو شیعرە بێت کە دەتباتەوە ناو هەندێ لەرازەکانی قەندیل.

- نا، ئەو شیعرەی دەتباتە ناو چاوەکانی مەستوورە و لەوێ بۆ هەتایە سەرگەردانت دەکات، من لە کەلی ئەو شیعرەوە چاوی مەستوورەم لێ هەڵهات، ئەو چاوەی لە ئاسمانی قەندیلەوە دەدرەوشێتەوە و هەموو دنیای لێ ئاوا کردم بە (ئاگری)یشەوە، ئەو چاوەی لە هەموو برژانگەکانیەوە رایەڵی راکێشانی بۆ گیانم هەڵدا، من باشووکەی (ئاگری) بووم کەوتمە تۆڕەوە، تۆڕی برژانگەکانی مەستوورە، بە خۆشم نازانم لە کام رێی

(ئاگری)یەوە پشتم لە ئاگری کرد، بە خۆشم نازانم لە کام ڕێی قەندیلەوە رووم لە قەندیل کرد، ئەو برژانگانە نازانم لە ڕێی فڕینەوە بوو یا ڕێی خشین منیان لە ئاگری کردەوە، ئا مەستوورە منی لە ئاگری تۆراند، وای لێکردم دەسبەرداری ئاگری بم، دەنا جاشی هەموو دنیا بۆیان نەبوو من لە ئاگری بتۆرێنن، سەربازی دنیایێ، منیان لە ئاگری نەدەکردەوە، ئەگەر نوێژی حەفتاو حەفت موسڵمانیش لە سەر من فەرز بکرایە، دەسبەرداری ئاگری نەدەبووم، بەڵام بزانە مەستوورەی ناو شیعرەکە لە چاو ئەو مەستوورەی من دیتم، وەکوو ئەوە وایە کە لە پێش ئاوێنەیەکی تۆزاوی راوەستابێ.

نەمهێشت گێڕانەوەی کوڕی شەرابی لە زاری منەوە بچێتە سەر زاران، ترسام لەوەی لە نێوان ئەو دوو جەنگاوەرە لە ساتەکانی قسەکردندا تێنەگەیشتن توانای خۆی خستبێتە گەڕ، ڕەنگبێ ئەویان چەند رستەیەکی پچڕ پچڕی فڕێدابێت و وای مەبەست نەبووبێت و وا کەوتبێتەوە، یاخود ئەمیان پێڕا نەگەیشتبێت بە هەڵگرتنەوەی یەك لە دووی یەکی رستەکان، ترسام لای کەس نەمدرکاند، ئەو قسەیە بکەوتایەتە سەر زاران، زۆر شت دەگۆڕا، سەرهاتێکیدی دەچووە سەر ئەو سەهاتانەی کە لە بارەی ئاگری و کوڕی ئاگریەوە، هەمیشە لە سەر زاران بوو، ئەو سەرهاتە زۆر جیا بوو لە سەرهاتەکانیدی، لە هیچ لاوە تێکیانەدەکردەوە.

چاو هەڵەتەی کردم

پەلە هەوری سەرگەردانە، نیگا سەرگەردانە..

**ئاگایی هەڵەتە بوو**

**با بردی، هەڵەت هەڵەت دەیات ...**

**چاو هەڵەتەت نەکات**

**من دەمێکە گوللە هاوێژ نیم**

**وەرە تۆ، خۆت پەنادە لە پەنای خەونێ**

**جەنگاوەری ماچهاوێژم**

**وەرە، لە سێرەی خەونمەوە دنیا ببینە**

**روومەتی کچێ نیشاندە، ماچی من نەیپێکابێ**

**خەون نەبێ، خەوم ناوێ...**

(سترانی جەنگاوەر )

## ٨

جەنگـاوەران دەبەزن، هەڵـدێن، هەڵاتنـێ نە رووبـار پێشـی پێدەگرێ، نە زریان پەکیدەخات، نە ساتمەیێ لە رەشەبا دەکات، نەهەورازی سەخت کەمێ هێواشیی پێدەبەخشێت.

جەنگـاوەر خـووی بە بەزیـنەوە گرتـووە، سـەرکەوتن لاپەڕەیەکە لەو بیرەوەریـانەی لە کتێبـی ئەو ئەفسـانانەی کە جەنگاوەر لە بێئاگایی دەینووسێتەوە، جەنگاوەر لە با هەڵاتووترە، لە رووبـار ترسـاوتر، لە زریـان شـێتتر و لە رەشـەباش تـووڕەتر، جەنگاوەر پێیەکانی بە هەڵاتنەوە بەستراون، دەنگی لێوان لێـوە لە هەڵاتن، دەستەکانی بە هەڵاتـنەوە گرتـووە، چـاوی بە هەڵاتـنەوە هەڵواسـراوە، دڵـی لە هەڵاتـنەوە لێـدەدات، هەناسـە لە هەڵاتـنەوە دێ، بـێ هەڵاتـن واتـایەك نـامێنێتەوە بـۆ جەنگـاوەر، کەس نـیە هەڵاتن لە جەنگاوەر وەربگرێتەوە.

تەنها و تەنها چاوەکانی مەسـتوورە و گـابەردە قەنـدیلیەکان، جەنگاوەر لە هەڵاتن رووتدەکەنەوە، رووتتر لە بەفـر، رووتتـر لە اگر.

ئەوەتـا سـێ گـابەردی گەورە لەسـەر ملـی قەنـدیل بە اسوودەیی سەریان بە سەری یەکتر کردووە، پێنـاچێ لە تەمەنـی

خۆیان نە بای هەژانیـان دیبـیّ، نە بـارانی وەیشـوومە، دەڵێـی بـۆ جـارێکیش گوێبیسـتی ئەو تۆپـانە نەبـوونە کە لە بـن گوێیـان دەتەقـنەوە و لەو سـەری دنیـاوە هەڵچـوون دەخەنە دەریاکـانەوە، ئەو تۆپانەی لە جبەخانەکانی شا عەباس و معاویە و ئەتاتورکەوە لە هەموو وەرزکاندا روویان لەوێـیە، ئەو تۆپـانەی بەردەوام فتـار لە قەنـدیل دەکەنەوە و نـوێژ بە بەکـۆمەڵ دادەبەسـتن، ئەو گابەردانە هەرگیز گوێیان لە ویزە ویزی ئەو گوللانە نەبـووە کە هەمیشـە و بـێ پسـانەوە قەنـدیل دەبێـژن، ئەو گـوللانەی لە تفەنگەکـانی جاشـاغاوە دێـن، سـێ گـابەردی گەورە دەڵێـی لە بەزەیی خوداوەیە، داڵدەی حەفت جەنگاوەری هەڵاتوویان داوە، دایکـانە تـرس لە منـداڵەکانیان دەڕەوێنـنەوە، ترسـێ لە غەزەبـی خوداوەندەوە لە دڵی جەنگاوەران رسکاوە.

+ چاوەکانت دەڵێی خەوی دنیایان هەڵگرتووە!

- لەگینە

+ خـۆزی کـچە خەوڕەوێـنەکە لێـرە دەبـوو، مەسـتوورەی خەوڕەوێن.

- ئەها،کە تۆپەکان نزیك دەبنەوە، چاوم چاوی مەسـتوورەش نابینێ، خەوم نارەوێتەوە.

+ من نەمبیستووە هیچ پیاوێ، ئەگەر حەفت ساڵیش بە دیـار چاوی مەستوورەوە دابنیشـێت، وەنەوزێ، باوێشـکێ بـدا، چـاوی ئەو کچەی جەنگاوەرانی دنیای فێری شەراب کرد.

- لەو دنیـایە هەر کەسـەو رۆڵـێ دەبینـێ، خـولە و جاشـاغا خەڵك فێری تەقەکردن دەکەن، مەستوورە و... فێرە شەراب.

+ مەستوورە و کێ؟

- نا ناز نازان نازانم

+ مـن تەنهـا مەسـتوورە دەناسـم ئەو رۆڵەی هەبـێ، تـۆ کەسیدی شك دەبەیت؟

- وایە، لەوانەیە بەس مەستوورە هەبێ و بەس.

+ بە خولە بە بیرمهاتەوە، دەزانـی مەسـتوورە بە چ ڕێگـایەك گەیشتە کونەکۆتر؟

- هەرگیز ئەو پرسیارە لە خەیاڵم نەبووە، نازانم.

+ ئەویش لە ڕێی کونەگورگەوە.

- ئەهـا، دیـارە ڕێگاکـانی کـونە کـۆتر لە کونەگـورگەوە دەستپێدەکەن! تۆ ئەوەت لە کێ بیست؟

+ لە مەستوورە خۆی، هەر هێندەی گوت و بەس، بەڵام لە شوێنێک گۆتبووی:

ئەو خـولەیە کە لێـی دەقەومـێ، ئاگـای لە کەس نـامێنێ، کەسـەك هەیە لە پشـتی خـولە بە چـاوان نـابینرێ، ڕەنگـی نـیە دەنگـی نـیە، نـاهێتە خەونـی کەسـیش، خـولە لە دەسـتی ئەو کەسەدایە، بێ وی لە چۆلەوانیشدا تەقەیەکی نەکردووە، بـێ وی ناتوانێ بڕیاری ئاو خواردنەوەش بدا.

- تۆ باوەڕ بەو قسەیە دەکەیت؟

+ باوەڕ دەکەم ئەوە قسەی مەسـتوورەیە، بەڵام نـازانم خـولە ئەوهـایە یـان نـا، بڕواهێنـان هێنـدەی بڕوانەهێنـان زەحـمەتە،

مەستوورەی حەفت برایان و خولەی حەفت خوشکان.

فاتیمە ترساندمی، ترسام لە فاتیمە ترسام، هەر لاپەڕەیەکی بیرەوەریەکانی خۆم هەڵدەدەمەوە و لە نائاگایی خۆم و هەموو دنیاوە بە بێدەنگی دەیخوێنمەوە، لەو لاوە فاتیمە دێ و بە رستەیەکی تەمومژاوی و لە ئاگاییەوە لاپەڕەکەی پێشانی ئاگاییم دەدایەوە، ترسام لەوەی سەری حەفت ساڵەیەك، فاتیمە بە دیداری ئەسحابەکوژ شادبووبێ و پاش سووند خواردن، بە چاڵی کچە خەونیەکە ئاشنا بووبێ، ترسام لەوەی ترسی فاتیمەش هاتە سەر ترسی تۆپەکان و ماوەی نێوان باوێشکەکانمی کورتتر کردەوە، بەڵام نەنووستم نازانم لەبەر ئێشکگری بوو، یان ترسی فاتیمە کە لە ترسەکانیدی نەدەچوو، ترسێ بووبێ خەوڕەوێن.

سەرهاتی مەستوورە لە سەرهاتی هەموو کەسان پڕ کەستر بوو، هەتا قەندیل چاو بڕەدەکا کەس دیارن و لە سەرهاتی مەستوورەدا خۆ نمایشدەکەن، سەرهاتی مەستوورە لە هەموو سەرهاتان سەرهاتترە، هێندەی لە چاوانە لە زاران نیە، هەرچی سەرباز و جاش و پێشمەرگەی دنیایێ هەن، چاویان پڕە لە مەستوورە، دەڵێن مەستوورە زۆر جاری وا هەبووە رێك کەوتۆتە ناو چاوی ئەنفال، کەچی ئەنفال چاوی خۆی لێوەرگێڕاوە و نەیبردووە، ئەو کەڕەتانەی بردوویەتیشی دوای چەند رۆژێك ئازادیکردووە، ئەوە لە ئەفسانان ئەفسانەترە، چوونکێ کەس نەیدیتووە و نەیبیستووە، لە ئەنفالدا رستەیەك هەبێ واتای چاوپۆشینی لێ بخوێندرێتەوە، ئەنفال چاوی لە فریشتەکانی خوداوەند نەپۆشیوە، چۆن لە مەستوورەی دەپۆشێ! ئەوە گرێیەکە دنیای بە تەواوی ئاڵۆز کردووە، شەیتانیش سەرەدەری لەو گرێیە دەرناکات.

دەگێڕنەوە: مەستوورە لە ماڵی حەفت برا، تاقانە خوشك بوو، کچەك بوو کوڕ نەبوو لەو دنیایە لە خەونێدا ماچی نەکردبێ، کچەك بوو لە خەونیێش نە بە خۆشی نە بە زۆر، ماچی نەدایتە کەس، جوانیەکی هەبوو دەتگوت جوانیی هەرچی کچی دنیایە بە فاتیمەوەش، خودا بە وی بەخشیوە، قەد لەگەڵ جوانیی مەستوورە رانەدەهاتی، دایك و باوکی مەستوورە لە چاوەڕوانیەکی درێژ سەریان نایەوە و نەیاندیت، ئەو زەماوەندەی ئەوان لە خەونێدا سەرچۆپییان گرتبوو نەیاندیت، دەیانویست دەستاوی دەستی حەفت بووکان تام بکەن، نەیاندیت، حەزیاندەکرد کوڕەکانیان ساتێ دەچنە جێی خەوتنێ، بە تەنیا نەبن، ژنێك هەبێ لە سەرمادا گەرمیان بکاتەوە و لە گەرمادا باوەشێنیان بکات، نەیاندیت، چەند تامەزرۆبوون مەستوورەیان بچێتە باوەشی جوانترین پیاوی دنیاوە و لەو باوەشەوە هەرچی چێژی عەرد و ئاسمان هەیە وەك نمەی بارانێ بڕژێتە گیانی کچەکەیانەوە، نەیاندیت، ئەوەی دیتیان یەکەم بلێسەی ئاگرێ بوو کە لە دوڕ ماڵی خۆیان بەرزبۆوە، هێندە و بەس، دایك و باوك رۆیشتن و ئاگریان بۆ مەستوورە بەجێهێشت.

مەستوورە لەو رۆژە ئاگراویەی دایك و باوکیان ماڵاواییان لە ماڵێکی ئاگراوی کرد، بووە ئاوکێش، تەمەنێکی درێژ لە ئاوکێشی، هەموو وەرزەکانی ئاوکێشیی دیت، ئاوی هاوینیی کێشا، هی پایزی، ئاوی زستانی، هی بەهاری، هەموو ئاوی ساڵی کێشا و رژاندیە ماڵەوە، ئاگر هەر بلێسەی دەدا و نەدەکوژایەوە، لە قسان ئیستاش بلێسە دەدات، رۆژێك بابە تایەری برا گچکەکەی مەستوورەکە لەگەڵیدا ئاوی دەکێشا و ئەویش بێ ئاگابووە لەو ئاگرەی براکانی کردوویانەتەوە، دەڵێتە مەستوورە:

- واز لە ئـاو كێشـان بێـنە ئەو ئـاگرە نـاكوژێتەوە، ئەگەر هەموو ئاوی دنیاشی بۆ بكێشین ناكوژێتەوە، ئەوە ئاگری شـەڕی براكانە، ئەو جۆرە ئاگرە كوژانەوەی بۆ نیە.

+ ئەو ئاگرە چ ئاگرە؟

- ئەوە یەك ئاگر نیە، چەند ئـاگرێكە لە نـاو یەكتـردا، كـاتێ یەكیان دەكوژێتەوە ئەوانیدی هەڵیـدەكەنەوە، دەڵـێن زەحمەتیشـە هەموویان لە یەك ساتدا بكوژێنەوە.

+ لە كوێوە هات؟

- نازانم، بەڵام لە قسان ئاگرێكیـان لە عەرەبسـتانەوە هـاتووە، ئاگرێكیـان لە ئینگلزسـتانەوە، یەكیـان لە ئەسـفەهانەوە، یەك لە ئەستەنبوولەوە، یەك لە شامەوە، ئاگرێك لە بێ دادەوە.

+ شەش ئاگر!

- نا حەفتە، ئەویدی كە زۆر لە ئاگرەكانیدی بڵێسەدارترە، هەر لە ناو ماڵی خۆمان لەوەتی دنیا دنیایە هەبووە، بەڵام ئێمە تـا ئێستا هەستمان پێنەكردووە.

ئیـدی بە نـابەدڵی مەسـتوورە و بـابە تـایەر مـاڵ بـۆ براكانیـان چۆڵـدەكەن و سـەری خۆیـان هەڵـدەگرن و زیـندی خۆیـان بە جێدێلن، ڕێ دەیانگەیەنێتە چەند ڕیانێ، لەوێ قسـەی خوشـك و برا تێكناكەنەوە، لەوێ لە دڵەوە یەكتر مـاچ دەكەن و بە نـابەدڵی هەر یەكەیـان ڕێگەیـك دەگـرێ، بـابە تـایەر خـۆی لە هەمەدان دەبینێـتەوە و مەسـتوورەش دەگـاتە سـنە، لە بـارەی لێكـدابڕانی مەسـتوورە و بـابە تـایەری بـرای، هەزارویەك گێـڕانەوەی جۆراوجـۆر هەیە، پێویسـتی بە هەزار شـەویش هەیە ئەگەر

بتەوێت لە تێری و وەك خۆی بیگێڕیتەوە، مەستوورە گۆتبووی:

هەموو ئەو قسانە هەڵبەستراون و هیچیان ڕاست نینە.

پێیانگۆتبوو، بە مەستوورەیان گۆتبوو:

دە مـــادام وایە، بـــا لە زاری خۆتـــانەوە ببیســـتین و بـــزانین لێکدابڕانەکە کوو بووە!

گۆتبووی:

ئەگەر منتان خۆشدەوێت، جارێکیدی ئەو پرسیارەم لێمەکەن.

گۆتبووی:

هەر کەسێك منی خۆشدەوێت، با هیچ لەو سـەرهاتانەی کە کەوتوونەتە سەر زاران و باس لە چیرۆکـی دابڕانـی مـن لە بـابە تایەر دەکەن، بۆ کەسی نەگێڕێتەوە.

بریـــا مەســـتوورە ئەو قســـەیەی نەدەکـــرد، مـــن حەزم لە گێـڕانەوەی هەنـدێك لەو سـەرهاتانەیە، خۆشـترین و ناسـکترین سەرهاتن لە نێوان خوشك و بـرا، سـەرهاتی وا نەبـووە و نابێـت، دەســت بە گێڕانەوەیــان بــکەم، لێــی تێــر نــابم، دەچــمە دووی، هەمووی دەگێڕمەوە، نا مادام مەستوورە پێی ناخۆشە نایگێڕمەوە، من مەستوورەم بە قەد بەرزایی چیاکەی ئەوێ خۆشدەوێ.

من سـەرگەرمی پـرۆڤەی هـونەریم، هـونەری دزیـن، دزینـی بیرەوەری، ناوە ناوە جاسووسانە دەچوومە دیار چـاڵەکە و چـاوم دەبڕیە دوڕ چاوانەوە، دەبینرام، دەگیـرام، تەریقـدەبوومەوە، چـۆڕ چۆڕ ئارەقەم دەڕژانـد، وەرە قەنـدیل بـۆن بـکە، بەفـری قەنـدیل بۆنی ئارەقەی شەرمەزاریی منـی لێـدێ، پـۆلای فـاتیمە لە چـاڵی

کچە خەونیەکە قوولتر رۆدەچوو، دەمگوت دزینی بیرەوەریی ئەو لە هەڵهێنجانی پەقرەجە ئاوێ ئاسانترە، چاوی لە چاوی من بە ئاگاتربوو، لێوی لە بێدەنگیەکەی کرتر بوو، لەو بێدەنگتر، نزیك لە بێدەنگیەکەی دادەنیشتم، کەچی چاوم بە هەڵەش نەدەکەوتە سەر وێنەیەك لە سەرهاتەکانی، لە بلندگۆی ورێنەشەوە، دەنگێ لە سەرهاتەکانیەوە نووزەی نەهات، بە خۆم دەگوت و دەگوتەوە، مەنگیی ئەو کورە لە بەردەوەیە، نابێت لە ئاوەوە بێت، هەموو جارێکیش خۆم بە درۆ دەخستەوە و پێکەنینم بە بڕیاری وا دەهات، نا نا مەنگیەکەی لە هیچیانەوە نیە نە زادەی بەردە نە زادەی ئاو، هەبێ نەبێ سەرهاتەکانی لە چالێکیدی تەقەتکردوو، نە ئەسحابەکوژ هەڵیکەندووە و نە کچە خەونیەکە رۆژێ لە رۆژان رێی بەو چاڵە کەوتووە، نا چاڵێکیدی، تیشە بەردێکیدی، ئەسحابەکوژێکیدی، کچە خەونیەکیدی، ئەو ساتانەی دەچوومە بەر دەمی و چاوم لە چاوی دەبڕی، بزەیەکی دەهاتێ:

گەمژەیەکی جوانی!

بەوەی باش بوو ئەو دەمە من ناوم (گەمژە) بوو، دەنا پتر ریسوایی خۆمم دەچنییەوە، گومان گومان، گومان کەوتە سەر سەرهاتەکانی فاتیمەش، گەیشتەوە سەر خەونەکەی ئەسحابەکوژ، دەمگوت رەنگبێ کچە خەونیەکە درۆی لەگەڵ کردبێ، ئەویش درۆی لەگەڵ من کردبێ، فەلاك ئەوی لە خشتە بردبێ، فاتیمە منی لە خشتە بردبێ، نا رەنگە ئەسحابەکوژ شێت بووبێ و وەك چۆن هیچ دەسکەوتێ کە دەستی دەکەوت بە تەنێ بۆ خۆی نەبووە، برا بەش لەگەڵ هاوڕێکانی بەشیکردووە ئاوا لە شێتایەتیش، منی بێ بەش نەکردووە.

+ ئەگەر رووبار لە گومان رووتبکەینەوە، واتایەك بۆ ناو نامێنێتەوە، ژیانیش لە زۆر ڕێگەوە دەگاتەوە رووبار ئەگەر لە گومان هەڵەچنمان کرد، لە رووبارێك دەچێت کە لە هیچ وەرزێ چۆرە ئاوێکی نەدیتبێ، بەڵام چ لە رووبار چ لە ژیان هەندێ بەردی چەقیو هەن.

- بەردە چەقیوەکان دیارن! لە کوێن؟

+ لە هەموو جێگەیەك هەن، بەڵام رەنگە بە سانایی نەکەونە نیگاوە.

- دەزانی ترسانێ لە تۆ دەترسم، خواو شەیتان بەیەکەوە هێندە ترسەیان بەسەر منەوە نیە.

+ ترس لە من؟!

لە ترسی ئەو پرسیارەی فاتیمە، بە لەرزینەوە، بێ ئەوەی کاتم هەبێ بۆ باوێشکێ، بۆ وەنەوزێ، بزر بووم، وا بزانم نووستم، دەبێت نووستبم، ئا نووستم، بۆ ئێشککگریی بانگیانکردم، خەونیشم دیت، تا زووە دەیگێڕمەوە، نەبادا لە بیریکەم، نا ئەو خەونە هەرگیز ڕێی ناکەوێتە لە بیرچوونەوە:

لە سەر چیایێ بە دیوی ڕێبەندانەدا، چاوەیەکی گچکەی دیوار لە بەرد، عەرد لە بەرد، بان لە بەرد، دەرگا لە بەرد، هەمووی لە بەرد، تەنها سۆبەیەك لە تەنەکە، ئەو چاوەیە گەرماوێك بوو لە سەهۆڵبەندانی چیا، بە دیار ئاگرەوە لە چیا تەنیاتر بووم، ئەو بەفر دەینووسیەوە و منیش ئاگر، دیتم بەردی دەرگا دەلەرزێ، ترسام زۆر ترسام، لە ترسەوە لوولەی تفەنگم لە دەرگا کرد، دڵنیام رەوە گورگە و پاش کەمێکیدی پارچە

پـارچەم دەکەن و دەبـمە جەمە خـۆراکێ بۆیـان، لە ترسـەوە فیشەکێکم تەقاند، نازانم کێ گرتیەوە دەنا بە گـوللەکەی خـۆم، خۆم دەکوشتەوە و ئەرکی گورگەکانم سووکتر دەکرد.

+ تەقە مەکە خۆمانین.

- خخخخ ۆۆۆ تتت اا نن

+ منم مەستوورە.

بە دیار سۆبەوە دانیشتین، ئاو لە هەمـوو گیـانی دەچـۆڕایەوە، مێوژی دەرهێنا، خواردمـان، جلکەکـانی داکەنـد، دەسـتی خسـتە سەر چاوم، گوتی:

کاتی سەیرکردن نیە، تام تام!

تێیگەیاندم بۆ ئەوەی هەرچی چێژی دنیا هەیە، تام بکەیـت، دەبێـت بە چـاو داخسـتنەوە بێـت، لەوێ لەو هـۆدە ئـاگرینیەی گەرمـایی دەبەخشـییە سـەهۆڵبەندانی چیـا، لەوێ لەو ژوورە بەردییەی هەرچی نەرمیی دنیا هەیە خـۆی راخسـتبوو، لەوێ لەو چاوە ترسناکەی ئارامیی دنیای لە خۆ گرتبوو، چاوم داخسـت و ئـاوێزانی مەسـتوورە بـووم، ئەو میـوەیەی مـن لە مەسـتوورەم چنیـیەوە، هـیچ ئاگرپەرسـتێ لە ئـاگردا نەیچنیـوەتەوە، هـیچ ئەویندارێ لە ئەویندا دەستی بۆی نەبـردووە، هـیچ پەیـامبەرێ لە کتێبەکەیدا، بە خەیاڵی خوداوەندانەش بە لایـدا نەچـووە، ئەوەی من بـێ سـەیرکردن تـاممکرد، مەگەر تەنهـا مەسـتوورەی چـاوە خەونـیەکە تـامی کردبـێ، نـا کەس، کەسـیدی جـگە لە مـن و مەستوورە تامی نەکردووە.

دەمێکبوو مەستوورەم دەناسی، جـاری یەکەم رەنگبـێ هەر لە

نزیك ژووره خەونیەکە بووبێ، هەر بوونی ئەویش بوو منی فێره ئێشککگریی کرد، فێری کردم هەر بە چیایی بمێنمەوە، جارێك گوێم لێی بوو دەیگوت:

ناچارم هەر بە چیایی بمێنمەوە.

ئەو دەمەی من قسەی لێوه دەکەم، هێشتا کوڕه ئاگریی هەر لە ئاگری بوو پێی نەخستبووه ئاقاری قەندیلەوە، زەکیە ئالکان تازه ئاشنایەتیی لەگەڵ ئاگری زەردەشتی پەیداکردبوو، هێشتا فاتیمەش خۆی بۆ دیجله رووت نەکردبۆوه، باسی سەردەمانێکی کۆن دەکەم، هێشتا ئایشەگوڵ جەرگی نەسووتا بوو، لەو دنیایە بەردێ نەبوو بە قارەمان بانگبکرێ، کەس لە ئاوی ئاراسی نەدابوو، چوارچرا چ ئاشنایەتییەکی لەگەڵ پێشەوا نەبوو، قەنارە شێخ سەعیدی نەناسیبوو، زوو، ئەو دەمانێ عومەری خاوەر لە کانی عاشقان دەزنوێژی هەڵدەگرت و بۆ نوێژی سبەینان دەچووه مزگەوتەکەی عومەری خەتاب، ئەو دەمەی من دەیڵێم خومەینی و ئەتاتورك و سەدام و مەلایەکەی هەڵەبجەیی بە یەکەوه لە حوجره قورئانیان حنجه دەکرد، مارکس هێشتا قسەیەکی پێنەبوو لە بارەی تریاکەوە...

لەوێ، مەستوورەم دیت، مەستووره چ مەستوورە! تەنها لە جلوبەرگدا خزمی مرۆڤ دەبۆوه، لە قسەکردندا تەنها وشە بوو لە مرۆڤیان دەکردەوه، دەنگی مەستووره هیچ بوونەوەرێك پێی ئاشنا نەبوو، رێکردنی مەستووره سبەینان لە با دەچوو، ئێواران رووباری بوو، شەوان دەتگوت کشانی ئەستێرەیە، خۆزی دەتاندیت ئەو ساتانەی پرچی دەکردەوە! پرچ چ پرچ! رەنگێ کەم و زۆر بە لای ئەو رەنگانە نەدەچووکە چاوی مرۆڤ پێیان

ئاشنایە، کە بای چیا پەخشی دەکرد، هەورێ بوو نم نم مێخەک دەباراند، مێخەکێ مێخەکتر لەو مێخەکە تایبەتیەی خوداوەند کە پێش ئەوەی پەیامبەرێ بۆ زەوی دابەزێنێ، بە دەستی خۆی سەر شـانەکانی مێخەکرێـژ دەکـرد، مەسـتوورە بـوونەوەرێ بـوو خوداوەنـد نـاوی نـابوو مەسـتوورە، لەوێ مەسـتوورەم ناسـی، لە تەوقەیەکدا، لە دنیـا بزربـووم، لە پەنجەکـانیەوە جـوولەی دنیـای رژاندە گیانمەوە نەمزانی لە کوێ خۆم دیتەوە، چاوەکـانی نەبـان شەیتانیش نەیـدەدیتمەوە، ئەو چـاوانەی مەنزڵـی هەمـوو نیگاکـان بوو، بینایی کوێرەکانی دنیاشی لە سەر بوو.

دیدار کەپرێ بوو لەو کەپـرانەی لە هەناسـەی جەنگـاوەران هەڵـدرابوو، دیـدار جـۆلانەیێ بـوو لە بـا، جـۆلانەی پیاسـەیێ لە نێوان ماڵی ئێمە و ماڵی مەستوورە، پیاسەیەك بوو رسـتەیەکی تیـا نەگوترا، مەستوورە کەمدووترین کچی دنیا، کچێ نـازی نەبـوو، تاکە جوانی دنیـا بـوو کە بە هێمـایەکیش نـازی جـوانیی خـۆی نیشانی هیچ چاوێ نەدەدا، هەندێ دەیانگوت:

خۆی نازە بۆیە نازێ ناکات.

لەوێ من بوێرم نواند، بـوێریەک هەمـوو ئیرەییـان پێـدەبردم، خۆزگەیـان دەخواسـت لە جێـی مـن بـان، لەوێ شمشـاڵ لای هەمـووان خۆشەویسـت بـوو، لەوێ رەقتـرین جەنگـاوەریش لە شمشـاڵدا تـوایەوە، نەرم نەرم تـوایەوە، تێمهەڵکـرد، کەپرێـك لە دانیشتن، لە سێبەری کەپر لەگەڵ مەستوورە، شمشاڵژەنین بە دیار مەستوورەوە، ئەو ساتە خۆزگەییانەن کەس نەبوو خۆزگەیـان بـۆ نەخوازێـت، کەس نەبـوو خەونیـان پێـوە نەبینێـت، ئەوەتـا مـن و مەستوورە لە سێبەری کەپرێ کە بە ئاسمانەوەیە و نیوەی تەڕایی

دنیای لێوە دیارە، لە ناو جۆلانەی بـا دانیشـتووین و مـن فـوو بە شمشـاڵدا دەکەم، پەنجەکـانم وەك قـژی مەسـتوورە داوەتە بـا، ئەوەتا شمشـاڵ دەسـتی مەسـتوورەی گرتـووە و دەیبـات، خۆی گوتەنی:

بە سـەر هەمـوو دەریاکانـدا فـڕیم و ئەوەتە پـرچم بە ئـاوی دەریاکان تەڕ تەڕن.

مەستوورە نووست، نووستنێ خۆی گوتەنی:

تەنها لە کۆشی دایکم ئەو دەمەی تەمەنم هەر حەفت ساڵێك دەبوو، خەوی وام کردووە.

خەوتـنەکەی مەسـتوورە دەنگیـدایەوە، ئەگەر ئەو خەوتـنەی مەستوورە نەبا، شمشاڵیش هێندە هۆگرەی نەدەبـوو، مەسـتوورەی مەستانیش نەدەبووە سەربەندی بەندان، مـن ئەو سـاتانەی بە دیـار مەستوورەی خەوتووەوە شمشاڵم دەژەنی، هێندەی باڵندەیەکی لە نیشـتنەوە تـۆراویش پەیوەنـدیم بە زەویەوە نەمـابوو، لە ئاسـمانێ دەفـڕیم، بـاڵم لە ئەسـتێران دەخشـاند، لە دوورەوە زۆر دوورەوە شـینایی دەریـاو سـپێتیی چیاکـانم دەدیـت، ئەو سـاتانەی لە نـاو جۆلانەی با شمشاڵم بۆ مەستوورە دەژەند، دەمگوت تـازە تەواو، جارێکیدی بە سەردانیش بە زەوی ناکەومەوە، مەستوورە لە هیچ کۆمارێ جێگەی نەدەبۆوە، نە کۆمـاری ئەفلاتـوون، نە کۆمـاری ئیسلام، نە کۆماری بەفر، نە هی ئاگر، پرچی مەسـتوورە هەورێ بوو، نەدەڕژایە لەچکەوە، لەنجەی مەستوورە شیعرێ بـوو هۆشـی دەخستە سـەمای دۆڕانەوە، لە پەنـجەی مەسـتوورەوە گەرمـاییەك دەهـات چیـایەك لە بەفـری دەڕژانـدە رووبـارەوە، هەناسـەی مەستوورە چیایەك لە ئاگری دەخستە دۆخی هەڵمیەوە، مەستوورە

ڕەنگە لە ڕێگەی هەڵەوە بوویێ ڕێی کەوتبێتە کۆماری جەنگاوەرانەوە.

مەستوورە هەموو دەورانی ئەنفالی دیت و هەر بە کچی مایەوە، هێشتا حوسێن بە سەرەوە دەگەڕا، ئەنفال دەستی گرت و بە پیاسە گەیاندیە دورگەی عەرەب، کەس نازانێ بە کوێدا خۆی گەیاندەوە چیا و بە درێژایی ڕێ کچێنیەکەی لە کوێ تەقەت کردبوو.

حوسێن بێ سەر دەگەڕا، ئەنفال هات و مەستوورەی دیتەوە، بردی بردی لە کەناری زێی نیل بە رووت و قووتی رووتتر لە نیل لە سەر پشت درێژی کرد، دیسانەوە هەڵات، پێڵاوەکانی لە بیرکرد، بەڵام کچێنیەکەی هێنایەوە.

تیژترین چاو چاوی ئەنفالە، لە بیابانەوە تەماشای چیا دەکات، لە بن بەفری قەندیل ناسکە ڕێواسی لێ دیارە، لە بیابانەوە دەڕوانێ لە ئاگری دنکە زەنگیانە دەبینێتەوە،کەچی مەستوورەی لە باوەش بوو، کچێنیەکەی نەدیتەوە، دنیا بە دوای کچێنی مەستوورەوە بوون، کەس نەیگەیشتێ، تا چەند ساتێ لەمەوپێش مەستوورە هەر کچ بوو، لە هۆدە خەونیەکەوە،کچێنیەکەی خۆی بە پیاوێکی ترسنۆك بەخشی.

+ پێدەچوو لە بەهەشت خەوتبیت!

- کام نیشانەی بەهەشتیم پێوە دیارە؟

فاتیمە بە لێوە قەسپیەکانی بزەیەکی نماوی کرد و لە چاوە نێرگزیەکانیەوە دیتم نێرگزیەتی تیچاوی لە سەر دامەنمە، تەریقبوومەوە، ئارەقەم کرد، هێشتا تەڕایەتی ژوورە خەونیەکە،

ئەو تەڕایەتیەی دەبوو بڕژێتە کۆشی مەستوورەوە، بە هەڵە وا بە شەروالی بەر نیگای فاتیمەوە.

ئەو ساتانەی دەوران خەون دەوردەکاتەوە، ئەو خەونەی لە هەر هەزار ساڵێك کەسێك دەیبینێ، وەك ئەو خەونەی من دیتم، خەونی مەستوورەیی، خەونێ هەزار ساڵە هەرچی جەندرمە و جاش و جەنگاوەر هەیە، لە گەرمەی شەڕەکاندا، لەو ساتانەی لە سێبەری مەرگدا دەچنە گەمەی ژیانەوە، بێ مۆڵەت وەرگرتن لە کات، سەر خەوێ دەشکێنن، خەوێ بۆ خەونێ، خەونێکی مەستوورەیی، دەورکردنەوەی خەونی وا، یادێکە زیندوو، زیندووتر لە رابردوو، یادێکە پڕ جیلوە، جیلوەدارتر لە ئێستا، یادێکە لە ژوانی ئایندەیی.

لە ریبەندانی قەندیل واتایەك بۆ دۆڵ نامێنێتەوە، بەفر، لووتکە لە لووتبەرزی رووتدەکاتەوە، هەر لەو قەندیلە ئاگایی و نائاگایی لووتکە و دۆڵی بن بەفری ریبەندانن، هەنووکە لە نێوان کەپرە رۆژی مەستوورەیی و ژوورە شەوی مەستوورەیی لە نائاگاییەوە هەڵدێم و لە ئاگاییەوە ئاوا دەبم، تێدا مامە لە نێوان دوو مەستوورە، مەستوورەی کەپرە پایزی، مەستوورەی ژوورە زستانی، مەستوورەیەك بە کچێنیەوە دەشنایەوە، ئەویدی لە ژنێتیدا خۆی راخستبوو، ئێستا جەنگاوەرێکی هەڵاتووی رێ لێگیراوم، جەنگاوەرێکی داگیرکراوم، خەونێ هاتۆتە ئاگایی و بینایمی زەوت کردووە، دەبێت مەستوورە ببینم و بزانم هەر مەستوورەی ژوورە بەردینیەکەیە، یاخود مەستوورەی کەپرە جۆلانەیی، نا مەستوورەی ژوورەکەیە، ئا هەوە ئەگەر لە بیریشیچووبێت بە بیریدەهێنمەوە.

+ تۆ لەبەر خۆتەوە وڕێنە دەکەیت!

- من! کا!...

+ چ کـا! هێـزی گـوێگرتنم هەبـا، ئێسـتا هەمـوو رسـتە پچڕپچڕەکانتم وەردەگرت و بە رێکی بۆم دەگوتیەوە.

- ببوورە فاتیمە، سەرم...

+وایە زۆر جـار لە سـەردا خەون و وڕێـنە و راسـتی بە شێوەیەك تێکەڵاوی یەکتر دەبن، لێکدی جیـا نـابنەوە، ئاگـاداری خۆت بە.

- وابزانم تۆش نهێنیان دەخوێنیتەوە!

+ ئەوانەی من دەیانخوێنمەوە نهێنی نین.

- وایە بەس...

+ من خەوم دێت ببوورە.

فاتیمە سەری بەسەر تاخمەکەی کرد، دەبێـت ئەو چ خەونـێ ببینێ!

لەوێـوە، لە شـەوی بـن بەردی بـن بەفـرەوە، بە دیـار یـارانی ئەشکەفتەوە، بە دیار فاتیمەوە، خەیاڵم هەر لای مەستوورەی نـاو خەونەوە بـوو، لای مەسـتوورە بـوو، ئەو مەسـتوورەیەی هەزار سەربردەی رفاندنی هەبوو:

کـوڕە هەرزەکـارەکەی رەزا شـا، ئەو کـوڕەی حەفـت شـەو مەسـتوورەی بە دەسـت و پـێ بەسـتراوی لە ژوورەکەی خـۆی هێشتەوە، دواتر لای برادەرێکی خۆی پێیلێنـابووکە هێشـتا نەبـۆتە پیاو!

ئەدی چیرۆکی مێزەر بەسەرەکەی قوم، ئەو چیرۆکەی لە زاری مەستوورەوە کەوتۆتە سەرزاران، مەستووره هێشتا منداڵکار دەبێت، مێزەر بە سەرێ تەمەن حەفتاو حەفت ساڵ، بە سێ ئایەت چاوی مەستووره دەبەستێ و دەیبات، هەست بە شلبوونی مەستووره دەکات، خۆی رووتدەکاتەوە، دەست بۆ بەرکۆژەی مەستووره دەبات، لەو دەمە مەستووره چاو دەکاتەوە، هەر بە مێزەرەکەی خۆی توند چاوی دەبەستێ و پێیدەڵێ:

خاتری تەمەنت دەگرم، تۆ بە سێ ئایەت چاوی منت بەست، بەڵام من بە یەك مێزەر چاوت دەبەستم.

چاوی دەبەستێ و بەجێیدەهێڵێت.

بەڵام من چاوی مەستوورەم نەبەست، ئەو بە دەست چاوی منی بەست!

**ماندووتر لە دوێنێ**

**ماندووتر لە سبەی**

**چاوی من چ ماندوویێکی پڕ وەنەوزە**

**لە بەرزایی هەوری بەرزەوە**

**تەمەنێکی بێ رۆژە شەونخوونی بۆ زێدێ دەکەم**

**زێدێ، لە ناو خەونی ئاڵاو والای خۆیدا**

**جێ تیشکێ بۆ سەرگەردانێ ناکاتەوە**

**زێدێ، باوەشی خەو**

بۆ باوێشکی من ناگریتەوە

ماندووم.. ماندووتر لەو گەلایەی

لە دەستی باوە بۆ دەستی با

جێگەیەك دالّدەی نیشتنەوەی نادا

بەفر دەلّێ:

چالّێ لە قەندیل هەلّکەنە، چالّێ

گەرم گەرم داتدەپۆشم

بخەوە، بە قەد ساتەکانی بێداری بخەوە

بێ خەم بخەوە وەك مندالّ

نە پەنجەی زریان دەتگاتێ

نە لوورەی ئەنفال

(سترانی جەنگاوەر )

## ٩

سـەرەڕای دار خڕکـردنەوە، بەفرمـاڵین، هەڵکەنـدنی چیـا، وەرزشـی هەمیشـەیی حەفـت جەنگـاوەری هەڵاتـووە، بە پانتـایی جێی پیاسەی حەفت کەسـی، بەفـر بـۆی نەبـوو لێـی داکـوتێ و بیکاتە ماڵی خۆی، دەبـوو رۆژانە، شـەوانە چەنـد جـارێ جـێ بە بەفر چۆلبکرێ و جەنگـاوەران لە نـاو بـازنەی بەفـر و بە دەوری ئاگرا لە سووڕانەوەی تەمەندا پیاسە بکەن، دەبوو رۆژانە، شـەوانە لە هـۆڵەکەدا، کـاری حەربەکـاری بکـرێ و بـن سـێ گـابەردی گەورە هەڵبکەنـرێ، ئەوەتـا جەنگـاوەران دەڵێـی گـۆڕهەڵکەنن، گۆڕی گەورە، گۆڕی بە کۆمەڵ... ئیمامەی پساوە دەیگوت:

چەندێ قووڵتر بێت، گەرمتـرە، خەوی خۆشـترە، خەونیشـی جوانترە.

سەردەستەی مراویان هەڵیدەدایێ:

چایەش تامی خۆشتر دەبێت.

داغستانی:

جگەرە جگەرە، دووکەڵی جگەرە بە فیڕۆ ناچێت.

هاوڕێی گیڤارا:

دەنگیش لە شوێنی قوول ناسکتر دێتە گوێ.

فاتیمە:

بەڵام ڕەنگبێ شوێنی قوول بەربەست بێت لە پێش بیرکردنەوەی قوول.

من گوتم:

لەگینە لە شوێنی قووڵدا خەونی جوان ببینرێتەوە.

ئەو ساتانەی لە هەڵکەندندا تووشمان بە تووشی بەردێکی گەورەوە دەبوو، کچە خەونیەکەی ئەسحابەکوژ دەهاتە ناو چاومەوە، پۆلای فاتیمەش هەر پۆلابوو بە قسەی گەرم، گەرم نەدەبوو تا بە قسەی سارد بێتەوە، ئاودەستەکەی شەیتان هێندە پەنجە و پێی دەسکاریی تێدا گەڕاوە و پێیکەوتووە، شەیتان ڕێی بێرە بکەوێتەوە، ناینانسێتەوە، تەواوێ قوول بووە و بە سانایی پڕ نابێتەوە.

لە دیوارەکانی حەفت بازنەی خواروخێچ کێشراوە، هەر بازنەیەك بۆتە جێی خەتخەتۆکەی جەنگاوەرێکی هەڵاتوو، کەسیش خەتی ئەویدی پێناخوێندرێتەوە، فاتیمە نالێم، ڕەنگبێ ئەو سەرەدەریەکیان لێدەربکات، جەنگاوەران وێناچی خۆیشیان بزانن چی دەنووسن و چی دەکێشن، من ئەگەر لە بازنەکەی خۆم بچمە تاقیکردنەوەی پرسیارانەوە، هێ لە دەم تێکئالان لەوانەیە رستەیەکم نەبێت بۆ وەڵام، نازانم ئەوانیدیش وەك منن یاخود نا، داغستانی بە نەخوێندەواریی خۆیەوە، دەسخەتی لە هەمووومان خۆشترە، ئەویش وەك ئێمە لە سەر بەرد لەو بازنەیەی

بۆ خۆی گرِیداوە، شت دەنووسێت، وەك ئێمە شت دەنووسێت، جێگاکەی داغستانی کەوتۆتە لای دەرگاوە، وەك خۆی دەڵێت لەوەتەی هەیە هەر لای دەرگاوە بووە، لە نزیك دەرگای دوور بخەنەوە، عەجمانی نامێنێت، لە هەر ژوورێك لە نزیك دەرگاوە نەبێت، حەفت ساڵ راکشێ، هەر تەنیشتان دەگۆڕێت، خەوی لێناکەوێت، دەیگوت:

ئەگەر دەتانەوێت خەوم لێنەکەوێت، وەرن جێگاکەم داگیربکەن.

ئەوجا بەرێ خۆ دێ، لە ناو کیسەی خەوێ تەنیشت گۆڕین چ کارێکی زەحمەتە، خەوی ناو کیسەی خەو خەوێکی مەیلەو زیندانیە، دەتگرێت، توند دەتگرێت، ئازادیی لە جوولەی لەش وەردەگرێتەوە، داغستانی گۆتەنی:

چەند خۆشە کە دەخەوێت پێیەکت بگاتە رۆژهەڵاتێ، ئەویدی لە رۆژئاوا بێت و بچێت، دەستێکت لەو سەری دنیایێ ئەویدی لەم سەر، ئای رزگارمان بایە لە کیسەی زیندانێ.

جێگەی فاتیمەش لە بنەبانێ، لە پەڕگە بوو، جێگەی پۆلای فاتیمەش لە تەنیشتە وی، بەڵام هەندێك دوور، نێوانیان دوو تفەنگ جێگەی دەبۆوە، فاتیمەی ناو کیسەی خەو جەستەیەك بوو، ناسك ناسك مێیاتی خۆی رادەخست، لەشولارێک بوو زۆر ژنانەتر لە فاتیمەی دەرەوەی کیسەی خەو خۆی نمایشدەکرد، فاتیمە کاتێ دەخزێتە ناو کیسەی خەوەوە و پرچی لە دەرێ دەهێڵێتەوە، لە دیدی منەوە خزمی ماسی دەبێتەوە، ماسیەك لە ناو گۆمی روون، پۆلای فاتیمە لە هەمووان پتر لەگژ خەتخەتۆکەی سەر دیوارە.

قەنـدیل نەشـەوی شـەوە نە ڕۆژی ڕۆژ، شـەو و ڕۆژی ئەو کەسـەی لە قەنـدیل قسـە لە شـەو و ڕۆژ دەکـات، تەنهـا بـۆ کردنەوەی کات و گرێدانەوەی کاتە.

- تۆ وەرە بە حەفت کەسان دوو رادیۆت هەبێت، هیچیشـیان ئیش نەکەن، باش لە دنیا دابڕاین!

- کـوڕە رادیـۆ باسـی چ دەکـات! دەڵـێ هـۆی حەفـت کەرەکەی قەندیل وەرن بێرەدا بڕۆن دەردەچن! وەرن ئـا ئەوەتـا لێرێهێ جۆ هەیە؟

- ئاگامان لە دنیا دەبوو، چ بووە چ نەبووە.

- مـن نـامەوێ ئاگـام لە دنیـا هەبێـت، پێویسـتم بەوەیە دنیـا ئاگای لە من بێت، بۆ من لێم قەومایە یان دنیای گەواد؟!

داغسـتانی بە شـێوەیەك وشـەی (گەواد)ی گـۆکرد، هەر گەوادێك گوێی لێی بـوایە، بـۆ هەتـایە وازی لەگەوادی دەهێنـا. ئەگەر لەو وازهێنـانە دنیـای لە دەسـت چووبـا، ئەو گەوادەی لە دەمـی داغسـتانیەوە دەرچـوو هـیچ گەوادێ نەبـوو خـۆی لە بەر رابگـرێ، ئەو پیـاوەی تـا چەنـد ڕۆژێ لەمەوبەر لە میهرەبانیـدا مەسیح ئیرەیی پێدەبرد، ئیستا پیاوێکە لە تـووڕەیی، پیـاوێکە وەك لیمـۆ بیگوشـی، چـۆڕە ئـارامیەکی لـێ نـاتکێ، ئیسـتا ڕێـك لە شێرەکەی بەشـەریەت دەچێـت، ئەو شـێرەی لە تەنیشـت شـێری خوداوە هەڵواسرابوو.

پێشـترێ بیسـتبووم لە زۆر شـوێنی ئاقـاری قەنـدیل، رادیـۆ خەسـڵەتی بەرد وەردەگـرێ، وردیشـی بکەیـت قسـەیەکت بـۆ ناکـات، ئەگەر لەبەر خـاتری خـاتران بێـتە قسـە و بێـدەنگی

بشكێنێ، ئەوا تەنهاو تەنها رستەی پاشای بێ دادی بەسەر زمانیدا دادێ، لە گۆرانیش تەنها گۆرانیەکی کاوێزاغای لەبەرە و بۆت دەڵێتەوە، کەسیش لەو نهێنییەی رادیۆ شتێکی ئەوتۆ نازانێ، ئەوەش بۆتە رازێک لە رازەکانی قەندیل، بیستبووم هەر لە ئاقاری قەندیل بە دیوی هەتاودا، رادیۆی بێ داد بەردەوام دەنگی دێ و نایبڕێتەوە، ئیدی حەفت جەنگاوەرە هەڵاتووەکە ئێستا لە جێگەیەکن لەو جێگایانەی رادیۆ لە قسەکردن بە رۆژوو دەبێت، رۆژووگرتنێ هەرچی گوێی دنیا هەیە بۆی هەڵبخەیت، ئارەزووی شکاندن ناچێتە زارییەوە.

- من دەمەوێ تێبگەم بۆچی رادیۆ لەو قەندیلە وەك بەرد قڕوقەپی لێدەکات، ئەگەر بێتە دەنگیش هەر دەنگی بێ دادە.

- من بزانم لە نێوان قەندیل و بێ داد رازێ، هەیە، شەیتانیش ئاگای لەو سەینوبەینە نیە.

- تەڕەماش هەیە.

- منیش وای بۆ دەچم قەندیل شتێکی لەگەل بێ داد هەبێت، ماقووڵ نیە لە گەڵ ئاسمان رێکەوتنامەی هەبێت لەگەڵ بێ داد هیچ لە گۆڕێ نەبێت.

لە بارەی رادیۆوە مشتومڕێکی گەرم کەوتبووە نێوان سێ لە یارانی ئەشکەفتەوە، من لە هەمووان پتر حەزم چووە تەڕەماشەکە و لە تەڕەماشی داغستانیەوە رادیۆکەی خۆم بیرکەوتەوە، دێتە بیرم منیش رادیۆیەکی گچکەی خنجیلەم هەبوو، بەخشیمە ناسکی چوارساڵە.

ناسك لە یادەوەریمدا تاڵێکی نەپساوەیە، تاڵێکی موگناتیسیە

و کەمەنکێشم دەکات، دەمبات و دەمهێنێت، لە ڕێوبـانی ئێـرە و ئەویێ لە تاریکیدا سـەرەنگریێ دەبـم، لە رووناکیـدا سـەرگەردان دەبـمەوە، دەبیـنم ناسـك وا لەگەشـتی ئەنفـاله و لە رادیـۆکەوە گوێی بۆ سوورەتی ئەنفـال هەڵخسـتووە، پـێش ئەوەی ناسـك بە دایکەوە بچنە گەشتی ئەنفال، بە چەند ساتیێ لە باوەشی من بوو، بۆ چۆڕە ئـاویێ وردە فرمێسـکی دادەبارانـد بەسـەر ڕەقـایی دۆڵە ڕەقەدا، چ دۆڵێکـی دڵـڕەق بـوو ئەو دۆڵە، دڵڕەقتـر لەو وشـانەی ئەنفالیان لە رستەیەکی درێـژ درێـژ رسـت کردبـوو، درێژتـر لەو هەورازانەی جێڕاوگەی ئەنفال بوون، خوداوەند ئەگەر ئەو منداڵە تینووەی دیتبا، دڵنیا بووم زاری کانیەکی لەو دۆڵە دەکردەوە.

مەتارەکەم لە خۆم بەتاڵتر، لەوەتەی مەتارەیە بەتـاڵـی وای بە خۆیەوە نەدیتووە، ناسك چاوی لە سەر مەتارەکەی من بـوو، ئەو مەتارەیەی پڕ پڕ بوو لە بەتاڵی، لەو ساتانە خۆزگەیەکی ئاویم بە بەدیارکەوتنی خولەوە خواسـت، بیسـتبووم ئەگەر مەتـارەی دنیـا بایی دەم تەڕکردنیێ تەڕایی شك نەبەن، مەتارەکەی خولە بیێ ئاو نابیێ، رادیۆکەم بە ملی ناسکەوە کرد، بۆ چەنـد سـاتیێ تینـوویێتی لە بیرکرد، ئەو دۆڵە ڕەقە زۆر دڵرەق بـوو، لەویێ پتـر لەوە دڵنیـا بووم کە خوداوەندیش لە جێگەیەك بۆ جێگەیەکیدی دەگـۆڕیێ، لە هەندیێ جیێ خوداوەند نەرم و نیانە، لە هەندیێ جـیێ رەق رەق لە دۆڵە ڕەقە دڵرەقتر، لەو دۆڵە تەواوێك لەگەڵ خوداوەندی ئـاو لە سـەر ئـاو تێکمـدا، لە سـەر ناسـك تێکمـدا، سـوێندم خـوارد، تامردن لەگەڵی ئاشتنەبمەوە، ئـای زۆر لەبەری پـاڕامەوە، هێنـدە لەبەر شەیتان پارابامایەوە شتێکی بۆم دەکرد، کەچی خوداوەندی ئاو هەر وای دەزانی لەگەڵ ئەویشم نیە، پێمگوت:

تۆ لە بیاباندا، ئەو بیابانەی بە هەزار بەژنیش نـاگەیتە ئـاو، لە

چاوترووکانێکدا کانیەکی بەهاریانە دەتەقێنیتەوە، کەچی لێرە لەو دۆڵە پڕ درەختی مەیلە و تەڕی پڕ لە بەردی قەوزاوی، لە نیو بەژنێك کەمتریش دەگەینە ئاو، ئاوێکی روونی سارد سارد...

خوداوەند نەیکرد، کانیەکی لە دۆڵە رەقە هەڵنەقولاند، خوداوەندی ئاو لە تەڕاییەکی نزیك نەکردینەوە، لێوی ناسك تا دەهات وشکتر دەبوو، ئەگەر خوداوەندی ئاو لەوێ لەبەر خاتری ناسك تەڕاتیەکی خستبایەتە هاوینی دۆڵەوە، من لە چلەی زستانێش هەر لە سەر ئایینی ئاو دەمامەوە، ئێستاش لەو قەندیلە هەر ئاوی دەبووم و هەرگیز لە ئایینی ئاو وەرنەدەگەڕام، دایکی ناسك حەڤدە ساڵێك لە ناسك بە تەمەنتر بوو، کاتێ دیتم سەرەتا وام زانی مەستوورەیە.

بە تینوویتی بە جێمهێشتن، بە تینوویتی لێم بزربوون، لە دوای تۆپەکان، فورسانەکانی سەلاحەدین گەیشتن، لە دوای فورسانەکان سەربازەکانی ئەنفال گەیشتن، پسابنەوە، پەرتبووین، لە بەردەکانی دۆڵە رەقە پەرتتر، ئەوەی هەبوو لە بیرمچوو، ناسك، دایکی ناسك، هەموو هەر هەمووم لە بیرچوو، ئەوەی لە بیرم ما، تەنها و تەنها گیانی خۆم بوو، گیانێك لە ساتە هەترەش چووەکان، تامی شیرینیی هەرچی شیرنایەتی دنیا هەیە بە زیادەوە دەبەخشێ.

هێندەم لەبیرە لە ناو دەستی ترسا گرمۆلە بووبووم، ئەوە ترس بوو هەڵیدام، هەڵدانێ هیچ کێوێ لە گرکان و تۆپ گرتنەوە بەردی وا هەڵنەداوە، پشتاو پشت لە تەنیشت فاتیمە کەوتمەوە، لە بن گابەردێ کەوتینەوە، گابەرد رێك دەکەوتە دەروازەی کونەکۆترەوە، لەو دەروازەیەوە کە بەسەر دۆڵە رەقەدا

دەیڕوانی، ئەو کونەی سەردەمانێ کۆتری دنیا لێیەوە هەڵدەفڕی و لێی دەنیشتنەوە، لەوێ بە زمانی تینوویێتی کەوتینە گێڕانەوەی سەربردەی دەرباز بوون لە دۆڵە ڕەقە، هەینێ دۆڵە ڕەقە دۆڵێ بوو لە دۆڵەکانی ئەنفال، لە هەموو ڕێیەکانی زەوی و ئاسمانەوە، ئەنفال وەك مێروولەی خوا غەزەب لێگرتوو ڕێچکەی فڕینیان ڕووەو ئەوێ بەستبوو.

ئەو وەرزەی ئەو یادەی لێ ڕسکا، لەمێژ بوو پووش پەڕی بوو، هاوینێکی ئابی بوو، ساڵ لە مانگی ئابدا جەنەی گرتبوو، ئابی ئەو ساڵە لە ئابی عەرعەر گەرمتر بوو، گەرم گەرم ڕووباری دەکولاند، پیتەکانی سوورەتی ئەنفال گەشتر گەرمتر لە پشکۆی هەرچی دارستانی داربەڕووی چیا هەیە، دۆڵە ڕەقەی هەینێ ناو جەرگەی بیابان بوو، لەو دەموساتە قارەمان ئەو کەسە بوو، لە ئاقاری دۆڵی بە ئەنفال تەنراو ئەگەر بە هەڵەش بێ ڕێی بە ڕێی هەڵاتن بکەوێ و ساچمەیەکی ئەنفال ساردی نەکاتەوە.

ڕێگەیەکی پان، پانتر لە زیلەکانی ئەنفال، کەوشەنی نیوان دۆڵەڕەقەی ماندوویێتی و دەروازەی حەسانەوە بوو، حەسانەوەی دەم وشك، وشکتر لە ئابی دۆڵە ڕەقە، دیتم بەو چاوانەی خۆم دیتم هەر جاش بوو ڕاوی ژن و منداڵی دەکرد و...

- باشە دەنگی ڕادیۆ ژەنگی گرتووە و خشەخشیشی نایەت، دەنا لاوکەکە ئێمەشی دەبردەوە خیانەت، ئەنگۆ بە من بڵێن لە بەرنامەی گۆرانی داواکراودا بۆچی هەر داوای (کورد خائینۆ) دەکەن؟ دەزانن گیڤاراش ئەو پرسیارەی لێکردم.

+ وەلامی تۆ چی بوو، خۆ نەتگۆت بە هەڵە داوای دەکەن؟

- نا، پرسیارەکەم لە بیری بردەوە.

- ئەگەر ئەو جارە دیتەوە پێبڵێ لە ناو کوردا لە بەرانبەر هەر ماڵە پێشمەرگەیەك یەك گەڕەکی گەورە جاش هەیە، ئا ئەوهای پێبڵێ، بڵێ ئیمامەی پساوە وای گۆت.

داغستانی:

من زۆر رقم لەو لاوکە دەبێتەوە، بە بیستنی ساڵی جاشایەتی خۆمم بیر دەکەویتەوە.

رادیۆ و خایەنۆ و یارانی ئەشکەفت، لە گەڕانەوەم ناپسێنێتەوە، لە گەڕانەوە و گێڕانەوەی ئەوێم ناپسێنێتەوە، بۆ من وێنەی خوێندنەوەی( هەزارو یەك شەوە) وایە، تا تەواوی نەکەم زەحمەتە دەسبەرداری ببم، ناڵێم ئەگەر سوورەتی ئەنفال تۆپی وشەیەك بهاوێژێ و لە بەر دەمم زرمەی بێ، یان مەستوورە بە بەژنی زراف و چاوی خومارەوە بێتە بینایمەوە، من ئێستا بە دیتن و بیستنەوە لە بن گابەردەکەی کونە کۆترم، تەنها بایی هێندە پێوەندیم بە سێ گابەردەکەی قەندیلەوە، بە هاوڕێ پساوەکانم، بە فاتیمەوە ماوە، بتوانم چەند رستەیەکیان لێهەڵگرمەوە، پێوەندیەک ئاڵۆزیم ئاڵۆزتر دەکات.

ئەوەتا من لە رستەکانی ئەوانەوە دەگەمەوە یادەوەرییەکانم یان ئەوان لە بێدەنگیە پڕ هاوارەکانی منەوە سەری قسە دەکەنەوە.

ئەوەتا دەبینم، دوور نیە، لەناو دووربینەکەوە دەستم نەختێ درێژتر بایە دەگەیشتێ، ئا ئا لە بەر چاوە، لە دەو ئەو ڕێگە پانەی منی لە دۆڵە ڕەقە جیا کردۆتەوە، نزیك نزیك، درەختێکی

لک شکاو و چەند بەردێکی پشت قلیشاومان نێوانە، جاشێ لە پشتەوە دایکی ناسکی قۆڵبەست کردووە، سەربازێ کە سەر شانی پڕ لە نەجمەی ئەنفالە یەخەی ژنەی دادڕی، بە دیارکەوت سینگ و مەمکێ، سپی سپی هەموو قەندیل بخەیتە ناو چاوتەوە کلوو بەفرێکی وا سپی نابینیتەوە، ئەوەتا سەربازەکە بە پەنجە ئەنفالیەکانی یاری بە گۆی مەمەکانی دەکات، ژنە خۆی رادەپسکێنێ، بەلاشە، جاشەکە بە هێزە و بەرزەفتیکردووە، ئەها، دایکی ناسك تف لە ئەنفال دەکات، ئەنفال بەبەر زللەی دەدات، زیرو هۆڕ بە پڕی دۆڵی ئەنفال بەرز دەبۆوە و کونەکۆتری دەلەرزاند، دەنگێک بە ترسەوە:

ئەگەر دەتانەوێ بەر چنگی ئەنفال نەکەوین، دەنگ لە تفەنگتانەوە نێت، بزانن مەرگی هەموومان لە یەک تەقەی خۆمانەوەیە.

زیلەکان گەیشتن، گەشتی ئەنفال دەستیپێکرد، لە ژنەکان تەنها دایکی ناسکم ناسیەوە، لە پیاوەکان پیرێکم ناسیەوە، لە مزگەفتی ناو دووکەڵی کیمیاوە، بە دەم دەستنوێژ شووشتنەوە دەیگوت:

قورئان هیچ عەیبی نیە، بەڵام نازانم ئەو سوورەتی ئەنفالە بۆ!

لە منداڵەکان ناسکم بەر چاو نەکەوتەوە، بەڵام رادیۆیەکم بە دەستی سەربازێکەوە دیت، زۆر بە رادیۆکەی ئەو دەچوو.

جاشەکانیش دووانیانم ناسیەوە یەکیان برادەری منداڵیم بوو، ئەویدی سەردەمانێك پێشمەرگەیەکی ئازابوو لە شەڕەکاندا بە پێوە شەڕی دەکرد، ئێستاش ئەوەتە مریشك دەخاتە گونیەوە.

سەربازەکەی گەمانی بە مەمکی دایکی ناسکیش دەکرد، بە هەڵەدا نەچووبم، وێنەکەیم لەو بیرەوەریە دیتەوە کە لە چاوی فاتیمەوە دزیم.

لەوێ، من و فاتیمە بە تەنیشت یەکەوە گرمۆڵە بووبووین و بە چاوی پڕ ترسەوە تەماشای فیلمی ئەنفالمان دەکرد، بە من و فاتیمە سێ فیشەکمان پێمابوو، خۆ ئەگەر سێ حەفتاو پێنجیشم هەبا، تفەنگی من دەنگی لێوە نەدەهات، چۆن خۆم دەخەمە چنگی ئەنفالەوە، بیستبووم گوللە کار لە ئەنفال ناکات، گوللەبەندی پێیە، گوللەبەندێك لە دەسکردی خوداوەند.

فاتیمە وا دیارە رازخوێنە و دەزانێ لە بن بەردی بن بەفرێ هەڵفڕیوم و لە کونەکۆترێ نیشتوومەتەوە، دەڵێ:

+ ئەرێ تۆش رادیۆیەکت هەبوو...

- دامە ناسك.

+ ناسك کێیە؟

- کچی ئەو ژنەی سەربازەکەی ئەنفال گەمەی بە مەمکەکانی دەکرد، لە بیرتچوو لەوێوە پێکەوە تەماشامان دەکرد!

+ ئاخر لەوێ مەمکی چەندان ژن لە ناو دەستی سەربازان بوو.

ئەها! من تەنها رووتیی دایکی ناسکم دیت، سینە و مەمکی ئەو ژنە چاوی منی لە دیتنی ژنە رووتکراوەکانیدی کرد، هیچیانم بە رووتی نەدیت.

بە پانی و درێژیی تەمەنی پڕ لە هەڵاتنم، تەنێ دوو جار

ژنم بە رووتی دیوە، ژنەکەی ناو رەشماڵی خێلان، ئەو خێلانەی لە زارگەلی هەڵیان دابوو، ئەو دەمانێ زارگەلی نەکەوتبووە سەر زاران، حەفتاو حەفت رۆژە رێ لە ئەنفال دوور بوو، زارگەلی ئەوسا بە زاری ئەوین دەئاخافت، جگە لە زمانی ئەوین چ زمانی نەدەزانی، رەشماڵنشینان سادە بوون سادە، چ لە گەرمیانێ چ لە کوێستانێ هەر لە باوەشی سرووشت دەژیان و بۆ هەناسەیەکیش لێی نەدەبوونەوە، ژیانێك بۆ ئەزموونیش تاکە گرێیەکی ناسرووشتی تێنەکەوتبوو، لەگەڵ دەنکە پساوەیەک شێخی عەنکاوەیان دەگوتێ، رێمان کەوتە ئەوێ، رەشماڵ لە ژنان رەشدەچۆوە، ژنی گەلەك جوان و ناسکم دیتن، ناسك ناسك دەتگوت لاسکە رێواسن، سێ چوار پیاوی بە ساڵداچوو بەر چاو کەوتن، ئەوانیدی بە هاوارەوە رۆیشتبوون، هاواری ئەو خزمانەی لە گەرمیانێ ئەنفال رێی پێگرتبوون و رێیان نەدەدا بە کوێستانێ بکەونەوە، رەشماڵنشینان لە بارەی ئەنفالەوە پرسیارکوتیان کردین، هەرچیمان دەگۆت تێنەدەگەیشتن، ژنێك گۆتی:

بە خودای ئەنگۆش هەر هێندەی مە لە بارەی ئەو ئەنفالەوە دەزانن هەر لەبەر هەندێیە ناتوانن ئەو شتە لە مە بگەیەنن.

وازیان لە پرسیاران هێنا، کاتێ زانیان ئێمە لەبەر شتەك هەڵاتووین ناوی ئەنفالە و خزمەکانیشیان بە دەست ئەو شتەوە گیرۆدە بوونە، پتر خۆشیانویستین، شەش شەو و رۆژ لە ناو رەشماڵان، دەنووستین هەڵدەستاین دەسووڕاینەوە، بە ژمار بیست و یەك رەشماڵ، بۆ مە کراوە و لە سەر پشت بوون، بێ داواکردن هەرچی هەبوو لە پێشیان دادەنایین، رەشماڵەکان ئاشنایەتیەکی گەلەك ناسکیان لەگەڵ خودا هەبوو، بەڵام چەندێ

پرسیارم لێکردن، چەندێ گوێم بۆ شلکردن و بە چاوی ناسینەوە روانیمە هەڵسوکەوتیان، پەیامبەری وانم نەناسییەوە، خودای وان دڵی لە رەشماڵەکان کراوەتربوو، نە لە خودای من دەچوو نە لە خودای شێخی عەنکاوە، لە خودای کەس نەدەچوو، وێنەی منداڵان پێدەکەنی، مینا ژنانی زارگەلی لەنجەی دەکرد، لە کتێبی هیچ پەیامبەرێ خودای لەو تەرزەم نەدیبوو، ئەوان ئاینەکیان هەبوو بە خۆشیان هیچیان لە بارەیەوە نەدەزانی.

جاروبار بە تیچاو، لە بنەوە تەماشای ژنانی رەشماڵنشینم دەکرد، ئەوان قاقا پێدەکەنین، پێکەنینێ نە (ئا)ی تێدا دەتریقایەوە نە (نا)، لە بەینی خۆمان دەمانگۆت هەبێ نەبێ ئەوانە لە تیرەی شێتانن، بەڵام هیچ نیشانەیەکی شێتی لەواندا نەدەبینرا، شەوی حەفتەم بوو، شێخ گۆتی:

+ گرتی! ئەوشۆ بە خۆیان بانگماندەکەن، زۆر جوانیشن.

- قسەی نابەجێ! فشەیان پێکردوویت.

+ دەبینی، ئەوەی لە تەمەنت نەتدیتووە ئەوشۆ لە بەر ئەو مانگەشەوە بە چاوی خۆت دەیبینی.

- ئاخر چۆنت رازیت کردن؟

+واز لەوە بهێنە، ئەوشۆ دوو ژن دێنە بن ئەو رەشماڵە، کاری خۆت بکە و تەواو، هیچ پرسیارم لێ مەکە، من سەرخەوێ دەشکێنم، تۆش بخەوە، درەنگ دێن.

لە سەر جێی باوەڕهێنان و نەهێنان گینگلم دەدا، ئەوشۆ لە کنە من شەوی خەوتن نەبوو، سەیرم دەهات ئەو لە پرخەپرخی خەوێ بوو، تو بڵێی جگە لەو کورە کەس هەبێت لە

چــاوەڕوانیەکی وادا خەوی لێکەوێــت! ئەوە پتــر دەیخســتمە گومانەوە، دەمویست لە خەوی بـکەم و پێـی بڵـێم بـۆچی درۆی وام لەگەڵ دەکەیت! نا، حەفت ساڵ دەبێت پێکەوەین درۆیەکـم لێی نەدیتووە، لە ڕۆژی درۆشدا درۆیەکـی بە زاریـدا نەهـاتووە، زمـانی بە درۆی سـپیش نەگەڕاوە، تەنهـا یەك درۆی هەبـوو کە لێی نەدەبـۆوە، ئەویـش نـاوەکەی، ئەو درۆیەش خـۆی گـوتەنی وەك لەمـپەرێ وایە، رێ نـادا بیـرۆکەی هـیچ درۆیەك بپەڕێـتە سـەریەوە، ترسـام لەوەی هەر بـۆ تـاقیکردنەوە خـۆی هاوێشـتبێتە قەرەی درۆوە و بۆ بەدبەختی لە ناو هەموو شەوەکانی تەمەن ئەم شەوی بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە هەڵبژاردبێ.

هەیوەشــەوی ئەو شــەوە، نەبــووە و نــابێتەوە، روون روون، روونتر لە چاوی کچە کۆچەریان، روونتر لەو کانیانەی بزنەرێش بـۆی نـاچێتەوە، مانـگ هەرچـی تـریفەی خـۆی هەیە تـاڵ تـاڵ دەیبەخشیە رەشماڵان، ئەو شەوە چراخانێ بوو هـات و رۆیشـت، نـابینرێتەوە، تـالە قـژت لە سـەر عەردی دەدیـتەوە، ئەوە جـاری یەکەم بـوو مانـگ هێنـدە لە زەوی نزیـك بێـتەوە، دەتگـوت لە ئاسـمانێ زیــز بــووە و لە نــاو رەشــماڵان نیشــتۆتەوە، بە خــۆم نەوەستام، شێتانە گازمکرد:

+ ها چ بووە؟

- هەستە هاتن.

+ هاتن! باشە.

- تەڕەماشە، هاتنی چی!

+ چ وەختە؟

تەماشای کاتژمێرەکەی کرد.

+ هێشتا ماویەتی. خەمت نەبێ، زووە، دێن.

-کەنگێ؟!

+ گوتم دێن یانی دێن، هەرێیان داوە، ئەوانە لە سەریان بدەی، درۆیێ لە زاریان دەرنایێ، گاڵتەش بە کەس ناکەن.

بە دەستی داغستانی هاتمەوە ناو یارانی ئەشکەفت، جغارەیەکی دامێ و کەوتە گێڕانەوەی سەربردان، بەڵام من بە ناو دووکەڵی جگارەکەی خۆیەوە، خۆم گەیاندەوە ناو رشماڵان.

شێخ چۆوە خەوێ، لە قسەکانیەوە، دڵۆپ دڵۆپ دڵنیایی رژایە گیانمەوە و فێنکبوومەوە، بەڵام جاروبار هەستم بە گەرمایی سکلی گومان دەکرد، دیاربوو دڵۆپەکانی دڵنیایی بە تەواوی گومانیان نەکوژاندبۆوە، بە پەنجە لە سەردانان نازانم کات چ کات بوو، هێندە دەزانم شەو درەنگ بوو، ئا درەنگ بوو ئێستگە لە دوای ئێستگە شەو شادیان دەکرد و لە رادیۆکەی ئەوەوە دوا گۆرانی کە تایبەت بۆ منی گوت گۆرانیی: ( لە ناو رەشماڵی خێلان ) بوو.

رەشماڵی چاوەڕوانی بە سەر هەڵدێرا دەیڕوانی، هەڵدێرێ مەگەر لە مندا هەڵدێرێکی وەها هەڵچنرابێ، رەشماڵەکان هێندە لێکدی دوور نەبوون، لە نێوان رەشماڵێ و رەشماڵێ چەند گابەردێ لە بەر تریفەی مانگدا بێ خەم بێ چاوەڕوانی خەوتبوون، گوێم لە خشپەی پێ بوو، خشپەی پڕ چێژ، بەڵام چێژێکی لێوان لێو لە ترس، سەرڕێژ لە شەرم، ترسام لە ژن ترسام، لە تامێ ترسام، هەرگیز نەمکردووە، لە بۆنێ ترسام

ئاشــنایەتیم لەگەڵــی نــیە، بە شــەرم تەنــرام، شــەرم لە دیمەنــێ، نایەتەوەبیرم وێنەکەیشم دیتبێت، دنیایەك کتێبم لە بارەی گیـان و جەستەی ژن خوێندۆتەوە، بەڵام پێناچێ هیچیـان دەروەسـتی ئەو ترس و شەرمەی من بێن، نـا کتێبەکـان ناپاکیـان لـێم کـرد، لەو هەموو کتێبە دێـرێکم بیرنـاکەوێتەوە فریـامکەوێ، کتێـب درۆی لەگەڵــم کــرد، بە قەد دەستگوشــینێ، ژنــی پــێ ئاشــنا نەکــردم، کتێبەکان لە من ترسنۆکترن، نەهاتن ترسی ژنـم لـێ بـڕەوێننەوە، کتێبەکان وەکو من پتریش شەرمنن، جگە لە شـەرم شـەرمکردن لە ژن چیـدیان فێـر نەکـردم، ئەوەتـا لە نـاو روونـاکیی مانگـدا ســـەری خـــۆم داخســـتووە و دەلەرزم، لە هـــاتنی ژن دەلەرزم، خشپەی پێ پێبەپێ نزیکتر دەهـاتە گـوێ، ئـا هەون، ژن بە سـەر لمیشدا پێ باوێ، دەنگی پێی دەناسمەوە، دەیانناسمەوە لە بـارەی هەنـدێ شـتی ژنەوە شـت دەزانـم، بەڵام لە بـارەی لەشـی ژنەوە کۆڵەوارم و هەرەی لە برەی دەرناکەم، تا ئێستا بۆ گاڵتەش لێـوم بە لێوی ژن نەکەوتووە، ماچ! ئا، بیرمکەوتەوە گچکە بـووم زۆر گچکە، کچێ گۆتی:

دەزانی ماچم بکەیت؟

یوختە مـاچمکرد، لە بەدبەختیمـان بـراکەی دیتـی، هەڵاتـم، کەوتە دووم، نەگیـرام، لەبیـرمە لە هەڵاتنـێ تـامی مـاچەکم لـێ بەربۆوە، ئێستاو ئێستا نەمدیتەوە.

مەمك! نا نا هەر هێندەی لێ دەزانم لە سەر سـینگی ژنـان و لە بن کراسـێ دوو شـتی خـڕی بڵنـد هەن ناویـان مەمـکە، نە بە رووتـی نە لە سەرکراسـەوە دەسـتم پێیـان نەکەوتـووە و هەمیشـە خۆزگەم بەو گۆرانیە خواستیە کە دەڵێ:

پەنجەم سەرگەرمی لیمۆ گوشینە.

نــاو رانــی ژن، لە کــنە مــن داخراوتــرین دوورگەیە لە خەونیشـدا بە تەواوی رێـم پێینەکەوتـووە، تەلیسـمێکە لە تەمەنـی باخۆشـیەوە شـەو و رۆژ بیـری لێـدەکەمەوە، هـیچ کتێبێـك ئەو تەلیسمەی بۆ نەشکاندووم، مـن لە بـێ شـەرمیی ئەو پیـاوانە تـك تك ئارەقە دەکەم کە زاخ دەکەن خۆ باوێنە ناو رانی ژنەوە.

گەیشـتنە بـن رەشـماڵ، نـاوێرم سـەر بەرزبـکەمەوە، لە سـەر ئەوەم نزا بخوێنم، نزای لە ژن دوورکەوتنەوە.

**هات کورپنە هات...**

سەردەسـتەی مراویـان بە دەنگــێ هــاواریکرد بەردیشــی بە ئاگادێنــا، هەمووـمــان هەســتاینەوە و بە ئاراســتەی دەســتی درێژکراوەی ئەودا چاومان هەڵخست، دیتمان رەشـاییەك کە هەر هێندەی گلۆڵە بەنێ دیارە، بەرەو لامان دێ، ناوە نـاوە لە بەفـردا بــزر دەبێــت و دیــار دەکەوێــتەوە، بە دووربــین رۆنیمــانێ، یەك گوتی:

- بزنە

- نا هێسترە.

- ئەمن دەڵێم گورگە.

- نا مرۆڤە.

پاش کەمێك لە هەموو چاوەکاندا بووە مرۆڤ.

- ژنە.

- نا پیاوە.

من گۆتم:

+ ژنە.

- چۆن دەزانی؟

+ رۆیشتنی ژن دەناسمەوە.

- قسەیتی ژنە و ئەگەر ئەمن سەردەستەی مراویان بم، دەشیناسمەوە.

- هێشتا دیار نیە ژنە یان پیاو، بەچی دەیناسییەوە!

- ئەمن دەڵێم ئایشەگوڵە، ئەگەر هەو نەبوو، ئەو گوێیەی خۆم دەبڕم، هەوە کاکە، کۆڵەکی گەلەك گەورەشی بە پشتێوەیە، وامن دەچم لێی وەردەگرم.

سەردەستەی مراویان غاریدا، لە ناو بەفرێ تۆزی دەکرد، من و فاتیمەش بەرەو پیری رۆیشتین، هەو بوو، ئایشەگوڵ بوو، یەك یەك بە ناوەوە هەمووманی ناسیەوە، دوو بەرانپیلی پڕاو پڕ نانی پێبوو، ئایشەگوڵ شەکرو چای هێنا، ئایشەگوڵ خوێ و سەلکە پیازی هێنا، ئایشەگوڵ قەسپ و پەنیری هێنا، کاکڵە گوێزی هێنا، تاخم تراش و نینۆکبڕ و نەینۆك و مووکێشی هێنا.

ئایشەگوڵ ژنێکی بە تەمەنداچووە، بەڵام روومەتە سوور و سپییەکانی لە کاتی لاویدا چۆن بوون هەر ئاوا ماونەتەوە و جێ پەنجەی تەمەنیان وێ نەکەوتووە، لە ئێمە شپرزەتر، دەتگوت درەختە زریان هەڵیگرتووە، ئێمە لە ئایشەگوڵ تاساوتر هیچ تاساوێك نەبوو لە مە تاساوتر، بەڵام لە هونەری بە

سەرخۆنەهێنان و جێکردنەوەی شپرزەیی لە شاراوەییدا، ئایشەگوڵ گرەوی لە هەموو کەسێك بردبۆوە، بە دیار بەفر و ئاگرەوە، بابۆڵەی پڕ قەسپمان لوولدەدا، ئایشەگوڵیش دەتگوت میلی کاتژمێرە بە دەورماندا دەسووڕایەوە و بە دەنگی دایکانە:

دەی بخۆن کوڕەکانم نان بخۆن، بخۆ کچە تاقانەکەم بخۆ.

لە تاساویدا تێر نان و قەسپ بووین، هەر بە تاساوی سەرو بنە مەتارەیەك چاشمان لە سەر کرد، ئایشەگوڵ هەر دەسووڕایەوە، جگەرەی دووەمیشم داگیرساند، هەر دەسووڕایەوە.

پێمانبڵێ چۆن گەیشتییە ئێرە! چۆن زانیت لێرەین؟

ئەوە جاری یەکەمە داغستانی ببینم، بەو تامەزرۆییەوە پرسیار بکات و بۆ رژانی چۆڕە وەڵامێ گیانی خۆی واڵا بکات، ئایشەگوڵ لە سووڕانەوە کەوت، کەوتنێ پشت لە ئێمە و روو لە چۆلەوانی، ئەوە جاری یەکەمیشە لە تەمەنی پڕ لە میهرەبانیی ئەو ژنەدا پشت لە کوڕەکانی بکات و بە دەنگێ کە کەمێ بە لای توورەییدا دەشکێتەوە:

کەس پرسیارم لێنەکات، وەڵامی کەس کەس نادەمەوە، کوڕە جوانەکانم ئیدی پرسیارم لێمەکەن.

بە تاساوی سەیری یەکترمان کرد و لە چاوی هەر یەکەمان درەختێ لە پرسیار روا، هەر هێندەم پێکرا بە هەر دە پەنجە چاوەکان هەڵپشێوم، دەمویست بزانم ئەوە خەوە، زیندە خەوە! هاتنی ئایشەگوڵ لە پەرجوو دەچوو، بە دوو بەرانپیلی گەورەی پڕ خواردنەوە چی گەیاندیە ئێرە! گریمان بە هەر فێڵێك بوو

خۆی لە چاوی ئەنفال شاردەوە، ئەدی چۆن لە زریانی قەندیل دەرچووا رەنگبێ ئەوەش بۆ ئایشەگوڵ ئەستەم نەبێ، ئەدی چۆن رێی بە رێی ئێمە کەوتەوە! دەزانم شونهەڵگرترین ژنی دنیاییێیە، بەڵام ئەو رێیەی بنی لە لای ئێمەیە و سەری لە لای ئەو بوو، لە نێوانماندا بەفر حەفتا جار گۆڕیتی و نوێی کردۆتەوە، نە خواوەند نە شەیتان شوێنپێی مە نابیننەوە.

- دایە گیان چ بووە بۆ پرسیار نەکەین؟!

+ ئەوەش هەر پرسیارە، لۆوەی خوێنتان لە کنە من تاڵ نەبێت، پرسیاری هیچم لێ مەکەن، بەلاشە بە گۆڕی هەردوو کوڕەکەم وەلامی چ پرسیارەك نادەمەوە، ئەو دوو کوڕە جوانەمەرگەم لە گۆڕێ هەستنەوە و پرسیارم لێ بکەن، هەر پرسیارەك، وەڵامیان نادەمەوە، ئەنگۆش کوڕی منن، ئەو کچە چاو رەشەش تاقانە کچی منە، بە خۆتان دەزانن هەموو پێشمەرگەك کوڕو کچی منن، نا پرسیار مەکەن وەڵام نادەمەوە.

- کوڕەکەی دیکەشت؟!

+گۆتم پرسیار مەکەن.

دەستی بە گریان کرد:

بە سە، پرسیار بەسە.

فاتیمە چوو دەستی لە ملی کرد و فرمێسکەکانی بۆ دەسڕیەوە، هەموومان دەورمان دا، لە ئاگرەکەمان نزیك کردەوە، بە بێ دەنگی تێڕامایین، لەگەڵ وی هۆن هۆن فرمێسکمان رشت.

تۆ بەس مەگریێ، مەرج بێ هیچ پرسیارەکەت لێ نەکەین.

فرمێسکی گەشی سەر گۆنا ئاڵەکانی، دڵۆپ دڵۆپ دڵۆپی گومان بوون دەڕژانە گیانمانەوە، گومان لە خودی ئایشەگوڵ، ئەو ئایشەگوڵەی من دەمناسی، نابێت ئەو ئایشەگوڵە بێت، بەو دەچێت و پێناچێت نیە هەو بێت، من ئایشەگوڵێکم دەناسی، لەو دنیایە کەس کەس نە ژن نە پیاو هێندەی وی سەرڕێژ نەبوون لە ئارامی، نا هەو نیە، ئەگەر هەوە، کەسکایی ئەو هەموو ئارامیە، بە چ بایەکی ناوەختە هەڵوەری! چ پێیەك ئەو هەموو گەڵا سەوزەی کردە پێخوست! ئەو ئایشەگوڵەی من دەیناسم هەرگیز پشتی لە کوڕەکانی نەکردووە، نەمدیتووە و نەمبیستووە لە پرسیاری کوڕەکانی تووڕە بێ و وەڵامیان نەداتەوە، ئەوە کەی ئەو ژنەیە کە بە مەنجەڵێ یاپراخەوە بە پێی با بە چیادا هەڵدەگەڕا و بە دیوی جەنگاوەراندا بە پێی ئاو شۆڕ دەبۆوە، بە پێکەنینی فریشتەیی یاپراخی قلپی سەر سینییەك دەکردەوە و ئێمەش وەك هەتیوەکانی خوا دەڕژاینە سەر سینیەوە، لە ئێمەوە خواردن و لەویشەوە گێڕانەوەی قسەی خۆش، لە بیرمە تامی یاپراخ و تامی قسەکانی لە خۆشیدا پێشبڕکێیان دەکرد، من زووتر ژنێکم دەناسی، ژنێکم ناسیبوو، هەمیشە بەرکی کەواکەی پڕ پڕ بوو لە پارچە کاغەزی پێچراو، پارچە کاغەزەکان لە تریاك پتر سەرمەستیان دەپژاند، ئایشەگوڵ بە بەرکی پڕ مەستیەوە، پڕ مەترسیەوە شاخە و شاخ، شاخە و شار، شارە و شاخ، شارە و شار، دەهات و دەچوو، لە هاتندا ئارام لە چووندا ئارامتر، کەس نەیدیتووە و نەیبیستووە جارێ لە جاران لە بازگەیەکی ئەنفالیشدا، تۆزە شپرزەییەك بنیشێتە سیمایەوە، ئەو ژنە بالا بەرزە سوورو سپیە چاو خومارە بەتەمەنەی وا بە دیار بەفرو ئاگرەوە ریز ریز رۆندکان دەبارێنێ، رۆندکێ گڕ لە بەفر بەردەدا و ئاگر لە گڕ دەخات، تەنێ لە سیمادا ژنەکەی ئەو دەمانییە، ژنەکەی

ئەودەمانێ هەوری ناوادەی هیچ کۆستێ چاوە گەشەکانی تەڕ نەدەکرد، رەشەبای هیچ وەیشوومەیەك قوڵپێکی گریانی پێ نەداوە، من گوێم لێبوو کاتێ هەواڵی مەرگی کوڕە گچکەلانەکەیان دایێ، دیتم ئەو دەمانەی گۆڕێکی لاتەریکیان نیشانداو پێیان گۆت:

ئەوەتا...

لەو ساتانە تیچاوێکم لە سەری بوو، نە گوێم لە دەنگی گریانی بوو، نە لە سەر گۆناکانی ریزە فرمێسکم دیت، لەوێ ئەوەی گوێم لێبوو، سەردوولکەیێ بوو لە سەر ریتمی گۆرانیی جەنگاوەر، درەنگتر بووە گۆرانی:

**هەر کەسانەکی کوڕە سووکەڵانەکەی من نەدیتیە و ناناسی**

**ئەوەتانێ کلاشینکۆفەکی لە شانیە**

**لە سەر شانی فیشەکەك دیارە و**

**حەفت فیشەکدانی پڕیشی بەستیە..**

**ئەوەتانێ**

**کوڕە سووکەڵانەکەی من سواری پشتی هەور بووە و**

**جلەوی رەشەبا و زریانی لە دەستیە**

**وەیلێ وەیلێ... کوڕی دایەی وەیلێ**

**هەر کەسانەکی کوڕی من ناناستەوە**

**ئەوەتانێ لە بن هەر بەردەکی لە تەنیشت هەر گوڵەکی**

**دانیشتیە، راوەستایە، لە دوورەوە دیارە**

له ناو زستانی کەسك دەچێتەوە، کوڕی من بەهارە

بناسنەوە کوڕی من بناسنەوە

له ناو هەموو شەڕەکی گەورە کوڕی من بەشدارە

گەلی خەلکینە ئەنگۆ بزانن خەمێ من لەوەی نیە

کوڕە گچەکەلانەکەم لە ناو ئەو گۆڕە نووستیە و

چیدی بە دەنگی ناسکی بانگمناکا دایە

ئەمن حەیفم لەوەی دێ

گوللەی دیلەکی گەلەك نامەرد

له دڵی کوڕی من دایە.

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٠

چەندێ سەر دەهێنم و سەر دەبەم، ئایشەگوڵی دەرەوەی ئاقاری قەندیل و ئەو ئایشەگوڵە قەندیلیە لە ژنێکدا تێکناکەنەوە، دوو ژنی تەواو پێکدی نائاشنا، دوو ئایشەن رەنگە هەرگیز نە لە کۆڵانێ نە لە زیندانێ بە تەنیشت یەکەوە دانەنیشتبن و هەرگیز دڵی خۆیان بۆ یەکدی نەکردبێتەوە، دوو گوڵن هەر یەکەیان لە وەرزێکدا پشکوتنە، لە بۆندا ئاشنای یەکدی نابنەوە، ئایشەگوڵ گریانێ دەگرێ، قەندیل لە هەموو قەندیلایەتی خۆی گوێی لە گریانی وا بە کوڵ نەبووە، بڕواننە فرمێسکە بارانیەکانی، بە سەر بەفردا جۆگەلەیان بەستووە، دەڵێی فرمێسکی ژنانی دنیا لە چاوی ویەوە دەڕژێ، ئەو گوڵەی من دەمناسی، تەنها لەو ساتانەی پێکەنین دەیگرت و بەرینەدەدا، جاروبار کەمێك تەڕایی دەکەوتە چاوەکانیەوە، گوڵی قەندیل تەڕ تەڕ، تەڕایی چاوەکانی هەموومانی تەڕکرد، قەندیلی لە تەڕایی چاوەکانی هەڵکێشا، تەڕاییەك بە هیچ ئاگرێ وشکنابێتەوە.

دەمێوو دڵم پڕ گریان بوو، دەمێوو لێواولێو بووم لە ئەسرین، بە دوای پەنجەی بەهانەیەکدا دەگەڕام، بێت و بمشکێنێ، بێت و جۆگەیەکی بەردانم لێبکاتەوە، ئایشەگوڵی هەمیشە فریادرەس، گەیشتێ و وەك بەفری سەر ئاگر تواندمیەوە و بە کردنەوەی جۆگەی رژان، چاوەکانمی لە شەرم و بێ

بەهانەیی ئازادکرد، هەرچی ئەسرینی تەمەن هەیە بێ پسانەوە چۆڕاوگەیان بە ستووە و بوار بە پەڕینەوەی هەنجەتێ نادەن، ئەو ڕۆندکانەی دەبوو زووتر بڕژێن، دەبوو لەو جێگایانە بڕژێن کە تینووی تەڕایی بوون، تەڕایی ڕۆندك، دەبوو بە پساوەیی بڕژێن، دەبوو بەسەر بەردا بڕژێن، بەسەر گوڵدا بڕژێن، بە سەر ئاور و ئاگر و خۆڵ و بادا بڕژێن، دەبوو لە بەر باران و بن ڕەشماڵ و بە دیار گۆڕ و شاییەوە بڕژێن، دەبووایە چاوی من لە هەموو ئەو ساتانە فرمێسکی بڕژاندایە کە زادەی فرمێسك بوون، ئێستا ڕۆژی تۆڵەکردنەوەیە، تۆڵەکردنەوە لە هەموو ئەو ساتانەی بێ ئەوەی دڵۆپێ فرمێسکیان بەربکەوێ و بێ ئەوەی باڵیان لە تەڕاییەکی چاو بخشێ، بە سانایی تێپەڕین و لە دەستچوون، ئێستا ساتەوەختی تۆڵەکردنەوەیە لە تەمەنێ کە بە وشکی و دوور لە تەڕایی چاو تەمەنی کرد و بە هەدەر چوو، بە هەدەر چوونە تەمەنی بێ فرمێسك، ئەوە لە قەندیلەوە فێر بووم، لە گوڵی قەندیلیەوە فێر بووم، چ چێژێکی خوداوەدنیە چێژی گریان، گریانێ نەزانی لە کوێوە دێ، گریانێ نەزانی لە چ واتایەکەوە دەڕژێ و دەڕژێتە چ واتایەکەوە.

من نها ژیان لە تەڕایی چاوەوە تامدەکەم، تامێ ئاهورامەزداش تامی وای نەکردووە، چ حالگرتنێکە حالی گریان، زەردەشتیش بە دەوری ئاگرا ئەو حاڵەی نەگرتووە، ئایشەگوڵ لە گریاندا شێخی تەریقەتێکە، بە ڕێگەی هیچ ئایینێ ناگاتەوە، بڕوانە موریدانی گریان، چ حەلقە بە ستنێکە بە دەوری ئایشەگوڵی شێخ، جەنگاوەران لە چ زیکرێکی فرمێسکدان، ئەوەتا بەفر لە واتادا سپیۆوە، سپێتیەك بۆ خاتری هەوریش لە سپێتیی بەفر ناکاتەوە، ئەوەتا ئاگر لە واتادا زەرد

زەرد هەڵگەڕا، زەردییەك بۆ دڵنەشكاندنی زەردەشتیش، خزمی ئاگر نابێتەوە، واتا كلوو كلوو لە گریاندا دەتوێتەوە، واتا بلێسە بلێسە لە گریاندا دەكوژێتەوە، ئەی خوداوەندی فرمێسك، ماندوویتی لە هێزی گریان بسێنەوە، تا لە تواناتدا هەیە هێزی گریان، پترو پتر هێزی گریان، ئەو تەمەنە وشكە بیابانێكە گیانی بۆ دەریایەك فرمێسك كردۆتەوە، خوداوەندی هەمیشە تەڕ، لە بەر خاتری ئەو ژنە ژنانە رەفتار بكە و لە فرمێسك وشكمان مەكەوە، با هەمیشە تەڕ بین.

من دەبێت بڕۆم، بە جێتان دێڵم، كەسیش پرسیار نەكات بۆ؟

ئایشەگوڵ بە چاو سڕینەوە، وشە رۆیشتنیەكانی لە لێو بەردەبۆوە، ئەو وشانە نەبان، بەری فرمێسك بە ئاهورامەزداش نەدەگیرا و چاوەكان تا رۆژی پەسڵان فرمێسكیان دادەباراند، چاوەكان یەك لە دوای یەك لە ریزی وشكبوونەوە وەستان، وا بزانم چاوەكانی من دوا چاو بوون، دەسبەرداری دوا دڵۆپی تەڕایی بن، چاوەكان سوور سوور هەڵگەڕابوون لە روومەتەكانی ئایشەگوڵیش سوورتر، لە سوورایی چاوەكانەوە تەنها و تەنها پرسیار دەبینرا، پرسیاری ترسناك، ترسناكتر لە ترسناكیی قەندیل، بەڵام ئایشەگوڵ ئامادەنەبوو سەیری چاوەكان بكات.

+ من دەڕۆم، كچە جوانەكەم من دەڕۆم، كوڕەكانم من دەڕۆم، خەمتان نەبێت رێنادەم برسی بن، بە رێی ئاگریشدا بێت، دێم و نانتان دەگەیەنمێ، بەس ئێوە قەندیل چۆڵنەكەن، بە جێیمەهێڵن و ناپاكی لێ مەكەن، ئەنگۆ بە قەندیلەوە مرۆڤن، بە قەندیلەوە جوانن، بە قەندیلەوە كوڕ و كچی منن، بە جێیبێڵن حاشاتان لێدەكەم، وەك چۆن حاشام لە وانیدی كرد، خۆتان

دەزانن، دەربچن وەکی خۆتان نامێننەوە، دەبنە شتەکیدی، جەنگاوەر بە قەندیلەوە جەنگاوەرە، پیرۆزە، پێی لە ئاقاری قەندیل ببەنە دەرێ، ئەو ناوەتان نامێنێ، لە پیرۆزی دادەشۆرێن، ئا، بە دەستی خۆم لەو ناوە رووتاندەکەمەوە، بە دەستی خۆم بە چڵکاو دەتانشۆم و ناهێڵم پشکەك پیرۆزی لە گیانتان بمێنێ.

- نامانەوێ لێرە بمێنینەوە، بێزاربووین، دەمرین، دایە جوانەکەمان، ڕێی دەرچوونمان پیشانبدە، پێویستمان بە تۆیە، دە پێمانبڵێ تۆ چۆن گەیشتییە ئێرە، چۆن دەڕۆیتەوە، دەچیەوە کوێ؟ پرسیارمان زۆرە گوڵی هەموومان، بەزەییت پێماندا بێتەوە.

- پرسیار مەکە کوڕە بالا بەرزە چاو و برۆ ڕەشەکەم، لە پرسیاران بێزاربووم، وەڵامی کەس کەس نادەمەوە، ئەمن دەڕۆم، ئەنگۆ دەبێت لێرە بن، بە پیرۆزی بمێننەوە، دنیا هەمووی بووە جاش، کوڕەکانم ئەنگۆ مەبنە جاش، دنیا هەمووی بووە بازرگان، ئەنگۆ مەبنێ، بۆ خواتان پێدەڵێم لێرە بمێننەوە، ئەنگۆ ناسراون وەکوو من نین، وەکوو ئەوانیدی نین، ئەنگۆ هەر هێندە نین، زۆرن، قەندیل ورد بگەڕێن، بیانبیننەوە، ئەمن کاتم نیە دەنا دەیانبینمەوە، درەنگمە دەبێت زوو بگەمەوە شار و پێیانبڵێم قەندیل چۆڵەوانی نیە، ئاوەدانە وەك جاران ئاوەدانە، پێیاندەڵێم کچ و کوڕەکانم سەنگەریان گرتووە و چۆلیناکەن، ببڕایبڕ چۆلیناکەن، کاتێ ئەو هەواڵەیان بدەمێ، ئەو خەڵکە خەنی دەبن، لە خۆشیا شایی دەکەن، بە جاشەکانیش دەڵێم:

کوڕ و کچەکانم بەفرن بە قەندیلەوە، وەرزەکان دێن و دەڕۆن، ئەوان هەر بە قەندیلەوەن و لێی نابنەوە، ئا بە جاشە ڕوورەشەکان دەڵێم:

ئەنگۆ بە روورەشی دێن و دەڕۆن، کوڕەکانم، کچەکانم بە رووسپێتی لە بەرزایی قەندیل دەمێننەوە و تا دنیا دنیایە ناتوێنەوە.

دەبێت زوو بڕۆم نامەیەکی کراوە بۆئەنفال دەنووسم، بە دارو دیوارا هەڵیدەواسم، پێیدەڵێم بە ئەنفال دەڵێم قەندیلیەکان هەمیشە لە شەڕی تۆن، هەتا نەتتۆپێنن، دەست لە شەڕ هەڵناگرن، راستەو راست دەڵێمە ئەنفال تۆ هەرگیز دەستت ناگاتە کچ و کوڕە قەندلیەکان، تۆ ئەگەر خۆت بکەیتە (با)ش کچ و کوڕەکانی من نابینیەوە، لێمگەڕێن پرسیار مەکەن، هەندێك قسەم ماوە بیکەم، هەر پرسیارێ بکەن، هیچ قسەیدی ناکەم دەڕۆم، ئەنگۆ ئەگەر بێنەوە...

- ئێمە نایەینەوە نا، بەڵام شوێنەکیدیمان پیشانبدە.

+ ئەمن ماڵاوا، لە قسەی من دەردەچن.

- باشە تەواو، دەممان داخست، قسەکانت تەواوبکە.

+ باشبوو لە بیرم نەچوو، ئەها لەو چاڵاییە کۆلکەدار زۆرن، ساڵێك بەشی ساڵێك ئاگرکردنەوە، کۆلکە دارمان لە بنی دنیایێ هێنا و لێرە شاردەوە، بگەڕێن دەیبیننەوە، بێجگە لە دار شتی دیکەشی لێیە، بەڵام لە بیرمنیە چ بوون، نازانم تێکچوونە یان نا، بە سەری هەمووتان ئەوە دوا جارە هەر پرسیارەکم لێبکەن، یان قسەم پێببڕن، دەڕۆم و گوێتان لە دەنگی من نابێتەوە، ئەنگۆ لێرە بن و مێنەوە، ئەگەر بێنەوە، دەبێت وەکی حیزان لە ماڵێ دانیشن، یان ببنە جاش، بێنەوە، خوێڕێتان دەکەن، دەبێت لە رێی قاحپەخانەی موسلێ تەمەن ببەنە سەر، تۆش کچە قارەمانەکەم، دەتبەنە قاحپەخانەی بێ دادێ، لەوێ پرچی سپی دەهۆنیەوە، ئەمن دەبێت بڕۆم، درەنگمە، ئێستا لەوێ باران دەبارێ،

کوڕەکـانم تەڕ دەبـن، دەبێـت گۆڕەکانیـان بپەسـتمەوە، بـن ئـاو دەکەون، دەبێت لە دەوری گۆڕەکانیان جۆگەلەی ئاو هەڵبەستم، هەرگیـز لۆیـان نەگریـامە، تـامی فرمێسـکی دایکیـان نەکـردووە، دەبێت لە وەرزی نەبارینا، بەسـەر گۆڕەکانیـان ببـارێم، ئەنگـۆش کـوڕو کچـی مـنن، لەبەر ئێـوەش دەچـمەوە، دەبێـت بـڕۆم و تەشـتەك نـانی گەورەتـان بـۆ بـکەم، یاپراختـان بـۆ بپـێچمەوە، گوێزتان بۆ بشکێنم، خورما و قەسپی بەسراتان بـۆ پەیـدا بـکەم، دەبێت بڕۆم گوێزتان بۆ بشکێنم و لە ناو تـوورەگەی بـکەم، ئەو جارە خواردنی گەلەك خۆشتان بـۆ دێـنم، ئـا لە بیرنـاکەم سـەرو دەستە جلکی جوان جوانتان بۆ دێنم، پێڵاوی بە دڵی خۆتـان بـۆ دێـنم، دەبێـت بـڕۆم زۆر درەنـگە، چەنـدی زوو بـڕۆم درەنـگە، پیرەمێردەکەی کونەکۆتر چاوەڕێمە، ئەنگۆ نـازانن چەنـد مانـدیە چەند تینیە، بە بەرانپیلیش بێت دەبێت هەندێك ئـاوی بگەیێنمـێ، دەی ئەمن گەلەکم درەنگە، بـا یەك یەکەتـان مـاچ بـکەم، بەڵام خەمتـان نەبـێ، زوو دەگەڕێـمەوە، ئـۆی وەخـت بـوو لە بیـرم بچێتەوە، بە خۆشتان دەزانـن هەمـوو ڕێگاکـانی قەنـدیل گیـرانە، هیچ ڕێیەکی لێ نابێتەوە، هیچ ڕێیەکـیش تێـی ناکـاتەوە، هەیە و نیە سێ ڕێ هەیە، یەکیان دەچێتەوە بێ دادێ لەوێشەوە دەگاتەوە شامێ، دووەم ڕاست و ڕاسـت لە تـارانێ دەکـاتەوە، ڕێییەکـیش بەرەو لای تورانێ دەکشێ، ئا بە مەستوورەی بلـێن، نەکـا خـۆی لە هیچ لەو ڕێگایـانە بـدا، برایەکـانی بە نـۆبە لـۆی لە بۆسـەدان، هەر ببیـنن دەیکـوژن، نەڵـێ نامناسـنەوە، باشـی دەناسـنەوە، بە خودای ئەنگۆش دەناسـنەوە، ئەنگـۆش دەکـوژن، ئەوجـا نەکەن خۆتان لەو ڕێیانە بدەن، لێـرە بمێنـنەوە، چیـدی قسـە نـاکەم زۆر درەنـگە، چتـان پێویسـتە شـەرمێ مەکەن بیڵـێن، دەڕۆم درەنـگە، کەرە جوانەکەم لەوێ لە پەنای سـێ بەردان شـاردیتەوە، دەبێـت

بیگەمـێ نەوەك ئەنفـال بیبـات، ئەنگـۆ نـازانن ئەنفـال کەریـش دەدزێ، پێمگـۆتیە خـۆی ئاشـکرا نەکـات، پێمگـۆت هەرچیـت دیـت و بیســت نەکەی بـزەڕی، دەنـا ئەنفـال بە رێـی زەڕینـا دەتگاتێ و دەتبات، پێمگـۆتیە ئەگەر مێشیش پێوەیـدای، پـێ لە عەردی نەکوتی، کلکان زۆر رانەوەشـێنی، ئەنفـال چاوی تیـژە، گـوێی سـووکە، لە دوورەوە دەنگــی پێـی کەر دەناسـێتەوە، لە دوورەوە کلکــی کەرێ دەناســتەوە، ئـا دەبێــت بـگەمە کەرە جوانەکەم، ئەو کەرەی ئەمن و ئەنگـۆش قەرداری ئەون، ئەگەر ئەو نەبـا ئەمــن لەو دوورەوە بە دوو بەرانپیــل نــانەوە چــۆن دەگەیشـتمە ئاقـاری قەنـدیلی! دەبێـت بیگەمـێ و زۆر سوپاسـی بکەم، کوڕەکانم، ئەنگۆ یەك هەڵەتان کرد، نەدەبوو بـیکەن، مـن چاوەڕێی هەڵەی ئەوها نەبووم لە کوڕەکـانم، هەڵەتـان کـرد ئەو هەموو هێسترە ناسك و نازدارانەتان کوو رادەسـتی ئەنفـال کـرد! ئەنگـۆ بە هێسـترەوە پیـاون، لە دنیـایێ بەس هێسـتر چـاکەی بە ســەرتانەوە هەیە، ئەمــن دایکتــانم بەڵام هــیچ چــاکەیەکم بە سەرتانەوە نـیە، کـوو دڵتـان هـات، بیانـدەنە دەسـتی ئەنفـال! ئەو هێسـترانە دەزانــن چەنـد پیـرۆزن، بە خـودای سـمەکی هێسـتر، سەری بابی بابی ئەنفالی دێنێ.

ئایشەگوڵ شێتانە پەلاماریداین و یەکە یەکەمانی ماچ دەکرد، بە چاو بە یەکترمان دەگوت دەبێت بە راستی بێت و بڕوات، بە یەکترمـان دەگـوت، بە راسـتی ئایشـەگوڵ دەسـتی لێوەشـاوە و تێکچووە، بە چاو بە یەکترمان دەگوت، دەبێـت ئەوە ئایشـەگوڵ بێت! یان شتێکیدی...

+ ئێ، ماڵاوا.

ماڵاواییەکەی ئایشەگوڵ، پۆلای فاتیمەشی هێنایە گۆ:

نا مەڕۆ قسەمان زۆرە، پرسیارمان زۆرە، پێمانبڵێ بۆچی رادیۆ قسە ناکات! رێی جاسووسان و کۆگە لە کوێیە! دنیا چ باسە؟

لە سەر رۆیشتن ئایشەگوڵ بە دەنگێ کە هەر لە قوڕگی ئایشەگوڵەوە دەنگی وا بیسترا، گۆرانیەکی چڕی و یەکسەر بووە کۆپلەیەك لە گۆرانیی جەنگاوەران، دوای ئاوابوونی ئەو بۆخۆمانمان دەگوتەوە.

ماڵاوایی کرد و بە هەڵاتن هەڵات، هەڵاتنێ بە منداڵیش هەڵاتنی وای نەکردووە، هەموومان کەوتینە دوای، دیتمان دەمانچەی دەرهێنا، تا ئەوساتە نەمانزانیبوو دەمانچەی پێیە:

بێنە پێشێ دەتانکوژم، بە قسەم بکەن بگەڕێنەوە، با کورەکانی خۆم بە دەستی خۆم نەکوژم.

هەڵوەستەکمان کرد، ترساین، قسەکەی هەڕەشەی تەواو بوو، چ گاڵتەمان تێیدا نەدیتەوە، کەچی هەر چووینە پێش، تەپە هات، تەپە بوو زرمە بوو، هات، گوللە رێکاو رێك بۆ هاوڕێی گیڤارا هات، هەموومان غارمان دایێ:

چ نیە، پێمنەکەوت.

تەماشا دەکەین، نازانم بە هەڵە بوو یان راستی، گوللە بە ناو لاقیدا رۆیشتووە و شەرواڵی کوناودەر کردووە، ئیدی نەوێراین چیدی بە دووی ئایشەگوڵی گوللەهاوێژ بکەوین، رۆیشتنی ئایشەگوڵ سەرەتای هاتنی زریانێ بوو، زریانێ ئاشنا بە رێبوارانی قەندیل و نائاشتا بە هەموو دنیا، ئایشەگوڵ تەواوێ دوور کەوتبۆوە، لە قسە نەدەکەوت:

بۆ خواتان پێدەڵێم، کچ و کوڕە نازدارەکانم، بێنە دوام، ئەوجارە بە قەسدی کوشتن تەقە دەکەم، دەی هەتا گوێم لە دەنگتانە، هەر شتەکتان دەوێ، داوابکەن، بە سەر چاوان لۆتان دەهێنم.

من پڕ بە دەنگ هاوارمکرد:

شمشاڵێکم بۆ بێنە، چیدیم ناوێ.

فاتیمە بە دەنگە فاتیمەییەکەیەوە:

هەواڵ، هەواڵی دایکم.

هاوڕێی گیڤارا بە دەست راشەقاندنەوە:

راوەستە قسەکی نهێنیم پێیە، هی گیڤارایە بۆ خولە، راوەستە توخوا راوەستە، قەینا ئەوجارە بە قەستی کوشتن تێمبگرە، بەس راوەستە و ئەو راسپاردەیە بگەیەنە خولە.

ئایشەگوڵ تەواو دوور کەوتبۆوە و دەنگی وەك زەنگوڵە دەزرینگایەوە:

سەلام لە خولە بکەن، سەلام لە مەستوورە و کوڕی ئاگری و...

زریان هەڵیکرد و دەنگی ئایشەگوڵ زریانی دەبڕی، بەڵام واتای وشەکانی لە زریاندا دەتوانەوە، هەڵات بە ناو زریاندا هەڵات، لە دەنگدانەوەدا هەڵدەهات، دەنگی ئایشەگوڵ لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، گۆرانیەکەی لایلایەکی خەماوی بوو، بە فرمێسکەوە دەیخەواندین.

چاوم پڕ پڕە لە خەو

باوەشێ نیە لە خەوم بگرێ

ئەمەنێکە بە دیار منداڵەوە

بە دەم لایلایەوە

نەمخەواندوون و نەخەوتووم

درەنگمە رۆژ لە ئاوابوونە

درەنگمە کات لە بەسەر چوونە

ئەمشەو لە نێوان دوو گۆڕدا

لە نێوان گۆڕی پڕ نووردا

دەبێ وەك کوڕەکانم رابکشێم

تا هێندەی خەونی کوڕی گەورەم

بە قەت بەژنی کوڕی گچکەم

ساڵ ساڵ خەون نەچنمەوە

بڕیارێکەو نابێ بە ئاگا بێم

(سترانی جەنگاوەر)

## ١١

زریان لوولیداین و فرێیداینه دیوەخانەوە، چووینە باوەشی یەکترەوە، هەموو بێدەنگ لە پۆلا بێدەنگتر، هەموو تووڕە، لە ئایشەگوڵ تووڕەتر، حەفت بێدەنگی سەریان بە کۆشی یەکدی کردبوو، حەفت تووڕەیی ئاوێزانی یەکتر بووبوون، حەفت مینی چێنراو بووین لە بن زمانی یەکتردا، حەفت ترسنۆکی تاساو بووین، کەس ئەو زاخەی نەبوو کەسیدی بتەقێنێتەوە، حەفت دوژمنداری دوژمن نادیار بووین، زریان لە دیوەخانی شەیتان کۆیکردبووینەوە، زریان ئایشەگوڵی هەڵگرت و بردی، زریان ئێمەی لێرە داکوتاو لغاوی کردین، ئایشەگوڵ دەستی زریان لە دەستا و چوو.

رۆیشت و کۆمەڵێ رستەی بە دیار ئاگر و گابەردەوە جێهێشت، کۆمەڵێ رستەی وشە وشە قەندیلی، ئەوەتا رستە رستە بە زریاندا پەرتیاندەکەین، چۆڕێ واتایان لێناچۆڕێ، رستە رستە بە دیار ئاگرەوە رایاندەخەین، هەڵمی سووکە واتایەکیان لێهەڵناستێ، ئایشەگوڵە قەندیلیەکە ئاڵۆزیەکی ئاڵۆزتری خستە تێگەیشتنەوە، ئایشەگوڵە قەندیلیەکە ژنێکە لە زریان شێتتر، ئاڵۆزتر، لە ئەنفال ئاڵۆزتر، شێتتر، حەفت مندالین لە ماڵێکی گەمژەیی، دایکمان بە زمانێکی ئاڵۆز دەپەیڤێ، بە زمانێ پەیڤی،

زمانی هەراشان بوو، زمانێ بوو لە زمانی دایك نەدەچوو، ئایشەگوڵە قەندیلیەکە ئایشەگوڵی جاران نەبوو، تەمەنی منداڵە گەمژەکانی لە بەر چاو نەگرت.

- من چ سەرەدەریم لە قسەکانی دەرنەکرد.

- گومانم هەیە ئەو ژنە ئایشەگوڵ بێت.

- نا، هەو بوو، بەڵام ئەنفال شێتی کردووە و قسان هەڵدەبزڕکێنێ.

- نەدەبوو ڕێی ڕۆیشتنمان دابا.

- کوو! یان دەبوو بیکوژین یان بمانکوژێ!

- ئایشەگوڵ بوو، لە قسەکانیدا زۆر ڕاستیی درکاند.

-کوا! وەك چی؟

- ئەدی نەیگۆت ئەوانیدیش لە قەندیلن، چوزانم زۆر...

- تڕحێو...

- هەرگیز باوەڕناکەم ئەو ژنە ئایشەگوڵەکەی خۆمان بێت، دڵنیام یان جندۆکەیە یان جاسووسە و ئەنفال ناردوویەتی.

- ترحێو...

- هەتا نێتەوە نازانین، ئەگەر بە شمشاڵەوە هاتەوە، ئایشەگوڵە و قسەکانیشی ڕاستن.

- هەر بە تەما بە! کوڕە ئەو دەیگۆت هەر لێرە بمێننەوە، ئێ هەتا کەنگێ؟ هەتا ساڵی سەی! قسەی عەنتیکە و پەنتیکەی دەکرد، من ئەگەر ئەو قەندیلەی تڕۆ بکەم، دەبمە حیز و

خوێڕی؟! شەرتبێ بەس ڕێم بچێتەوە ڕێی دەرچوون، گوو لەو قەندیلە دەکەم، بە شەڕەفم نابێت سواری ئەو فڕۆکەش بم کە بە نزیك ئاسمانی قەندیلێ بفڕێ، من تف لەو ناو و پیرۆزیە دەکەم کە ئەو ژنە باسی دەکرد، تەواو بێزارم، لێتان ناشارمەوە، دەزانم ئەنگۆش وەکو من بیردەکەنەوە، هەر نزادەکەم ئەو ئەنفالە قەحپەیە قیچەك دڵی نەرم بێ و لێبوردنێك بۆ من دەربکات، ڕاست و ڕاست و بە سەربەرزی دەچمەوە، کێ لە بیری ماوە من لە کەنگێوە ماڵ و منداڵی خۆم بە جێهێشتووە، ئێستا ژنەکەی خۆم ببینمەوە، نایناسمەوە، منداڵەکانم هەر هیچ، داخوا ئێستا بە چ پیاوێ دەڵێن بابە، ئەمن کوو دەزانم خوا بە هەقە ئەوهاش دەزانم ئەو قەندیلە مل حیزە زەفەر بە ئەنفال نابات، دوایی ئەمن گومانم هەیە، بە خودای گومانم لەو قەندیلە هەیە، من بزانم شتێکی لەگەڵ بێ داد هەیە، کێ دەڵێ ڕۆژێ پیلمان ناگرێ و فڕێماننادات باوەشی بێ داد، ئەودەم چمان لە دەست دێت! دەی لۆ خوای بڵێن قسەکانم وایە یان وا نیە؟

- هیچی وا نیە.

-چۆن وایە! تۆ چ دەزانی؟

- نا من دەڵێم هەندێکی وایە و هەندێکی وا نیە.

- با هەمووی وایە.

- منیش دەڵێم هەمووی وایە.

- وا نیە توخوا!

- واز لەو باسە بێنن باشە، جارێ زووە و چ دیار نیە چەندی وایە و چەندی وانیە.

- نا واز ناهێنم، ئەوانە قسەی قۆڕ دەکەن، نەتدیتیە راست و رەوان بە من دەڵێن درۆ دەکەیت، هەتا ئێستا کەسەك درۆی لە من دیتیە؟ شەرمتان بە خۆتان نیە! من ئەگەر هەندێك قسەی خەلەتیش بکەم، ناهەقم نیە، دەزانم ئەو قەندیلە چەند سەر بە گۆبەندە، چەندی لەو قەندیلە دوور بیت باشە، هەرچی چیاو چۆلی دنیایێ هەیە دیتمە و تێیدا ژیامە، چیایەکم نەدیتووە، هێندەی ئەو قەندیلە سەر بە گێچەڵ، دڵرەق و پڕ نهێنیی قەت هەڵنەهێنراو، چیایەکە وەرزی بە وەرزی هیچ چیایەك ناچێت، چیایەکە هەر لۆ ئەوە باشە لە دوورەوە تفی بۆ هەڵبدەیت، تف تف قەندیل تف...

زۆری نەمابوو لە یەکتر هەستنەوە.

قسەی حیز مەهێنە ئێرە، لەوێی بهێلەوە

وەرە چا وەرە چا، چا بخۆ بە هێلەوە

بەرانپیلی ئایشەگولی گولی گولان

بەرانپیل نیە هەر دەڵێی کۆگایە

وەرن جوان لێی بڕۆنن، کورە هێلیشی تێدایە

ئەو شیعرەی سەردەستەی مراویان نەبا، رەنگبوو قەندیل شەڕێکیدیکەی ناوەخۆی تۆمارکردبا، ئا، بەفر بۆنی شەڕی لێدەهات، ئاگر بۆنی شەڕی لێدەهات، خوا کردی سەردەستەی مراویان هاتە ناوبژیەوە، شیعرێ رێی لە کردنەوەی شەرێکی گەورە گرت و نەیهێشت ئاگری شەڕ بکەوێتەوە، ئەو شیعرە شیعرێ بوو لە مێژووی چیادا، نەك هەر دنەی شەڕی نەدا، بەڵکوو چیای لە شەڕ دوورخستەوە، شیعرێ بوو هەموو ئەو

شیعرانەی پێچایەوە کە هانی تفەنگیان دەدا، تەقە لەوەی تەنیشتی خۆی بکات، شیعرێ بوو، دەتگوت خزمی نزیکی شمشاڵە، ئەو شمشاڵەی چەندان شەڕ و کێشەی هێناوەتەوە دۆخی ئاوریشمی.

چا چ چا! تامی گۆتەی ئایشەگوڵی ئەودەمانێی دەدا، ئەو دەمانەی جارناجار لەگەڵ گەردوگوڵی بەیانی بە نوردووی نان و مەنجەڵێ ماستی مەڕەوە دەگەیشتە بەرزاییەکان و بە دیار چا دێمکردنەوە، لە لێوەکانیەوە، ئەو لێوانەی دەتگوت جمکانەی بزەن، نم نم وشەی دەباراند بەسەرماندا و داروباری چیای دەخستە سەمای پێکەنینەوە، چا تامی قسەی ئەو ساتانەی ئایشەگوڵی دەدا کە لە زینداێ ئەنفالی فریودەدا و دەرگایان لێدەکردەوە و دەهاتەوە کۆلانێ، لە کۆلانیشەوە تا سەر کانیەکانی بناری چیا پشووی نەدەدا، پێیە شینومۆر بووەکانی دەخستە ئاوەوە و لە لێوەکانیەوە قل قل ترێی وشە بەردەبوونەوە و پێشمەرگە وەك منداڵی هاروهاج پڕیاندەدانێ، چا رێك ئەو چایە بوو، بۆ یەکەم جار کە لە بن رەشماڵێ لە رەشماڵەکانی زارگەلی لەگەڵ شێخ لە دەستی شۆخێ وەرمان گرت، بە مەهناز گازیاندەکرد، لە چای بن رەشماڵێ، من تامی مەهنازم کرد، شیرینیی مەهنازم لە پیاڵەی چا خواردەوە، مەهناز چ مەهناز! لە رێواس ناسکتر، لە چای شیرین شیرینتر، ئەو چایەی لە پیاڵەیەکی خەتخەتی و بنپیاڵەیەکی گوڵگوڵی بۆی تێکردم، چاوی مەهناز دەتگوت بنپیاڵەیە، هەر لە حەزی چاوی مەهنازەوە چایەم دەکردە بنپیاڵەکەوە، لە چاوی مەهنازەوە لە بنپیاڵە چام دەخواردەوە، چایەی دەستی مەهناز، چا چا سۆراخمدەکرد لە هیچ بنە مەتارەیەك لە هیچ پیاڵەیەك نەمدەدیتەوە، زۆر گەڕام نەمدیتەوە، تا ئایشەگوڵ نەیهێنا، نەمدیتەوە، شێخ دەیگۆ:

چـــام لە دەســـتی هەرچـــی ژن و کچـــی عەنکـــاوە هەیە وەرگرتووە، تامی چای مەهنازیان نەداوە.

خـۆزی ئەو شـێخەش ئەو دەنـکە پسـاوەش لێـرە دەبـوو، تـا جارێکیدیش تامی چایەکی مەهنازیی بکردایە، چای ئایشەگوڵی، ئەو چایەی شەڕێکی گرژ لە زریان گرژتری، خاو خـاوکردەوە، خاویەك داو داو نیازی شـەڕی لە پەژیـوانی بەسـتەوە، لە چـایەی گـوڵەوە، لە چـایەی نـاو بەفـر و بـن بەردەوە، گەیشـتمەوە نـاو رەشماڵان.

دەبێت کامیان بن، نا ئەو ئیشە ئیشـی مـن نـیە، ئەوە پیـاوی خـۆی دەوێ، لە تەنیشـت رەشـماڵەکە وەسـتاون، چـرپە چـرپ دەکەن، دەنگیـان ناناسـمەوە، دەبێـت کـێ بـن! عەیشـان، زارێ، مەریەم، نازێ، بێـری، مەسـتان.... یەکیـان مەهنـاز نەبـێ! لە ترسـا بوو، لە شەرما بـوو، لە خۆشـیا بـوو، لە هەموویـان و لە هیچیـان بوو، شێخم وەئاگانەدەهێنا.

+ ها خەوتنە!

- نا، ئا.. ئئا. ننا..

شـێخ وەئاگـا هـات، ئەو شـێخە بەجەرگەی شـەرمی لە ژن نەدەکرد، ئەو پیاوەی لە دیتنی ژن، نە تۆزێ بشـلەژێ، نە زمـانی تەتەلە بکا.

-کچـێ دەوەرن، خەوتنـی چ، ئەوە بـۆ وا درەنـگ هـاتن! خەریکبووبخەوین و تەمامان پێتان نەمێنێ.

+ نا وا مەڵێ، هەرێمان دابوو.

لە بن چـاوەوە دیـتم، شێخ دەسـتی یەکیـانی گـرت و بەرەو

گابەردێ کە لە تەنیشت ڕەشماڵەکە و لە بەرانبەری مانگ قیت ڕاوەستا بوو، هەنگاوی نا، ڕووی لە من کرد و دەستی بۆ ژنەکەیدی درێژ کرد:

ئێوەش لێرە...

تا ئەو دەمە سەیری هیچ کامێکیانم نەکردبوو، لە بوێریی شێخەوە هەستمکرد، منیش دەماری غیرەتم جوولەیەکی تێکەوت، بێ سەیرکردن دەستی لەرزۆکم چووە سەر شانی، هەر هێندەم زانی ژنێك بە رووتی وا لە باوەشمە، لە بیرم نیە و نازانم ئەو ژنە چۆن رووتبۆوە! هێندە دەزانم گوشینێ دەمگوشی، هیچ شتێکم وا نەگوشیوە، بڕوا ناکەم ئەویش هەرگیز ئەوها گوشرابێ، لەبیرمە پەلە هەورێك بووم پڕ لە گرمە و برووسکە، زۆری نەبرد رژانێ رژام، هیچ پەلە هەورێ بەو شێوەیە نەڕژاوەتە هیچ دۆڵێکەوە، تا نەڕژام، لە لەشولاری ورد نەبوومەوە، رووخساریشم جوان نەدیتبوو، لە بەر تریفەی مانگەشەودا و لە دوای رژان ناسیمەوە، مەهناز، ئەو کچەی باوەڕمنەدەکرد لە خەونیشدا ماچێکی لێوەکانی بکەم، ئێستا بە رووت و قووتی لە ناو تریفەدا راکشاوە و...

ئەو مەهنازەی ئەو رۆژە لە بن رەشماڵێ بە دەستە ناسکەکانی خۆی چای تێکرد و بۆمانی راگرت، چەند جوان و ناسك و شیرین بوو، ناگاتە مەهنازەکەی بەر تریفەی مانگەشەو، ژن چەندێ جوان بێت لە ناو تریفەدا، جوانیەکەی جوانتر دەنوێنێ، لەو مانگەشەویە هاوینیەدا ئەو شیرینیەی لە مەهنازدا مژیم، ئەگەر لە هەموو ژنانی دنیادا ئەو شیرینیە هەبێت، وێناچێ ژن دەستی لە تاڵیی ژیاندا هەبێت و بۆ تامیش تاڵیی نەڕژاندۆتە ژیانەوە، ئەو

جوانیەی من لەو شەوەدا لە مەهنازم چنیەوە، ئەگەر پیاوانی دنیا جوانیی وا لە ژندا بچنەوە، سەرریژ دەبن لە جوانی و بۆ ئەزموونیش پیاوێ شك نابەیت جوان نەبێت، لە لێوەکانی مەهنازەوە تا رادەی بەدمەستی تەڕایی ئەویم خواردەوە، تەڕاییەك ئەگەر تووڕەیی ئەنفال بمکاتە بەرد، بمکاتە ئاسن، لە تەڕایی ئەوین وشکم ناکاتەوە، لێوی مەهناز هەر جارەی تامێکی دەدا، لێوی مەهناز هەر جارەی میوەیەك بوو لە میوە بەهەشتیەکان، من ئەو شەوە لەو لێوەوە هەناری مێخۆشم مژی، پرتەقالم مژی، لیمۆم مژی، چم نەمژی! هەندێ جار وام هەستدەکرد لێوم بە لێوی هەنگوینەوە ناوە، ئەو موچڕکانەی لە مەمکەکانی مەهنازەوە، لە پەنجەوە، لە لێوەوە، دەهاتنە لەشمەوە، موچڕکەی خودایی بوون، ئەگەر لە شەیتان پتریش بەربەرەکانێی خوداوەند بکەم، ئەگەر فتوای کوشتنی خوداوەندیش بدەم، خوداوەند دڵی نایە، ناتوانێ، لەو موچڕکانە بەتاڵم بکاتەوە، مەمك چ مەمك ئەوەی من دیتم، دەبێت چەند کەس دیتبیان! رێك لە دوو هەرمێ دەچوون، لە جێیەکی گەلەك عاسێ، سووند دەخۆم لە پەنجەی با بترازێ، بای کوێستان، دەستی هیچ کەسەکیان نەگەیشتبووێ، چ بزانم مەمکی کچان ئەوهایە!

ئەو ساتانەی سەرگەرمی پشکنینی لەشولاری مەهناز بووم، کتێبەکان نەختێ یاریاندام، ئەو دێرانەی وشە وشە لەشی ژنیان هەڵگرتبوو، ئەو دێرانەی تەنها لە ساتەکانی رووتبوونەوەی ژندا، واتا دەبەخشن و راست دەکەونەوە، دێرەکان دەستیان دەگرتم و دەیانبردم و دەیانخستمە گەمەیەکەوە، دیار بوو کەس گەمەی ئەوهای لەگەڵ مەهناز نەکردووە، گەمەی وام لەگەڵ دەکرد، پێدەچوو لە کنە وی گەمەی نوێ بن، دەمدیت چێژ وەك تریفە

پێیدا دەڕژێ، پێمدا دەڕژێ، جارێکیدیش چوومەوە دۆخی پەلە هەور، برووسکە لە دوای برووسکەم بە سەر لەشولاری مەهنازدا دەهاویشت، لە گرمە گرمی منی پەلە هەور، مەهناز دەتگوت درەختە و حاڵی گرتووە، هەژانی دەهەژا، هیچ زەویلەرزەیەك لەرزینی وای نەخستۆتە زەویەوە، چەند جوان بوو حالگرتنەکەی مەهناز، شەیتان دیتبای، مانی لە یاخیبوون دەگرت و دەهاتەوە ناو کۆڕی ئەویندارانی خوداوەند و حاڵی خواپەرستی دەگرتەوە، دیسانەوە رژامەوە، بە خوڕ رژامە ناو کێڵگەی تینووی مەهنازەوە، من لە بارەی مەهنازەوە تەنها برووسکە چیرۆکێکم دەزانی.

وێناچێ لە هەژدە هاوین پتری دیتبێت، چەند حەفتەیێ بوو بە بووك چووبوو، دووشەو لەگەڵ مێردەکەی خەوتبوو کە پیاوانی رەشماڵ بە هاواری خزمە کۆچەرییەکانیانەوە بە رێکەوتن، مێردەکەی مەهنازیش یەکێ بوو لەو پیاوانە، بەرەو گەرمیانێ بەرێکەوتن، بە مەبەستی دەربازکردنی خزمەکانیان لە چنگی ئەنفال، ئەو خزمانەی ئەنفال رێی کوێستانی لێیان گرتبوو، هەر هێندەم لە مەهناز دەزانی و زانی، بەڵام ئەم شەو...

لەم شەوە تریفە رێژەی زارگەلی، لەو شەوە رەشماڵیەی کە لە هیچ شەوێکی من ناچێ، شەوێکە نەبووە و دەڕوا و نایەتەوە، وێناچێ بێتەوە، ئا لەو شەوە رووناکەی کە چەند دوندێ لە دوورەوە چاویان لێیە، من ورد ورد لەشولاری مەهناز دەپشکنم، پشکنینێ مێردەکەی حەفت ساڵیش رووتی بکاتەوە، پێناچێ ئەو پشکنینەی من دەیکەم، لە دەستی ئەو بێ، بۆ هەموو پیاوانی رەشماڵیش خۆی رووت بکاتەوە، باوەڕناکەم وێنەی لێوردبوونەوەی من لێیوردبنەوە، ئەوەتا بە هەموو پەنجەکانم لەشولاری دەپشکنم، بە لێو دەیپشکنم، بە زمان دەیپشکنم، بە

چاوی لە تریفە تیژتر دەپشکنم، جێ داوێ لە جەستەی نەماوە لە دەرەوەی دیتنی من، مەهناز چ جێیەك لە لەشی نەماوە بۆ چەندان جار وەك قەندی شەکر لە ناو لێوەکانی من نەتوابێتەوە، داو داوی پرچی خاوی مەهناز لە بەر ئاوێنەی مانگ، بە پەنجە شانەدەکەم بە لێو شانە دەکەم.

مەهنازی رەشماڵنشین، مەهنازی سەر دەرگای رەشماڵ، مەهنازی لە مانگ رووتتر، لە مانگ پڕ نازتر، مەهنازی شەوە تاقانەکەی من، ئەو مەهنازەی نەیدەزانی ناوە ناسکەکەی خۆی بنووسێ، منی فێرە لەشناسی کرد، ناسینی لەشی ژن هەر دەبێت لە ژنەوە فێر بی، ئەو ژنەش بۆ من مەهناز بوو، مەهناز بوو چۆڕ چۆڕ تامی لەشی ژنی رژاندە گیانمەوە، فێریکردم لە جیاتی نزای چوونە بەهەشت، بۆ هەمیشە نزای لە ژن نزیککەوتنەوە، نزای لە ژن توانەوە بخوێنم، پیاوە کۆچەرییەکەی مەهناز، زاوا دوو شەویەکە، لەم شەوی توانەوە و رژانەدا، وا لە گەرمیانێ شەڕی ئەنفال دەکات، منیش ئەو پیاوەی دەمێکە شەڕی ئەنفالم راگەیاندووە و چەکم دژی هەڵگرتووە، من ئەو پیاوەی هەرچی خەڵکی گەرمیان و کوێستان هەیە، چاویان لە دەستی منە، بچم بەر سینگی ئەنفال بگرم و زەبرێکی وای بخەوێنمێ، خەیاڵی چیا گرتنی لە سەری دەربکەم، وەها چاوشکێنی بکەم، بە کێندەرێدا هاتووە بە وێدا بگەڕێتەوە و هەتا دەگاتەوە بیابانێ نەوێرێ ئاوڕبداتەوە، پیاوە کۆچەرییەکە لەوێ بەو شەوە شەری ئەنفال دەکات، منیش...

لە کنە من ئەو شەوە شەوی شەڕ نیە، شەوی توانەوە و رژانە، ئەوەتا لەگەڵ ژنی پیاوە کۆچەریە شەڕکەرەکەدا، لە زارکی رەشماڵدا کە بۆ مانگ لە سەر پشتە، لە گەمەیەکی

خودایین، گەمەی ناسك، گەمەیەك کە چێژ تێیدا تریفەیە، تریفە بە تەنێ بۆ من نیە، مەهنازیش لەشریژە لە تریفە، گەمەیەك ئادەمیش لەگەڵ حەوادا نەیکردووە، نەیزانیوە، بیزانیایە دەیکرد، ئەگەر ئەو گەمەیەی من دەیکەم ئەو لەگەڵ حەوا بیکردایە، منداڵی ئاشقیان دەخستەوە، منداڵی وا هەرگیز بیر لە کوشتنی یەکتر نەکەنەوە، نا نەیانزانیوە، ئەگەر ئادەم و حەوا بیانزانیایە، لە جیاتی ئەنفال، ئایەتێك لە دایك دەبوو، ناویان دەنا تریفە، نازانم شەو گەیشتبووە کوێ!

نازانم گەمەی مەهناز و من چەند کاتی ویست، ئەوەم باش لە بیرە سێ جار بوومە پەڵە هەور، هەورێ جیا لەو هەورانەی لە پایزاندا لە گارەوە بەرەو ئاگری قوڵ لە قوڵی یەکتر هەڵدەکێشن و ئاور لە زارگەلی نادەنەوە و نارژێن بە سەر ئەو گابەردانەی ئەمشەو پاسەوانی لە من و مەهناز دەکەن، سێ جار خوڕ خوڕ رژام، جاری سێیەم دڵنیا نیم لەوەی مەهناز بە رژانەوە رانەکانی بۆ رژانی من کردەوە یان نا، بەڵام دووانەکەیدی رژان لە رژانەوە بوو، ئەو بەژن و لەشولارە رووتەی من دیتم و مەهناز بوو، ئەو شێوە ئەندازەیەی کە خوداوەند هەموو توانای جوانکاریانەی خۆی تێدا بە گەڕخستبوو، مەهناز بوو، چ لەشولارێکی هەبوو خودایە! سمت دەرپەڕیو، سینگ دەرپەڕیو، ران گۆشتن، باسك گۆشتن، کەمەر باریك زۆر باریك، گەردن باریکی شمشاڵی، وا بزانم خوداوەند مەهنازی بە تایبەتی بۆ من درووستکردبوو، ئا دیاریی خوداوەند بوو، بەو هەیوەشەوە بۆ منی نارد، من لە ناو تریفەدا بە چاوی مانگ لێی وردبوومەوە، ئەو سپێتیەی لە مەهنازەوە رژایە گیانی منەوە، ئەو چێژەی ئەو ژنە بە منی بەخشی، ئەگەر لە هەموو ژنانی دنیا ئەو جوانیانە هەبا، ژنانی دنیا تامی هەموو میوەیەکیان بە تامترەوە بدایە، وەك

من له مه‌هنازدا تامم کردن، مـن ده‌ڵـێم هه‌ر پیـاوێ خولیـای ژن گۆڕینی له سه‌ر با، ده‌بێت له سه‌ری بـدرێ، ژنه‌که‌ی لای شـێخ به نه‌رمی گاسی مه‌هنازی کرد:

- دره‌نگه کچێ، به‌س نیه، تێر نه‌بووی؟

+ با بڕۆین.

مه‌هنـازی رووت خێـرا چـۆوه نـاو جلکـو به‌رگه‌وه، به ده‌م رۆیشتنه‌وه:

+ ئه‌گه‌ر منداڵێکم بـوو، که‌مێـك به تـۆ چـوو، نـاوی ده‌نـێم تریفه.

- ناوێکی خۆشه وه‌ك ناوی خۆت.

شێخ گه‌یشته‌وه بن ره‌شماڵ:

+ ها کوو بوو؟

- تا مردن قه‌رداری تۆ و مه‌هنازم.

+ قه‌رداری شمشاڵه‌که‌ی خۆتی.

- شمشاڵ!

+ ئه‌و شمشاڵه مه‌هنازی هێنایه باوه‌شی تۆ!

- ئه‌ها!

+ خه‌وت نایه؟ خه‌وتی یان نا!

- نه‌خه‌وتـم و خه‌ویشـم نـایه، ده‌ڵـێن شـێت بـووه، ده‌نـا به‌و ناوه‌خته مه‌هنازێکم ده‌ژه‌نی.

+ بخەوە کاکە بخەوە، سبەی رێی دوورمان لە پێشە.

ئیمامەی پساوە پێیە پڕ پلاتینەکەی راکێشابوو، سەربردەی پێ و پلاتینی دەگێڕایەوە و باسی تەنگانە و برینداربوون و بە هاناوە هاتن و ئەمەکداری جەنگاوەرانی دەکرد، دیاربوو لەگەڵ هاوڕێی گیڤارا نەخشەی دەربازبوونیان دەکێشا و بیریان لە شتێ دەکردەوە، بەڵام من لێیان دووردەکەومەوە، دەچم لە ناو بەفر قیت رادەوستم، بیرم لە تریفە دەکردەوە، دەفڕم...

بیر لە تریفە دەکەمەوە، هەستدەکەم منداڵێکم هەیە پارچەڵە، ناوی تریفەیە، دایکیشی ناوی مەهنازە، نازانم بابی ناوی چیە! رەنگە دنیا پڕ بێت لە منداڵی باب نادیار، تریفەش یەك لەوانەیە، رەنگبێ من کچێکم هەبێ بە ناوی تریفە، لەوەیە کچ نەبێت کوڕ بێت، بەڵام هەر ناوی تریفەیە، بابی تریفە پیاوێکە نە تریفە دەیناسێ نەدایکی تریفە دەیناسێتەوە، بابی تریفە وێدەچێ ئەو پیاوە بێ، وا لە ناو زریانی قەندیلدا ئەو زریانەی ئایشەگولی برد، لە بن سێ گابەردی گەورە، ئەو بەردانەی خوداوەند بە دەستی خۆی بۆ ئێمەی لێرە دانا، بە تەنیشت شەش دنکە پساوەدا، بە دزی و دوور لە چاوان دەچێتەوە مانگە شەوەکەی زارگەلی و مەهناز لە باوەش دەگرێ، رووتیدەکاتەوە، گۆی مەمکەکانی دەخاتە لێویەوە، مژ مژ دەیانمژێ، مژینێ تریفەش وای نەمژیبێ، ئا من منداڵێکم هەیە نازانم کچە یان کوڕ، ناوی تریفەیە، شێخیش رەنگبێ منداڵێکی هەبێ، نازانم چ ناوێکیان لێناوە، بەڵام دێتەوەبیرم دایکی منداڵەکەی شێخ ناوی مەستان بوو، مەستان چ مەستان، هەر بە تەماشاکردن مەستی دەکردی، مەهناز و مەستان هەوگیانی یەکتر بوون،ماڵیان بە تەنیشت یەکەوە بوو، گابەردێ نێوانیان بوو، مێردەکانیان چووبوونە گەرمیان بۆ شەڕی ئەنفال،

بەڵام بـابی منـداڵەکانیان لە شـەوێکی تریفەیـی، لە شـەوێکی هاوینیی فێنك، توند تونـد لە باوەشیان دەگـرن و دڵیـان نـایێ بە جێیان بهێڵن!

+ بێـدەنگی دەتکـوژێ، رایەڵـی رابـردوو لە پەل و پـۆت دەخات، ئاگاداری خۆت بە...

- من، نا، چ نیە.

+قسە هەڵدەبزرکێنی، مەهناز کێیە! تـریفە چیە؟ شێخ چـی بەسەر هاتووە، هێندە ناوی دێنی، شتێك لە بارەیەوە دەزانی؟

-نا، هیچی لێنەهاتووە، ئاگام لێی نیە، نازانم...

-ببوورە.

خوا خوام بوو فاتیمە وازملێبێنـێ، درەنگـمە کـارم بە قەنـدیل نەماوە، دەبێت تا زووە بـگەمەوە زارگەلـی، ئـا دەبێـت سـۆراخی مەهناز و تریفە بکەم، منـداڵێکم هەیە، لە شـەوێکی مانگەشـەوی لە بەردەم رەشماڵێ لە ناو لەشـی مەهنـازدا بەجێمهێشـت، مەهنـاز راستی گۆت، رستەیەك نەبوو لە بێ قسـەیی لە زاری مەهنـازەوە بەربوویێتەوە، رستەیەك پڕ لە واتا وەك زگپڕبوون واتادار، دەڵـێن: ژن بەر لەوەی منـداڵ بکەوێـتە زگـیەوە، دڵـی دەتریـوێنێ، دڵـی پێیدەڵێ: ئاگاداربە منداڵێ بە رێوەیە.

ئا، ئەو ساتانەی من دەڕژام، ئەو خۆی لە جـوولە دەخسـت، بـۆ چەنـد سـاتێ گیـانی تێـدا نەدەمـا، خوێنـدبوومەوە لە کتێبـان خوێنـدبوومەوە، ژن ئەگەر حەزی زگپڕبـوون چـووە دڵـیەوە، لە دوای رژان جـوولە لە خـۆی دەبڕێـت، بە بەر گەزەشـی بـدەی، رانەکانی نابزوێنێ، مەهناز وای کرد، سێ جار جوولەی لە خۆی

بڕی، ئا من منداڵێکی چاو گەشی جوانم هەیە، پتر چۆتەوە سەر دایکی، ناوی تریفەیە، دەبێت بیبینمەوە، دەبێت دایکی تریفە بیبینمەوە.

+ بەس بزانم تریفە کێیە؟!

فاتیمە وازناهێنێ، وا دیارە لە فرمێسکیش بە دوامەوەیە، ناکرێ وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدرێتەوە، دیتم فاتیمە هەموو گیانی خۆی بۆ وەڵامێ هەڵخستووە، پرسیارێ بوو تك تك تامەزرۆیی لێدەتکا.

- تریفە ناوی منداڵەکەمە.

+ چی چی! بۆ تۆ ژنت هەیە؟ من تازە بزانم.

- منداڵەکەم ناوی تریفەیە.

+ دایکی ناوی چیە؟

- مەهناز

+ئۆی لەو ناوە ناسکە! واتای مەهناز چیە؟

- واتاکەی ئەوها ئاسان نیە و لێرە ناگوترێ، بۆ ئەوەی تێبگەین، دەبێت دنیا لە مانگەشەوی هاوینیدا بێ و مانگەشەوێ پڕ لە تریفە، تریفە بڕژێتە پێش ئەو ڕەشماڵەی لە زارگەلیدا بە سەر هەڵدێرا دەیڕوانی، من لەوێ بووم، ئا، تەنها لەوێ تێدەگەین مەهناز چیە، تریفە چیە.

+ ئەها، ئەوە ڕەشماڵی رابردووە.

- بە راست کەس لە ئێمە هەیە لە ئێستادا بژی؟

+ وا بزانم هەموومان پتر لە رابردوو دەژین نەك ئێستا، بەڵام تۆ لە هەمووان پتر لە رابردوو پیاسە دەکەیت و کەمتر لە ئێستادا بە دیار دەکەویت، وا بزانم بە زۆر چاوت نەکەینەوە کەس لە ئێمە نابینی.

- ئێوەش لێرە بزرن، گوێم لە قسەتان نیە، جاروبار نەبێ.

**ئەوشەو سەرم بەتاڵ بەتاڵ لە ئەنفال**

**نە هورەیەك لە هێرشی ئەنفالەوە دێ**

**نە شنەیەك لە بەزینی ئەنفالەوە**

**شەوترین شەوی ترسە**

**شەوترین شەوی شەرمە**

**شەوترین شەوی چێژ**

**شەوە تاقانەی تەمەنە ئەو شەو**

**رەشماڵ کپ کپ**

**کوێستان هەمووی خەوتووە**

**من خەوم نایە**

**گوتیان ژنێ وا بە رێوە**

**لە پێشوازیی ژن**

**ترس بە پێوە**

شەرم بە پێوە

چێژێ لە ناو تریفەی پیاوێ

رووت رووت دانیشتووە

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٢

+ ئایشەگوڵ نەختێ بە قسەی خستینەوە، لەسەر ئەوە بوو قسەمان لە بیربچێتەوە، سەردەستەی مراویان جاروبار نەبێ، شیعری بە زاریدا نایە، هاوڕێی گیڤارا بێ سروود ماوەتەوە، هەموو دەڵێی پۆلان، بەڵام کەسمان وەك تۆ...

- بە راست ئەو ژنە ئایشەگوڵ بوو؟

+ئا هەو بوو، بەڵام ئەوە نا کە پێشتر دەماناسی.

- من پێشتر وام دانابوو، ئەو ژنە لە هەر جێیەك بێ، هەر خۆی دەبێ.

+ هەر کەسێ رێی بە قەندیل بکەوێ، کەسەکەی پێشوو نیە.

- تۆش؟

+ تۆش.

- خەریکە چاوم لە چاوەڕوانی بکەوێ، بە راست چاوەڕوانی چی بکەین؟

+ ناشێ چاوەڕوانی لە دەستبدەین، من تا ئێستا چاوەڕوانی خولەم دەکرد، ئێستا چاوم لە رێی گوڵە.

-پێتوایە ڕێی بێرە بکەویتەوە؟

+ ئەگەر لە دەرەوەی قەندیل بێت، ڕەنگبێ بێتەوە، نازانم.

- لەمێژە هەواڵی دایکت نازانی؟

+ ئـا، بـۆ دیتنـی دایکـم ئـاگرم گرتـووە، بـێ مـاڵاوایی بەجێمهێشت.

- بۆچی بێ ماڵاوایی؟

+ نازانم، ئێ، بۆ یەکەم جار کە ئایشەگوڵم دیـت و ناسـیم، لە نێـوان مـن و مەسـتوورە دانیشـتبوو، دەسـتی لە سـەر شـانمان دانابوو، ماچی دەکردین، هەستمدەکرد دایکمە، لە سەر ڕۆیشـتن بوو پێیگوتین:

چ پێویسـتیەکتان هەیە، چ راسـپاردەیەکتان هەیە، بیڵێن مەترسێن و شەرمێ مەکەن.

مەستوورە گۆتی:

نـامەیەکم هەیە بـۆ بـابە تـایەری بـرام، ئەگەر بیگەیەنـی، تـا مردن لە چاکەت دەرناچم.

ئایشەگوڵ:

دەی کچـم زوو بینووسـە، ئەوە زۆر ئاسـانە، ناونیشـانەکەم بە درووستی بدێ و خەمـت نەبـێ، بەسـەر چاوی دایکـی خـۆت، دەیگەیەنم.

من گوتم:

منیش نامەیەکم بۆ دایکم هەیە.

نامەیەکی جوان بە دڵی خۆمم نووسی و هەموو شتێکی لە دایکم شاراوەم تیا نووسی، تێر ماچیکردین، بە دوو نامەوە رۆشت، نامەیەك بۆ هەمەدان، نامەیەك بۆ بەسرا، ئیدی من و مەستوورە بە ئاسوودەیی بە تەنیشت یەکەوە راکشاین.

ئێ، نازانم چەندی پێچوو، حەفتەیەك کەمتر پتر، هەر لە بن ئەو درەختەی نامەمان نووسی و لێیوەرگرتین، ئا هەر لەوێ من و مەستوورە بە تەنیشت یەکەوە لە خەوێکی هاوینیدا بووین، هەستمکرد دەستێ بە پەنجەکانی یاری بە قژم دەکات، نەموێرا چاوم بکەمەوە، ترسام، گوتم هەبێ نەبێ ئەوە جەنگاوەرێکی تینووە، گوتم لەمێژە لە ژنی نەخواردۆتەوە و وا رێی بە من کەوتووە، لە دڵی خۆم دەمگوت چ بکەم باشە! گوێملێبوو بە دەنگێکی نزم نزم دەیگوت:

هەستن، کچە جوانەکانم هەستن، تێر خەو نەبوون.

راپەڕیم، مەستوورەش هەستا، کێ بێت باشە! ئایشەگوڵی دایك، هەردووکمانی توند توند لە باوەشگرت، لە باوەشگرتنێ دایکیشم منی وا لە باوەش نەگرتووە، کەس کەس منی وا لە باوەش نەگرتووە، لە بەرکی کەواکەی دوو نامەی دەرهێنا، بە پرتاو لە دەستیم وەرگرت، نامەی دایکم بوو دەستخەتەکەیم ناسیەوە، دایکم زۆر شتی بۆم نووسیبوو، دەزانی نووسیبووی:

تۆ هێندە خەم لە من مەخۆ، منیش لەمەودوا بە شێوەی جاران خەم لە تۆ ناخۆم، چوونکە تۆ بێجگە لە من دایکێکیدیشت هەیە، لە من میهرەبانتر، ئەگەر منیش بمرم تۆ بێ دایك نابیت و دایکی تۆ گوڵە.

بابە تایەریش بۆ مەستوورەی وا نووسیبوو:

تا ئێستا وام دەزانی لە دنیایێ یەك ژن هەیە لە هەموو ژنانی دنیا جوانتر و میهرەبانتر ئەویش ناوی مەستوورەیە، بەڵام ئێستا ژنێکیدیش لە جوانی و میهرەبانی وا بە تەنیشت مەستوورەوە راوەستایە، ناوی ئایشەگوڵە.

نووسیبووی:

مەستوورەکەم، تۆ زۆر خۆشبەختی کە جوانترین خوشك و جوانترین دایکت هەیە، ناویان گوڵە.

- دەزانی لەمێژە پرسیارێکم بۆ تۆ هەڵگرتووە.

+پرسیار هەڵگرتن بارێکە، مرۆڤ پەکدەخات، بیکە، رەنگبێ وەڵام هەبێ.

- خۆزی بێ رەنگبێ با، تۆ چی پۆڵای؟!

+ بۆچێ پرسیارەکە لەو ناکەیت؟

- خورما وەڵام نەداتەوە، بەرد وەڵام دەداتەوە!

+ ئەو قسانەی لە کن بەرد هەن وێناچێ لای خورما دەستبکەون، بەرد ئەگەر بزانیت لە کوێوە دەیقرنجێنیت، جۆگەیەك لە قسەی پێیە، دەترسم حەزت چووبێتە خورما، ها ها ها...

- ئەدی بۆچی ناوی تۆی پێوەیە؟

+ لەوە گەڕێ.

کەس نەیدەزانی فاتیمە و پۆلا چی یەکترن، هەندێك دەیانگوت:

خوشـك و بـران، هەر لە منـداڵیەوە لێکـدی دابـڕاون و بە گەنجی یەکتریان دیتیەوە.

هەندێك دەیانگوت:

نا ژن و مێردن.

هەشبوو دەیگوت:

فاتیمە زڕدایکی پۆلایە.

دەیگوت:

وا نیە، پۆلا زڕبابی فاتیمەیە.

کەس نەیـدەزانی، گومانـت بـۆ هەر شـتێ دەچـوو، لەپـڕا نیشانەیەك دەردەکەوت گومانەکەی بەتاڵدەکردەوە.

+ تۆ واز لەوە بێنە، من دەمێدی شێخم لە خەوێ دیـت، لەو خەوە چاوی زۆر دێشا، ئیدی نازانم چ بوو، بەئاگاهاتم، چـی لە بارەوە دەزانی؟

- زۆر، بەڵام چیرۆکی ئەو شێخە چی بە تۆ دەبەخشێ؟

+ رەنگبێ هـیچ! بەڵام ئێسـتا حەزم لە گێـڕانەوەی سـەرهاتە، دەکرێ سـەرهاتێکیدیم بـۆ بگێـڕیەوە، هەر سـەرهاتێ، هـی هەر دەنکە پساوەیێ، گرنگ نیە، ئەگەر سەرهاتی شێخ بێ باشتر.

هەسـتمکرد فـاتیمە حەزی لەی قسـەی مـنە، هەر قسـەیەك، پێدەچوو وەك من، وەك ئەوانیدی زۆر قسەی بۆ خـۆی کردبـێ، بێزار بووبێ لە بیستنیان، دەیەوێ کەسێکیدی قسەی بۆ بکات.

- باشە فاتیمە.

+ وازت لەو فاتیمەیە نەهێنا!

- چۆن وازی لێدێنم! ئەو شێخە وا بزانم خزمی مار شەمعون دەبێتەوە، لەوەتەی دنیا هەیە ماڵیان لە عەنکاوەیە، ماڵەکەیان کەوتۆتە نێوان کڵێسەیەك و بارێك، خۆت بینیوتە چەند جوانە دەڵێی مەسیحە، هەر لەبەر ئەو جوانیە ناویان لێناوە شوان.

+ ئەدی شێخەکە لە کوێوە هات؟

*- ماڵێکی موسڵمان دراوسێیان دەبێت، کوڕەکیان هەیە ناوی زانایە، ئەو ماڵە بە بنەچە دەچنەوە سەر شێخەکانی نازانم کێندەرێ، ئیدی خەڵك زاناش بە شێخ بانگدەکەن، شوان و زانا بە منداڵی هاوڕێ دەبن، بستەك چیە بەبێ یەکتر ناڕۆن، دواتر شوان دەبینێ ئەو زانایە زۆر درۆزنە، سەختەچیە، هەتا دزیشی لێدەبینێ، بیستبووی نێربازیش دەکات، ئیدی خۆی لێی دوور دەخاتەوە، بەڵام دەبینێ خەڵك لەبەر ناوەکەی ڕێزی زۆری لێدەگرن، نیو هێندە ڕێز لە شوان ناگرن، بۆیێ شوان بڕیار دەدات، ئەگەر بە ئایینی مەسیحیش بێت، شێخەك بە خۆیەوە بنێ، شێخایەتی خۆی رادەگەیەنێ و دەڵێ:*

*یەکەم جار بەسەری موحەمەد ئەوجا بەسەری عیسا هەر کەسێك بە شێخ گازمنەکات، وەڵامنادەمەوە، ئەوجا خوای دەکرد دایکم دەبوو.*

*ئۆمەتی موحەمەد و ئۆمەتی عیسا لێی دەچنە تکایێ:*

*کوڕم وانابێ، بابم وانابێ، لە کەلی شەیتان وەرە خوارێ، تۆ و شێخیان نەگوتیە.*

*پێیدەڵێن: خۆت شێت مەکە ئەو دوو ئایینە جوانە پیس*

*مەکە، خـۆ ئـایین تێکەڵکـردن وا ئاسـان نـیە، چمـا وەکـوو تێکەڵکردنی هێلکە و تەماتەیە!*

*شێخ بڕیارێکە و پەشـیمانی تێـدا نـیە، سـواری پشـتی شـەیتان بووە و دانابەزێ.*

+ ئەوە ناسکترین شۆڕشە، ئێ چیدی!

- زۆر شـت هەیە، نیـوەی سـەرهاتی وی لە کـنە مـنە، بەڵام ئێستا شتێکم نیە بۆ گوتن

+ نیە بۆ گوتن یان حەز بە گوتنی ناکەیت؟!

- نا بۆ حەز ناکەم...

+حەزدەکەم شێخی بن رەشماڵم پێبناسێنی.

- شێخ بن رەشماڵ و ناو شـاخ و داخـان و ئەوەی نزیـك سێگۆشـەی جەنگـاوەران وێـدەچێ هەر هەمـان شـێخ بـن، خـۆ ئەوەی ئەوێ دەناسی.

نەمدەویســت بە ئاگــایی فــاتیمەوە بەرەو رەشــماڵ بــبمەوە، نامەوێ بیبەمە شەوە مانگەشـەویەکەی ئەوێ و بە رووتـی مـن و مەهناز ببینێ، حەزمدەکرد ئەو دیمەنە جوانانەی ئەوێ ببینێ، لـێ شەرممدەکرد، زۆر شەرمم لە فاتیمە دەکرد.

+ ئەگەر تـۆ شـێخی بـن رەشـماڵم پێبناسـێنی، مـن شـێخی چیایەکت پێدەناسێنم وێناچێ ناسیبێتت.

- ئەوە چیە! سەرهات لە بری سەرهات؟

+ نا، بە گاڵتەم بوو.

هەستمکرد، فاتیمە لە قسەکانی خۆمەوە، داوی بۆم داناوەتەوە، بیرمنیە بە چ شێوەیەك باسی مەهناز و تریفەم بۆ کردووە، یان رەنگبێ ئەسحابەکوژ نهێنیەکەی بۆ فاتیمەش گێڕابێتەوە و لە چاوی کراوەی بێناگای منەوە، لە زاری داخراوی منەوە، وێنە وێنە چاوی بە ئەلبوومی شەوە مانگەشەویەکە گێڕابێت، نا، پێویستە پارێزی لە شەرمی خۆم بکەم و نابێت تك تك لە پێش چاوی فاتیمە بیتکێنم.

- ئێ، ماڵاوایمان لە رەشماڵەکانی زارگەلی کرد، بەڕێکەوتین، لە رێ، رێی سێگۆشەی جەنگاوەران، تۆش ئەوێت دیوە؟

+ کەس هەیە نەیدیبێ!

- وایە، هەموو جەنگاوەرێك رێی بەوێ دەکەوێ، ئەگەر زۆر لەوێ بمێنیتەوە هەرچی جەنگاوەری دنیا هەیە دەیانبینی، لە هەورازەیەك کابرایەکی کەشکۆڵ لە کۆڵمان تووش هات، دوای سڵاو و چاکوچۆنی، گۆتی:

ناوم ئەولیای چەلەبییە، کارم سەرهات نووسینە، رووداوان لەو دەفتەرە تۆمار دەکەم

دەفتەرێکی گەورەی پێبوو، بە زمانێکی تێکەڵ بە سێ زمانان دەپەیڤی، بە بەر چاومانەوە هەندێ شتی لە دەفتەرەکەی تۆمارکرد، لام جوان نەبوو تەماشای دەستی بکەم بزانم چی دەنووسێت، زۆر پرسیاری لێکردین، بە شێوەیێ وەلاممان دەدایەوە، مەترسی نەبێت بۆ سەرمان، شێخ سەری نایە بن گوێم:

گومانم لەو پیاوە هەیە، با...

گوتم نا، تۆ هەڵەیت.

ماڵئاوایی کرد و ڕۆیی.

هێشتا هێندە دوور نەکەوتبۆوە، شێخ گۆتی:

کوڕە، من بزانم، ئەو پیاوە دەسکیسە با بیگرین.

گوتم:

باوەڕناکەم، نا، ئەگەر بیگرین چی لێبکەین، بەو خاوە چۆن لەگەڵمان دەردەچێت!

شێخ بە چاوە گەورەکانی کە هێندەی بنپیاڵەیەك دەبوون، تەماشایکردم:

کوڕە، دەرچوونی چی! بە گوللەیێ ساردیدەکەینەوە و تەواو.

ڕازی نەبووم و وازمان لێی هێنا، ئەو نشێو بۆوە و ئێمە هێور هێور هەڵگەڕاین، هەڵگەڕێ، هەڵگەڕێ. لە هیکڕا دوو کۆپتەر پەیدا بوون، لە سەر سەرمان وەك چاویەشە دەسووڕانەوە، خۆمان لە بن بەرد و داران شاردەوە، هێندەمان زانی تەواوێك دوور لە ئێمە کۆپتەرێك نیشت، وەی وەی! یەك دنیا سەربازی ڕژاندە گۆڕێ، لەولاتر ئەویدیش نیشت، لەویش سەرباز وەك زەنگەزۆرە بە چیا وەربوون، تا هەینێ نەمدەزانی کۆپتەر جێی هێندە سەربازەی لێدەبێتەوە، سەرباز سەرباز هەر چوار لایان گرت، لە دووربینەوە جوان دیاربوون، بزنەرێیەکیش نەمایەوە بۆ دەربازبوو، وێدەچوو جێێ ئێمەیان نیشانکردبێ، بە دەورەماندا بازنەیان بەست، نەرم نەرم دەهاتنە پێش، چارمان نەما لە شوێنێکی عاسێ سەنگەرمان گرت، شێخ گۆتی:

نەتهێشت بیکوژین.

گۆتم:

باوەڕناکەم دەستی ئەوی تێدابێ.

تەواو نزیکبوونەوە، لە کەلێنی درەختە کورتە بنەکان و تیشە بەردە گەورەکان دیار بوون بە پارێزەوە دەهاتن، زۆری نەبرد تەقە دەستی پێکرد، گۆتمە شێخ:

تا نەکەوینە مەترسیەوە با تەقە نەکەین.

گۆتی:

وا دەکەین، ئاگاداربە گوللە بە خەسار نەدەیت.

کار لە کار ترازا، خەریکبوو بکەوینە بن دەست و پێی سەربازانەوە، شێخ گۆتی:

بکوژە.

کوشتی، کوشتم، هەر سەرباز بوو پشتاوپشت، زگاوزگ، سەراوسەر، قوونـاو قوون، بە عەرد دەکەوت و تفەنگ بێ دەست دەمایەوە، بە چەندان زمان گوێم لە هاواری سەربازان بوو، جێی ئێمە عاسێ بوو، لە چیا و چۆلان هەندێك جێ هەیە، خوداوەند بە تایبەتی بۆ جەنگاوەری درووستکردووە، تا بێ خەم شەڕی لێبکات، جێی ئێمە جێیێ بوو لەو جێیانە، بە دڵی خۆمان تەقەمان دەکرد، فیشەکم لە بڕان بوو، چەک و فیشەکی چەندان سەرباز لە بن دەستمان بوو، کۆپتەر دەستە دەستە سەربازی هەڵدەڕژاند، هەر سەرباز بوو دەڕژایە چیا و لە چیاوەش بەرەو مەرگ، شێخی سەربازکوژ، بە دوو تفەنگان شەڕی دەکرد

+ ئۆی! ئەو شەڕە دەڵێیت کە ئێستگەی مۆنتیکارلۆش باسی دەکرد، چما ئێوە کردتان؟

- ئا، بەشی زۆری شێخ کردی، ئەو سەربازانەی بە دەستی شێخ کوژران، ئەگەر هەموویان بەهەشت بن، تا دۆزەخ دۆزەخە شێخ لە ناو ئاگر دەمێنێتەوە، بەڵام من هێندە لە دۆزەخ نامێنمەوە.

ئێ، سەرباز شکانێك شکان، هەڵاتنێ هەڵاتن، مەپرسە، دەستیان بۆ کۆپتەر رادەشەقاند، کۆپتەر بۆی رانەدەگرتن، رۆژ لە سەر ئاوابوون بوو، مەترسیمان لەسەر نەما، لە ناو تەرمان خۆمان کۆدەکردەوە بۆ رۆیشتن، هێندەمان زانی لە ئاسمانەوە شتەك لە نێوان من و شێخ زرمەی هات، بەینی من ئەو تەواوێك بوو، خۆم بە عەرد دادا، دیتم دووکەڵێکی سپی بەرز بۆوە، بۆنیش هات، شێواین، من سەرەو بەرزایی هەڵکشام، شێخیش بەرەو نشێوی.

بۆنی سێوم دەهات، شێخ گازیکردم، کردم، یەکترمان گرتەوە، بڕۆ، بڕۆ.. شێخ نەرم نەرم دەکۆخی، ئاویش لە چاوی دەهات، لەهیکڕا هاواریکرد:

کوڕە دەستم بگرە، چاوم هیچ نابینێ.

دەستم گرت و بڕۆ، ئێ، دکتۆرێ تازە لەمۆسکۆ گەڕابۆوە، تەماشای چاوی کرد، گۆتی:

چاوی تۆ لێرە چارەی نیە، تەنها لە مۆسکۆ چادەبتەوە. شێخ بە ئاستەم شتی دەدیت، هێلکە و پیازت لە بەر دەم دانابا، بە چاو لێکدی جیا نەدەکردنەوە.

لەوێ لێکدی جیابووینەوە، ماڵاوایم لە شێخ کرد و نزای

چاکبوونەوەم بۆی خواست، بیرمە گوتم:

دوای چوونە مۆسکۆ و چاکبوونەوە، شووشەیێ ڤۆدگای رووسیم بۆ بێنە.

گۆتی:

ها جارێ ئەو رادیۆیەت بدەمێ، من پێویستم پێینیە.

لێم وەرگرت، ئەو رادیۆیەی دامە ناسك و ئەنفال بردی، لە ساتی ماڵاوایی گوتی:

نەتهێشت ئەولیای چەلەبی بکوژم، ئەو سەگبابە چاو مۆنەم بە قوربانی یەك گوللە کردبا، تووشی ئەو بەڵایە نەدەبووین!

شێخ دڵنیا بوو لەوەی ئەولیای چەلەبی جاسووسی لە سەر ئێمە کردووە، کۆڵەپشتەکەی ئامێری بێتەلی تێدابووە، قسەی لەگەڵ کۆپتەرەکان کردووە و جێگەی ئێمەی نیشان داون، بەڵام من باوەڕم نەهات، ئێستاش دوودڵم.

ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی شێخم دەکرد بە شووشەیەك ڤۆدگاوە بگەڕێتەوە، رۆژێك بیستم لە بێ دادە، لەباتی مۆسکۆ ناردیتیانە بێ داد، ئیدی نازانم چی بەسەرهاتووە!

فاتیمە بە سەرسوڕمانەوە:

+ تۆ بەراستتە؟

- چۆنی دەگێڕمەوە ئەوهایە.

+ پێناچێ بەسەر دنیاوە مابێ، خۆزی دڵیم نەدەشکاند.

- دڵیت شکاندووە!

+ ئا وەك شووشەی فۆدگا شکاندم.

- حەزدەکەم گوێم لە زرینگانەوەی ئەو شکانە بێت.

+ئەو کوڕە لە بەلاش نەهاتە خەونم، شتێکی خراپی بە سەر هاتووە، من بە دیتنی وی وام دەبینی لە پێش وێنەکەی مەسیح راوەستاوم، زۆر لەوی دەکرد.

- وایە هەندێ لە کچان بە شوان مەسیح گازیاندەکرد، دیارە حەزناکەیت قسە لە دڵشکانەکەی بکەیت.

+ با، لەبەر تۆ نا لەبەر خۆم، بۆ کەسێکی نەگێڕمەوە دڵم شەق دەبا، با ئەو کەسە تۆ بیت، رۆژ و شەوەکەی بن بارانت لە بیرە؟

- ئـا، ئەو شـەو و رۆژەی کە شـەوی پێشـتر ئیسـرائیل دەسخەرۆی داین.

+ رادیۆ درۆزنەکەی گوتی بەرێکەون، هەتا سێ رۆژیدی، ئاسمان رێتادا یەك پەلە هەوری توخن بکەوێ، کەچی ئەو شەو و رۆژە هەرچی هەوری ساڵان هەیە لە ئاسمانێ خڕبوونەوە و بـارانی حەفـت سـاڵان بە سـەر ئـێمە و چیـادا رژا، ئەوە بـوو، هەرچۆنێ بوو بە رێیە عاسییەکە هەڵگەڕاین، هێسترە جوانەکانمان بە هێسترەبۆزیشەوە لەبەر غەزەبی ئاسمان بە جێهێشـت و خۆمـان گەیاندە ئەشکەوتەکە.

- ئەو ئەشکەوتەی وا بزانم بۆ یەکەم جار بوو، مرۆڤ ببینێ!

+ لە بیـرتە چ ئـاگرەکی گەورەمـان کـردەوە و زوو زوو وشك بووینەوە و خەومان هات، وا بزانم ئەو شـەوە یەکەم شـەو بـوو لە ژیـانی مە، بەبـێ نۆبەتـداری بخەویـن، وا تێـبگەم تـاقە

شەویش بوو پێش خەوتن، شمشاڵەکەی تۆ دەنگی لێوە نەهاتبێ.

- وا بوو.

+ ئا، هەموومان هەڵبجە ئاسا، پەلەواژ بووینەوە و خەوتین.

- ئێ، خەوتین!

+بە ڕێککەوت من و شێخ کەمێك لێکدی نزیك پاڵکەوتین، پێش نووستن ئەو لێك نزیکیەم لە بیرە، خەوتبووم، هەستمکرد دەستێ لە سەر سینگمە و لە دووی شتێك دەگەڕێ، چاوم کردەوە دەبینم شێخە، زۆر تووڕە بووم، بە هەموو هێزی خۆم، لەبەر ماندوویتیش هێزم تیا نەمابوو، مستێکم لە سینگی دا، یەکسەر بە خشپە جێی خۆی گۆڕی و دوورکەوتەوە.

- بۆ ڕۆژەکەی ئەوە نەبوو لە ئەشکەوتە ئاسمانیەکە هاتینە خوارێ و هێسترەکانمان بە بارەوە دیتەوە، دیار بوو ئەوان لە ئێمە بە ئەمەکدارتر بوون، لە جێگەی خۆیانەوە چاوەڕێی هاتنەوەی ئێمەیان دەکرد.

+با، شێخ بە شەرمەوە هاتە لام و داوای لێبوردنی کرد کە هەڵەیەکی شەوانەی کردووە، دەیگوت: خۆشم ئاگام لێنەبوو چۆن ئەو هەڵەیەم کرد، دەیگوت: لە تەمەنی خۆم بێ خواستی خۆی دەستم بە هیچ کچێك نەکەوتووە.

من لەو زیاتر داوای لێبوردنم لێی کرد، نەدەبوو ئەو مستەم لێبدایە، ڕاستە بێ ئیزن وەرگرتن ئەوەی لەگەڵ من کرد، هەرگیز بێدەنگ نابم لە کاری ئەوها، بەڵام نەشدەبوو وا توند بام لەگەڵیدا، بە هەر حاڵ تازە ڕۆیشت، من ئێستاش کە ئەو مستەم بیر دەکەوێتەوە، ڕقم لە دەستی خۆم دەبێتەوە، شێخ

گەلێك نازدار بوو، دواتر هەستم بە نازداریی ئەو كوڕەكرد، نازانم تۆ ئەو كات ئاگات لەوە بوو كە من و شێخ بە جووت دەڕۆیشتین یان نا؟

- نا ئەو وێنەیەم لە چاو نەماوە.

+ ئێ، من چەندێ دەمویست لێی نزیكببمەوە و بیدوێنم، خۆی دوور دەخستەوە، دیار بوو لە شەرمەوەیە، چەندێ دەمویست ئاسایی بێتەوە، ئەو ئاسایی نەدەكردەوە، چەندێ دەمویست ئاسایی لێمبڕوانێ، تیچاوێكی نەدامێ، جار هەبووە لە نانخواردنێ بە مەبەست لە پێش وی دانیشتوومە، بۆوەی بۆ چركەیێ بمخاتە چاویەوە، بەتەواوی لە ئاست من چاوی خۆی داخستبوو نەیدەكردەوە، وا رێككەوتووە پێكەوە هێسترێكمان بار كردووە، ویستوومە پەنجەم بەر پەنجەی بكەوێ بە مەبەستی شكاندنی شەرم لە ئاشتبوونەوە نەك بە نیازێكیدی، وەكات دەستی كێشاوەتەوە، وەك ئەوەی نەهێلێ دەزنوێژی بشكێ.

بەفرو باران بوو، لە رێی چیایێ، رووبارێكی گچكە هاتە رێمان من لە دوای وی دەڕۆشتم، ئەو تازە پەڕیبۆوە كە من گەیشتمێ، بە ئەنقەست گۆتم:

ناوێرم بپەڕمەوە.

ئاوڕیدایەوە بێ ئەوەی سەیری رووخسارم بكات، گۆتم:

دەكرێ یارمەتیم بدەی لە پەڕینەوە؟

كەمێ داما، دیتم دارەكی درێژی هێنا، بەسەر ئاوەكەدا بۆی رەوانكردم و گوتی:

توند بیگرە.

وام کرد، من دەستی ئەوم دەویست نەك دار، ئەوەشم هەر بۆ ئاشتبوونەوە بوو، ناهەقی نەبوو، ئەو مستەی من لێمدا، سووکایەتیەك بوو، لەوانەیە لە تەمەنی خۆی سووکایەتی ئەوهای پێنەکرابێت.

- ئەدی ئەویش سووکایەتی بە تۆ نەکرد!

+ نا، رەنگبێ هی ئەو لە بێئاگاییەوە بووبێ، تا لە ئاگاییشەوە بووبێ، نەدەبوو کاردانەوەی من بەو شێوەیە با کە بوو، دەکرا بە شێوازێکی جوان تێیبگەیەنم من ئەو کچە نیم کە تۆ لەو ئەشکەوتەدا لە دوای دەگەڕێی، بۆ ئەو تێگەیاندنە زۆر شێوازی نەرم و جوان هەیە، بەڵام من ئەو کات نەمدیتنەوە.

- هەوڵەکانی ئاشتبوونەوە وەستان؟

+ زۆر کۆشام ئاشتیبکەمەوە، هەمووی وەك هەوڵەکانمان لەگەڵ ئایشەگوڵ شکستیان هێنا، دوا هەوڵ کە باش لە بیرمە و دوای ئەوە ئیدی شێخم نەدیتەوە، جێیەك هەیە دۆڵی دۆڕانی دەڵێنێ، تۆش بینیوتە، شەوێکی هاوینیی فێنك بوو، چوار پێنج کەسێ بووین، وا تێبگەم تۆش لەگەڵمان بووی!

- ئەو شەوەی بادەمان نۆشی؟

+دەم خۆش، بە دزیەوە ناوە ناوە پێکی خۆشم دەکردە پێکی شێخەوە، بۆ ئەوەی تەواو مەست بێ و لە مەستبووندا پێکبێتەوە.

- مەزەشمان هەنار بوو، هەناری سوور سوور.

+جوانت لەبیرە.

- هەرگیز بیرمناچێتەوە.

+ دیارە بۆ تۆ شەوێکی خۆش بووە!

- بەڵام من هیچ هەستم بەوە نەکردبوو ناخۆشیەك لە نێوانتاندا هەبووبێ، تا ئاشتبوونەوەی بوێ.

+نا، لە سەرەوە لە بەر چاوان هیچ لە گۆڕێ نەبوو، کەس هێمای گرژیەکی لە نێوان من و شێخ نەدیتووە، بەڵام کەسیش نەیدیتووە بۆ چرکەیەکیش چاوی شێخ لە سەر من بێ، کەس نەدیتووە دەستی شێخ بە نیازی تەوقەکردن، بە هیچ نیازێ، بەرەو دەستی من جوولەیەك بکات.

- ئەوە نازانم.

+ ئێ، هەستمکرد شێخ تەواو مەستبووە، کاتێ بە نیازی دەست بە ئاوگەیاندن هەڵدەستاوە، پێی تێکدەئاڵاو لەنگەری نەدەما، وا بزانم هەمووتان تەواو مەستبووبوون جگە لە من، مەستبوونێ لەو مانگەشەوە رووناکەدا ساتمەتان لە یەکتر دەکرد، منیشتان نەدەدیت ها ها ها، کەمێ دوور لە کەپرەکە شێخم گرت، گرتم بە دەستم قۆڵەکانیم گرت و گوتم:
سەیرمبکە.

سەری داخست.

گوتم:

بدوێ.

ورتەی لێوە نەهات.

گوتم:

بۆچی هێندەت خواردەوە خراپ تێکچووی.

گوتی:

تا قۆڵم بەرنەدەی، هیچ ناڵێم.

بەرمدا، پرسیم:

ئێ بۆ هێندەت خواردەوە؟

گوتی:

دیتم کەسێ پێکی خۆی لە پێکی من دەکرد، بەس نەمزانی کێ بوو!

لەو قسەیەی سووکایەتیم خوێندەوە، سووکایەتی بە خۆم، بەلام بەسەر خۆم نەهێنا، گوتم:

تەنها پێمبڵێ بۆ سەیری من ناکەیت، هیچم لە تۆ ناوێت.

گوتی:

ناتوانم، تکات لێدەکەم لێمگەڕێ.

گوتم:

لەگەڵم پێکوەرەوە، چیت لێم دەوێ بۆت دەکەم.

گوتی:

من بە هیچ شێوەیەك لە تۆ تووڕە نیم تا پێویست بە پێکهاتنەوە بکات، من لە خۆم تووڕەم، هەڵەیەکم بەرانبەر تۆ کردووە، راستکردنەوەی بۆ نیە، ئەو هەڵەیە خۆمی لە خۆم تووڕەکردووە، ئەو دووە ئاشتنابنەوە، لەم بارەیەوە تۆ ناتوانی

هیچ بکەیت، تکات لێدەکەم، خوشکی گەورەم تکات لێدەکەم وازملێبێنە، تۆ لای من زۆر پیرۆزی، پیرۆزیەك ناكرێ نە تەماشای بکرێ، نە دەستی لێبدرێ.

چەندی لەگەڵی پێداچووم و داوای لێبووردنم لێکرد، بەلاش بوو، بە ناچاری وازم لێی هێنا.

**داغستانی لێمان نزیککەوتەوە، دیتی ئێمە سەرگەرمی گێڕانەوەین، بێ قسە بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە.**

دەبێ سەردانی ئەو شەوە کەپریە بکەمەوە، ئەو شەوە مەستیەی فاتیمەی بە دڵشکاوی هێشتەوە، لەو شەوەدا فاتیمە دڵی منی هەنجن هەنجن کرد، ئەو شەوەی لە هەڵدانی هەر پێکێ، پشکۆی ئاگری بەردەدایە دڵمەوە، ئەو شەوە فاتیمە بە سووتان منی سووتان، خۆ ئێستا بەرۆکی ناگرم و پێبڵێم:

بۆ وات کرد بۆ؟

ئەو شەوە من جگە لە رووی فاتیمە، کەسیدیم نەدەدیت، روومەتەکانی فاتیمە لە دنکە هەنارەکان سوورتر دەچوونەوە، لێوەکانیشی سوورتر، ئەو شەوە هێندەی سەیری رووی فاتیمەم کردووە، سەیری کەسم نەکردووە، هەرچی تەماشای من هەیە بۆ ژن کۆیکەمەوە، بە قەد تەماشای ئەو شەوە نابێت کە بۆ فاتیمەم هەڵخست، بەڵام فاتیمە وەك ئەوەی من هەر لەو کەپرەش نەبووبم، وا خۆی پیشاندەدا، من رێك رووبەرووی ئەو دانیشتبووم، نێوانمان لە دووراییی دوو هەناسە پتر نەبوو، ئەگەر فاتیمە دڵی نەشکاندبام، دەمتوانی بە فووێ، فووێکی پڕ لە نمەی ئەوین، پرچی تازەکراوەی بخەمە سەمای ئەوینەوەە، ئای تامەزرۆ بووم بۆ ماچێکی لێوی، لە حەزی لێوەکانیەوە، دنکە

هەناره سووره‌کانم دەخستە زارمەوە و تێر تێر دەمژین تا دوا تەڕایی دەممژین، بەڵام فاتیمە خوشکانە دەیڕوانیە من، نا ویناچێ فاتیمە هەستی بەوە کردبێ شەوێ لە شەوان دڵی منی شکاندبێ، نا، پێینالێم تۆش ئەو شەوە دڵی منت شکاند و داوای لێبووردنیشت لێم نەکرد، نا، وا ناکەم وا نالێم، با فاتیمە هەر بەو جوانیەی ئێستا لە چاوی من بمێنێتەوە، دڵم دەڵێ فاتیمە لە جوانیی خوشکایەتیەوە بچێتە هەر جوانیەکیدی، لەگینە پەشیمانی دامبگرێ و لەو جوانیە خودایيە بێ بەش بم کە ئێستا لە فاتیمەدا دەیبینم و مەستم دەکات.

+ ئێ، چیدی؟

چیدی چی! من بێ ئاگایی فاتیمە چوومە سەردانی کەپری دڵشکاندن، پرسیارەکەی منی هێنایەوە ناو یاوەرانی ئەشکەوت.

دتم فاتیمەی قەندیلی هۆن هۆن فرمێسکی دەڕژان و توانای قسەکردنی نەما، رەنگە قسەشی پێنەمابووبێ، یان ئەوەی بە قسە نەیتوانی بیکات بە فرمێسك دەریبڕی و تێیگەیاندم.

**داغستانی دیارە لە دوورەوە فرمێسکی فاتیمەی دیوە، گەڕایەوە و پرسی:**

+ ئەو کچە جوانە بۆچی دەگرێ؟

- گریانێکی ئاسایی، وەك گریانی هەر یەکێك لە ئێمە.

+ ئەو گریانە جیایە، بە ناوی من پێیبڵێ تکای لێدەکەم، با نەگرێ، من لە ئاست گریانی ئەو کچە ناتوانم خۆم رابگرم، گریانی ئایشەگوڵ هێندە کاری تێنەکردم، پێیبڵێ ئەو گریانە دەمسووتێنێ.

دیتم فرمێسك دڵۆپ دڵۆپ له چاوی داغستانیەوە روون روون بە سەر سمێڵە زەردبووەکانی دەهاتنە خوارەوە، فاتیمە تێگەیی داغستانی تکای وەستانی گریانی لێدەکات، دەبینم بە دەستە ناسکەکانی فرمێسکە ناسکەکانی دەسڕێتەوە، ئێستا چاوی فاتیمە بێ فرمێسکن، بەڵام داغستانی نایبڕێتەوە، وەك ئەوەی فرمێسکی فاتیمە بەر چاوی گرتبێ و فاتیمەی دوای گریان نەبینێ.

ئەوانیدیش لێمان نزیککەوتنەوە، لە گریان و فرمێسکی داغستانی خڕبوونەوە، رووی پرسیاریان لە من کرد:

+ ها چ بووە داغستانی بۆ وا بە کوڵ دەگریێ؟

- چ نیە گریانێکی ئاساییە، وەك هەر گریانێکی قەندیلی.

+ نا وا نیە، ئەو فرمێسکانە لە گریانی ئاساییەوە بەرنابنەوە.

فاتیمە دەستەکانی خستە سەر شانی داغستانی، تکای هێور بوونەوەی لێکرد، تکای لێکرد با گریان بەس بێت، داغستانی لە تکای فاتیمە گەیشت،گریان دەنگی نەما، بەڵام رێ لە فرمێسك نەگیرا، فاتیمە چەندی کردی نەیتوانی چاوەکانی ئەو پیاوە گریاوە لە فرمێسك چك بکات.

سەردەستەی مراویان بە بنە مەتارەیەکی پڕ لە چاوە گەیشتە داغستانی، لێی وەرگرت، سەردەستەی مراویان دەستی بە گێڕانەوەی نوکتە کرد، چاوەکانی داغستانی کەم کەمە بەرەو چکبوونەوە دەچوون، سەردەستەی مراویان نەبا، کەس بەری ئەو جۆگەلەیەی پێ نەدەگیرا کە لە چاوی داغستانیەوە سەری کردبوو، پۆلای فاتیمە گازی فاتیمەی کرد، بە ئاستەم گوێملێیە:

تکایە ئەگەر ئەوجارە گریای دوور لە چاوان بگری، با کەس فرمێسکەکانت نەبینێ، گریانی تۆ لە گریانی ئایشەگوڵ وێرانترە.

من تێگەیشتم فاتیمە بۆچی گریا، تێگەیشتم بۆچی لەگەڵ فاتیمەدا فرمێسکم هەڵدەوەراند، بەڵام لە گریانی داغستانی تێنەگەیشتم.

فاتیمە تێر تێر گریابوو، لە چاوە بارانیەکانیەوە دیجلەیێ فرمێسکی هەڵبەستبوو، حەفت وەرزە گریانیدی رووی تێبکەن و بە هەنسکان دەوری بدەن، دڵۆپێ فرمێسك بۆ داباریـن شك نابات، هەرچی ناسۆریی دنیایێ هەیە، هەرچی کاری کردە و نەکردەی پەشیمانی هەیە، لە چاوە رووباریەکانیەوە، بەریدابوونە سەر بەفر، فاتیمەی دوای گریان، فاتیمەیەکە بێ ئاخ و ئۆف بێ هەڵکێشانی هەناسەی سارد، فاتیمەیەك بوو لە فاتیمەی پێش گریان تەواو جیا، وەك جیایی منی بێ شمشاڵ و منی ئەو ساتانەی شمشاڵم دەژەند، ئەو فرمێسکانەی لە گریانی ئایشەگوڵەوە بە چاوی فاتیمەدا ورد ورد هاتنە خوارێ، سەرەتایەکی تەڕی بوون بۆ ئەو فرمێسکانەی لە گێڕانەوەی سەرهاتێك بە خوڕ دەبارین و لێی نەدەکردەوە و سەریانکرد و نەدەوەستان، من تا لە چاوی فاتیمەوە رێزە فرمێسکم نەدی، نەمدەزانی ژن جێگەی هێندە فرمێسکەی تێدا دەبێتەوە، بووکەکەی پیری شالیاریش هێندە فرمێسکەی نەڕژاندە قەندیلەوە، فاتیمە کەفوکوڵی دڵی خۆی لە رێی فرمێسکەوە دامرکاند، تەماشای دەکەم ئاسوودە دیارە، بەڵام من هەستدەکەم، سەرەتامە بۆ گریان، هێندە پڕم، فرمێسك بەتاڵم ناکاتەوە، پڕیی من تەمها لە هەورەوە نیە، زریانێ لە من

گێژدەدا، ڕەشەبایێ لوورەی دێ، دەبێت بە تەنێ لە چاوەوە نا، لە پەنجەکانیشمەوە خۆم بە تاڵبکەمەوە.

ئەی ئەو خوداوەندەی لە کونی شمشاڵەوە دەنگت دەنگدەداتەوە، درەنگە و بگە ئەوێ، منداڵانە بە گوێی ئایشەگوڵدا بچرپێنە:

هەتا زووە شمشاڵێ بگەیەنە قەندیل.

بە بیربێنەوە، کە دەیگوت بە منی دەگوت:

ئەو بەرەبەیانیانەی لەوێوە، لە هەر کوێیەك و لە هەر کێویکەوە، فوو بە شمشاڵدا دەکەیت، من لە کۆڵانەکانی شارەوە، لە ناو درختە پرچنە چۆلەکەگرەکان، ئاوازەکان دەبیستم و پێیان دەشنێمەوە.

خوداوەندەی هەمیشە لە ناو شمشاڵ، سۆراخێکی خولەم بۆ بکە، لە هەر کوێیە ببینەو پێبلێ:

پیاوە شمشاڵژەنەکە لە قەندیلە و لە بێ شمشاڵی هەناسەی چلوورەی گرتووە.

دەی خوداوەند، بەس هەواڵی بدێ، ئەو لە خدری زیندە سووکتر دەفڕێ، هەر ئێستا بە شمشاڵەوە دەگاتە ئێرە، ئەو پیاوەی هەر کاتێ گوێی لە دەنگی شمشاڵ دەبوو، پڕ بە گەروو هاواری دەکرد:

تەقە ڕاگرن، شەڕ حەرامە.

دەیگوت:

ئەو ساتانەی دەنگی شمشاڵ دێ، هەر کەسێ تەقە

رانەگرێ، ژن بێت یان پیاو، بێ یەکودوو هەر سێ تەڵاقی دەکەوێ.

بەڵام دەیانگۆ: کوڕی ئاگری گۆتیتی:

من کە کەوتمە گەرمەی شەڕ و دەستم بە کوشتنی جاش و عەسکەران کرد، شمشاڵ ناتوانێت دەستم بگرێت، نەك سێ، سێسەد تەڵاقیشم بکەوێت، تا فیشەکێ هەبێت هەر شەڕ دەکەم.

خوداوەندی بەژن و باڵا شمشاڵی، ئەگەر ئایشەگوڵ و خولەش نابینییەوە، بڕۆ خزمەتی مەستوورە و ژنانە پێیبڵێ:

ئەو پیاوەی شمشاڵ بە تۆی ئاشناکرد و پێکەوە چەند ساتێ سواری جۆلانەی با بوون، بڵێ بە بەر چاوی خۆیەوە، ئەنفال شمشاڵەکەی شکاند و باڵی یەکە یەکە ئاوازەکانی بەست و بردنی.

پێیبڵێ، بە مەستوورە بڵێ:

ئەگەر خۆیشی کاتی نیە و ناگاتە قەندیل، بە کوڕە ئاگریەکەدا شمشاڵێ بنێرێ.

کوڕی ئاگری دەیهێنێ، لە چاوترووکانێ دەیهێنێ، بەس لە شەڕێدا نەبێت دەیهێنێت، دەزانێ سەربەندی شمشاڵ (مەستوورەی مەستان)ە، خوداوەندی عەشقە شمشاڵ، تەنێ شمشاڵم لە تۆ دەوێ، بە شمشاڵ نەبێ بەتاڵنابمەوە، پڕم لە زریان و ڕەشەبا، پەنجەکانم سەرڕێژن لە ئاوازی باڵ بەستراوی فاتیمەیی، ئەو ئاوازانەی هی فاتیمەن، دەبێت بیانبیستێ، لە کونەکانی شمشاڵەوە نەبێ هەرگیز نایانبیستێ، من تەنێ بە زمانی شمشاڵ دەتوانم بێ شەرم بدوێم، دەتوانم وەك چۆن بۆ مەهناز

خۆم رووتکردەوەوە، رووتتر لەوە قسە لە شەرم رووتبکەمەوە و فاتیمەش بێ شەرم بمبیستێ، تەنها لە کونی شمشاڵەوە دەوێرم بە فاتیمە بڵێم:

تۆ دڵی منیشت شکاندووە، بۆ ئاشتمناکەیتەوە!

بە شمشاڵ بە فاتیمە دەڵێم:

خۆتم پێبناسێنە، من تۆ ناناسم، تکایە راست و رەوان خۆت ئاشکرا بکە، با بزانم تۆ خوشکمی یان نا، تۆ یارمی، دایکمی، کچمی! تۆ چی منی؟!

نا وازی لێناهێنم، زمانی شمشاڵ زمانێکە، یەك وشەی درۆ چیە، لە خۆی جێناکاتەوە، کە بە زمانی شمشاڵ پرسیارم لە فاتیمە کرد، ناچارە وەڵامی راست بێژێ.

هاورێی گیڤارا لە خەیاڵی شمشاڵی کردم، قسانده‌کات، لە ناوێ بەفرێ بە شێوەیێ گەرم داهاتووە، زریانیش ساردیناکاتەوە، دەڵێ:

دەبێت ببینمەوە، ئایشەگوڵ لە خۆڕا قسە ناکات، لە تەمەنی خۆی درۆی بە زاریدا نەهاتووە، لە زیندانەکانی ئەنفالیش بۆ رزگاربوونی گیانی خۆیشی درۆی نەکردووە، نا لەوێش درۆی نەکردووە، ئەگەر پرسیارێکی بە دڵ نەبووبێ، ئەگەر پرسیارێك وەڵامەکەی ترسناك بووبێ، بێدەنگ بووە، لە بەرد بێدەنگتر، هەرچی قامچی ئەنفال هەبووە بە گەڕ خراوە لەسەر جەستەی وی، زۆر کەس دیتوویانە قامچی بە قامچی کەوتووە، کەچی ئەو کە بڕیاری بە بەردبوونی خۆی داوە، هەر بە بەردی ماوەتەوە و زاری ئەنفالی تەڕ نەکردووە، ئەو ژنە ئەنفالی

لێدەرچێ، کەسی دەسخەرۆ نەکردووە، من باشی دەناسم، دایکم باشـی دەناسـێ، بە جحێڵـی دەسـتە خوشـك بـوون، ماڵیـان لە کۆلانێك دەرگا بە دەرگاوە، لە دایکمم بیستووە، لە دنیایێ بەس یەك کەس هەڵە ناکـــات، یەك کەس درۆ ناکـــات، ئەویـــش ئایشەگوڵە، ئا دەگەڕێم و دەیبینمەوە.

- وازبێنە خۆ لەو هەموو بەفـرە مەدە، گـووی گەمـان نـیە، بە هەزار پیاوی چوار شانەش هەڵنادرێتەوە.

- کوڕە واز بێنە، هەموو تەمەنتیشی لێ خەرج بکەیت، لە بـن ئەو بەفرە هەر بەفر دەبینیەوە و ناگەیە چیدی.

- وازبێنە جارێ بەشی گەرمبوونەوە ئاگر ماوە، دوایی کوا چ چالایی دیارە، بەفر چالاییەکی لەو قەندیلە هێشتۆتەوە!

- بە من ناڵێیچۆن دڵنیای ئەو ژنە ئایشەگوڵ بوو؟

-ئێ با ئایشەگوڵیش بـێ، ئەو دنیـایەك قسـەی هەڵ بزرکانـد، کۆلکە داریش قسە هەڵبزرکان بوو.

هاوڕێی گیڤارا دەڵێی شێری تـووڕەیە لێمـان دەڕوانـێ، کەس ئەو پیاوەی بەو تووڕەییە نەدیتبـوو، بە بـێ دەنگـی بەفـری بـڕی، پشت لە ئێمە و روو لەوێ، پۆلای بە دوایدا چوو:

راوەستە منیش دێم و چالاییەکەش دەناسمەوە.

داغستانی:

ئەو سەرکێشە پۆلاشی شێتکرد.

ئیمامەی پساوە بە زاری پڕکەفەوە، بێ پسانەوە:

لێیانگەڕێن، کەر بوونە، با بە کەرایەتی لە ناو بەفرێ تەرسی خۆیان گێرە بکەن، تا دەتۆپن، خۆ کەس بە قسەی کەس ناکات، من جاری وا هەبووە، بەر پرسی دووسەد کوڕە حەفتسەدی وەک ئەوانە بوومە، بە مانگ لە شوێنی سەخت و عاسێ بێ نان و ئاو شەو و ڕۆژمان کردۆتەوە، کەچی یەك دەمەقرێمان تێنەکەوتووە، یەك کەس لە قسەم دەرنەچووە، ئێستا حەفتین، پێکنایەین، کەس بە قسەم ناکات، ئێ بابە بە قسەی من ناکەن، گوێ لە وانیدی رابگرن، ئەوەتە خۆ دەبینن کوو کلکیان لە سەر پشتێ نا و تکای کەسیان بە هەند وەرنەگرت، ئەوانە بای مەرگ هەڵیگرتوون، ئاخر ئەو هەمووو بەفرە بە ئێوە هەڵدەدرێتەوە، راوەستە کوو دەکەونە بن بەفرێ و سەگتۆپ دەبن، نازانم ئەو ئایشەگوڵە ئاخر شەڕە ئەو قسەیەیەی لۆ کردا! ئاخر قسە نەما باسی کۆلکەداری چاڵی بن بەفرێ دەکەیت! کورە کۆلکەداری چی! مەگەر گوو ببیننەوە!

بە چاوێ تەماشای تووڕەیی و بێزاریی ئیمامەی پساوەمان دەکرد و چاوێکیشمان لە سەر ئەو دوو دنکە پساوەیەی تێکەڵاوی بەفر دەبوون و بزردەبوون، جاروبار بە دیار دەکەوتنەوە، چاو ماندوو بوو، خەوی دەهات، هاتینەوە دیوەخانێ، بە چای هێلدار، چای ئایشەگوڵی، خەومان رەواندەوە.

فاتیمەم تیکردەوە:

- تۆ بە منت نەگوت پۆڵای فاتیمە چی تۆیە؟

+ هەموو شتێکمە، هیچیشم نیە.

- من توانای مەتەڵ هەڵهێنانم نیە.

+ تۆ خۆت داوات لە منِ کرد مەتەڵت بۆ بڵێم!

- باشە وەڵام مەدەوە.

+ وەڵامتم دایەوە.

- ببوورە دەبوو بە زمانی شمشاڵ ئەو پرسیارەم لێتکردبا.

+ ئەوە خوایە، بەڵکوو ئایشەگوڵ شمشاڵێکت بۆ بێنێ! ئەرێ لە کوێ لێت ون بوو؟

- لەو دۆڵە رەقەی رادیۆکەی شێخم بە ملی ناسکەوە کرد، لە بای غارێ لێم کەوت، ویستم بۆی بگەڕێمەوە و هەڵیبگرمەوە، دیتم ئەنفال گەیشتێ و شکاندی، ئاوازەکانی قۆڵبەست کرد.

+ خەمت نەبێ، ئاوازی چیایی لە هەر کوێیەك بن دێتەوە.

- من خەم بۆ ئاوازە نەگوتراوەکان دەخۆم.

+ دیارە زۆرت پێیە بۆ گۆتن!

ئیمامەی پساوە پرتەوبۆڵەیەتی، داغستانی لە چۆکی خۆی دەدا، سەردەستەی مراویان شتێ دەڵی، فاتیمە چاوەڕێیە شتێ بڵێم، بەڵام من لە هەر لە خەیاڵی شمشاڵم و بە زمانی دڵ نزادەکەم:

خوداوەند، شمشاڵێ بێنە، ئەوجا دەزانی چیم هەیە بۆ گۆتن! چ داستانێکی دارستانیم من، بە قەد گەڵا زەرد و سەوزەکانی، باڵندەی وشەم گرتووە و هەڵگرتووە، لە کونی شمشاڵەوە نەبێ کەس جریوەیان نابیستێ، کتێبی من تەنێ لە رێی شمشاڵەوە دەخوێندرێتەوە، من شمشاڵم نەبێ مەهناز بە چی دەمناسێتەوە، بە

چی تریفه به باوکی ئاشنا دەکاتەوە، شمشاڵ نەبێ هەرگیز مەهنــاز لە بەر تــریفه بــۆم رووتنــابێتەوە! خــۆزی هەر لە نــاو رەشماڵی خێلان دەمامەوە، خۆزی تا مێردەکەی مەهناز لە شەڕی ئەنفال دەگەڕایەوە، مـن هەر پیـاوە رووتەکەی بەر مانگەشـەوی ئەوێ دەبووم، خۆزی تا تریفه دەمی دەنـا بە مەمکـی مەهنـازەوە من هەر شمشاڵژەنەکەی زارگەلی دەبووم و وەخـت و ناوەخـت (لە ناو رەشـماڵی خـێلان) م دەژەنـی، ئەگەر شمشـاڵێکم دەبـوو، دوورنەبوو پەشـیمانی بـخەمە دڵـی ئەو دوو پیـاوەی خەریکـن لە بەفرا گۆڕ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن، ئەو دوو پیـاوەی هەردووکیـان موریدی شمشاڵن، یەکیان بۆ هەر پەنجەیێ، بۆ هەر فـووێ، بەرز یـان نـزم، سـروودێکی لە زاریە و لە بـای شمشـاڵێ دەشـنێتەوە، ئەویدی بێدەنگ بێدەنگ لە ئاوی وەسـتاو بێـدەنگتر، خـۆی بـۆ شمشاڵ هەڵدەخا و وەك شەکر ئـاوازی تێـدا دەتـوێتەوە و تـامی بێدەنگیەکەی شـیرینتر دەبێـت، سیمای بێـدەنگیەکەی لە جـاران جـوانتر خـۆ دەنـوێنێ، ئەگەر شمشــاڵم دەبــوو، بەو نـاوەختە، نەغمەی مەستوورەییم دەڕژاندە بای بەفر لێنیشتووی قەندیلێ و با دەیبرد دەیبرد، مەستوورە لەبیابـانی ئەنفـالیش دەسبەسـەر بـێ، لە فێنکایی بەفرەوە نەغـمەی شمشـاڵی مـن دەبیسـتێ، مەسـتوورە لە بۆسەی براکانیشیەوە هەناسەبڕکێی پێکەوتبێ، هەڵدەفڕێ و لە ناو جۆلانەی بای شمشاڵ دەنیشێتەوە.

شمشــاڵێ خوداوەنــد شمشــاڵێ! بــا دەنگــم بگــاتە گــوێی ئایشـەگوڵ، ئێسـتا لەوێ لە نێـوان دوو گـۆڕدا، خەوێکـی قـووڵ خەوتووە، خەون دەبینێ، لەو خەونەدا کـوڕە پـارچەڵەکەی گەمە لەگەڵ بـرا بە سـەرپێنەکەوتووەکەیدا دەکـات، ئەوەتـا خەریکـی گــاگۆڵێیە، ئەوەتــا دەســتی دەگــرێ و دارە دارەی پێــدەکات،

دەبێت ئایشەگوڵ لەو خەوە خۆشە بکەم، ئاگای لێنیە سەربازەکانی ئەنفال پێ بە پێ لە گۆڕستانەکە نزیك دەکەونەوە، سەگەکانی ئەنفال بۆنی ئایشەگوڵیان کردووە، ئەها وا دەچنە پێشێ، ئایشەگوڵ دوورە زۆر دوورە لێم، تەنها دەنگی شمشاڵ دەیگاتێ، خەوەکەی زۆر قووڵە، لوورەی ئەنفالیش هێندە ڕۆناچێ، شمشاڵ نەبێ هیچ دەنگێ خەبەری ناکاتەوە.

ئای بۆ شمشاڵێ! هەر من دەزانم کۆستی بووکەکەی پیری شالیار، چ کۆستێکی چڕە، ئەو کۆستە بە شمشاڵ نەبێت ناڵاوێتەوە، دەبێت بەو پەنجانەم، شیوەنێ بگێڕم هیچ کام لە خوشکەکانی گاوانی کورد، شیوەنی وایان نەگێڕابێ، شیوەنێکی شمشاڵیم پێیە من.

خوله ئێستا لەوێ سەرگەرمی گەرمە شەڕە، لە کونی تفەنگەوە تەماشای سیمای ژیان دەکات، لە تەقەی تفەنگەوە، دەنگی ژیان دەبیستێ، ماندووە، ماندووتر لە شەڕ، دەبێت لە ڕێی هەورەوە گوێی لە دەنگی پەنجەکانی من بێت، با فووێکی درێژ، درێژتر لە شەڕەکان بە شمشاڵدا بکەم و بە هەوردا بینێرم، بەری ئاسمانی شەڕ بگرێ و بەرینەدا، با دەنگی من داباریێت بە سەر شەڕگەدا و خوله رووتبێتەوە لە واتای شەڕ، ماندووە، پێویستی بە پشووە، بۆوەی شەڕ پشوو بدات، دەبێت تا عەیامەکی درێژ هەر فوو بە شمشاڵدا بکەم و با پشوو بدات من پشوو نەدەم، ئەو پەنجانەم چەندی تینووی سینە و بەرۆکی مەهنازن، سەد هێندە تینووی کونە پڕ لە ئەوینەکانی شمشاڵن.

**ئیمامەی پساوە، لە خەیاڵی شمشالیم دەپسێنێتەوە و بە هەوکی پڕ گریانەوە:**

لەوە پتر بەرگەی کەرتبوون ناگرم، بەرگەی پسانەوەی بێ پسانەوە ناگرم، لەوەتەی هەم لە پسانەوەدا پیاسە دەکەم، ئیدی بەسە، پسانەوە بەسە! دەبێت بچین بیانهێنینەوە، ئەگەر نەهاتنەوەش، با ئێمە لایان بمێنینەوە و هەموو پێکەوە بەفر هەڵدەینەوە.

داغستانی:

ئێ هەر هەڵدەوە! دەگەیتە کوێ؟ دەگەیتە چی؟

ئیمامەی پساوە:

ئێ لێرە دەگەینە چی؟ هەڵدانەوە هەر هەڵدانەوەیە، جا لێرە بێ یاخود لەوێ، بەڵام خۆشترە پێکەوە هەڵدەینەوە.

داغستانی:

باشە خۆت کەر مەکە، لەوان کەرتر، پەلە مەکە، خۆ وازیان لێناهێنین، من دەزانم ماندوو دەبن، هۆری هۆری دێنەوە، چاوەڕێ بکە، هەر بزانە ئاشبەتاڵیان لێکرد و هاتنەوە و دەستیان لە گونی تۆ بوو.

سەردەستەی مراویان:

ئەوانە نایەنەوە، بێ کۆلکە دار نایەنەوە.

داغستانی:

تۆش پێتوایە بە کۆلکەدارەوە دەگەڕێنەوە؟

سەردەستەی مراویان:

نەمگوتووە بە کۆلکە دارەوە دەگەڕێنەوە، دەڵێم بێ کۆلکە دار ناگەڕێنەوە.

داغستانی:

یانی تەواو لەوێ دەمرن، وا گۆڕ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن، ئێمەش بچین گۆڕ بۆ خۆمان هەڵکەنین!!

ئیمامەی پساوە:

گوتم بەرگەی پسانەوەی پتر ناگرم، دەڵێی لە من تێناگەن!

سەردەستەی مراویان وەک شێت و هاری لێهاتووە، مست لە ناو لەپی خۆی دەدات و ددان دەکرۆژێ، هاواردەکات:

پسانەوە، پسانەوە، دیسان پسانەوە...

فاتیمە نەرم نەرم بەرەو لای وی چوو، خوشکانە لە تەنیشتیەوە راوەستا و دایکانە دەستی خستە سەر شانی و دۆستانە پێیگوت:

جوان تێتدەگەین، هێندە نیگەران مەبە، وایە دەردی پسانەوە گرانە، هەموومان کوشتەی ئەو دەردەین، خەمت نەبێ بە هەموو تواناوە هەوڵدەدەین، هیچ نەبێ لەوە پتر پەرتەوازە نەبین، لەوە پتر نەپسێینەوە، وەرە جارێ دانیشین، با هەندێکیدی چاوەڕوان بکەین، ئەگەر نەهاتنەوە، قسەیەکی لێدەکەین و...

سەردەستەی مراویان هێوربۆوە، چۆن هێور نابێتەوە! فاتیمە مەیلی لێبێت، زریانیش هێور دەکاتەوە، سەردەستەی مراویان رووی لە من کرد:

دەزانی ئێستا پێویستم بە شمشاڵە، ناکا ئایشەگوڵ بە شمشاڵەوە پەیدا بێتەوە.

سەردەستەی مراویان یەکێ بوو لە ئەویندارانی شمشاڵ، لە

ساتەکانی توورەیی ئەو ساتانەی لە کنە وی پیاوکوشتن ساناتر بوو لە ئاو خواردنەوە، ئەو ساتانەی لە بەرد رەقتر خۆی نمایش دەکرد، ئەگەر لەولاوە گوێی لە دەنگی شمشاڵ بووایە، دەبووە پیاوێ لە نەرمی، نەرم نەرم لە ئاو نەرمتر، سەردەستەی مراویان خۆی گێڕایەوە:

جارێك پاسەوانیم لە حەفت سەربازی دیل دەکرد، هاوین بوو، لە دەو زێیەك خۆیان دەشووشت و منیش لە دوورایی دوو سێ گوریسەوە وەستابووم، کاتێ بە پێوە دەوەستان دەمدیتن، ناوە ناوە دەمگوت: هەستنەوە، هەڵدەستانەوە، دانیشنەوە، دادەنیشتنەوە، لۆ وەی بزانم ماون و بە زێدا هەڵنەهاتوون، ئەو سەگبابانە لە خۆشووشتن نەدەبوونەوە و نەدەبوونەوە، چەند جارێك لێمخوڕین سوودی نەبوو، هەر خۆیان دەگنخاند، گۆتم هەبێ نەبێ شتەکیان لە بن سەریە، رەنگە بیانەوێ خۆ بە زێدا بدەن و لە دەستم رابکەن، ئێ، بەلایەکیدی هەندێکیدی لێیان چوومە پێش، ئەوان منیان لێوە دیار نەبوو، دیتم لە پەنا بەردێك کە نیوەی لە وشکانی بوو نیوەی لە ناو ئاوێ، یەکێك یەکێکی داوەتە بەرێ، یەك دووەکیشیان بە دەست خەریکن... گەڕامەوە شوێنی خۆم، هاوارم لێیانکرد:

هەستنەوە.

هەر حەفتیان هەستانەوە، دیار بوو ئیشی خۆیان تەواو کردبوو، پێمگۆتن:

ئەوە لۆ خەلاس نابن، خەریکی چین؟

ئەوەی قووچی کردبۆوە، گۆتی:

نویژمان دەکرد.

چاوم چووە پشتی سەرم، گۆتم:

سەگباب قووندان لە کن تۆ نوێژکردنە!

کلاشینکۆفم لێراکێشان، سوێندم لێخواردن کە وەکو سەگ دەیانتۆپێنم، خاتر ئەللا خاتر ئەللا دەگەیشتە ئاسمانێ، بەلام نەگەیشتە کنە من و من بڕیاری کۆتاییم دابوو دەبێت بیانکوژم، ئێ، هەر حەفتیانم بەرووتی پشت لە وشکانی و ڕوو لە زێ ڕێزکردن، ئەوان هەر خاتر خاتر و ئەللا ئەللایان بوو، ئەمنیش بیرم لەوەی دەکردەوە لە چەپەوە دەست پێبکەم یان لە ڕاستەوە، هێندەم دیت قوونی ئەو سەربازەی لە لای چەپەوە وەستابوو، بە خڕ و خڕی هاتە ناو سێرەی ئەو تفەنگەی وا لە دەستمە، نازانم باوەڕدەکەی یان نا، لە سەر یەك تڕ و فسی مابوو، پەنجەی پێوە نێم، شمشاڵ گەیشتێ و دەستم شل بوو، شل شل، تفەنگ لە دەستم بەربۆوە، نازانم تۆ چۆنت زانی، من وا خەریکی کوشتنی شەش سەربازی دیلم و لەو چرکەساتە ترسناکەدا چۆن بۆت هات فوو بە شمشاڵدا بکەیت! هەبێ نەبێ خودا لە دڵی تۆی نا و پێیگوتی زووبە فوو بە شمشاڵدا بکە، ئاخر دەزانی ئەو بەستەزمانانە چەند کەڕەت خاترو ئەللایان بە زارێدا هات و ئەو دۆلە گەورەیان پڕکرد لەو دوو وشەیە، بەلام ئەمن فشەم بەو هەموو خاترە هات و خاتری خودام نەگرت، ئێ خۆ من لە سەر خودا بە جواب هاتم، دەزانی چ سووکایەتیەکیان بە خودای گەورە کرد! دیارە خودا بە خۆی باشتر دەزانی چ دەکات، بەلام هەردەکات خاتری خودام گرتووە، وانیە؟ ئەدی هەر خودا نەبوو وایکرد تۆ شمشاڵ بژەنی؟ دەزانی دوایی بیرمکردەوە، باشنەبوو ئەو سەربازانەم نەکوشت، ئێ باشە من هەقم چیە، با بۆ خۆیان هەر وا بکەن، من هەقم چیە، ئێ ناهەقیشیان نەبوو درۆ

بکەن، خۆ نالێن وا سەربەسەرانێ دەکەین.

لێرەوە تا ئەوێ
هەر تەڕاییە دادەکا و
لە گیانمان لەرز لەرز لەرزین دەڕوێ
ئەی خوداوەندی تارنشین
لە دەروازەی ئەشکەوتێ
چرایێ هەڵکە و
بە کەزیی هەورا هەڵیواسە
بنێرە بنێرە چرایێ بنێرە
پەنایەکی کزرمان پیشاندە و
بە خەوی ئەشکەوتیمان بسپێرە

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٣

لەوەتەی هەم هەر بۆ خۆمم شمشاڵ ژەنیوە، لە سەر خواستی کەس فووێکی شمشاڵی لە لێوی منەوە دەرنەچووە، لە سەر خواستی کەس پەنجەی من بە کونی شمشاڵێ نەکەوتووە، دەیانگوت:

تۆ تکای کەس بە هێند هەڵناگری، لە زۆر ساتدا لە بەرد رەقتری، خوداوەند بە هەڵە شمشاڵی بە تۆ بەخشیوە.

رۆژێ گەڕیدەیەکی ئەلەگەزی، بە قەد چیای ئەلەگەزێ تکای رووباریی بە سەرمدا رژاند، کەچی بە بەردی مامەوە و نەبوومە ئاو، زۆریش خەفەتم لەوە خواردووە، کاتێ کەسێ داوای لێمکردووە ئاوازێکی بۆ بژەنم و نەمژەندووە.

جاری وا هەبووە، شمشاڵ گازیکردووم و بێ ئەوەی بزانم لە کوێم و کات چ کاتە و چ زیانێکی لێدەکەوێتەوە، دڵی شمشاڵم نەشکاندووە و تێمهەڵکردووە، تێهەڵکردنێ، شاخە و شاخ، دۆڵا و دۆڵ، بە باڵی با باڵی گرتووە و بە دەنگی ئاو دەنگیداوەتەوە، وەبیرمدێ شەوێکی هاوینی بوو، بە دەو زێیەکدا بە پێچەوانەی ئاو دەڕۆیشتین، ئەو بەری زێ تەنراو بە لەشکری تاران، ئەم بەری زێ لێوان لێو لە لەشکرد تورکان، دەبوو لە با

خێراتر، له زێ خێراتر، له بێدەنگیش بێدەنگتر، به دەو ئاودا رێ بېڕین، زێ زۆر به هێمنی رێیدەکرد، له دنیایێ زێیەك نابینیەوە، هێندەی ئەو زێیه بێدەنگ و ئارام بێت، هەزار سووندت دەخوارد له جێی خۆی وەستایه، له بەرد جوولەت بەر چاو دەکەوت، لەو زێیه نەتدەدیتەوە، له دڵی خۆم گۆتم:

هەبێ نەبێ زێ مانی له رۆیشتنێ گرتووە.

تا به پارچه کاخەزێ تاقیمنەکردەوە، دڵم ئاوینەخواردەوە، ئەوجا زانیم زێ له چ غاردانێکە، با به بایایەتی خۆی نەیدەگەیشتێ، هەموو سەرمان لەو بێدەنگیەی زێ سوڕمابوو، ئێمه له رۆیشتنێ دژە زێ بووین، بەڵام له بێدەنگیدا دەمانویست وەکو وی بین، زێ چەندێ خێرا دەڕۆیشت، ئێمه لەو خێراتر، دەبوو وا بکەین، دەبوو لەو خێراتر رێبکەین، هەینێ من تەنها له یەك شت زراوم چوو بوو، ئەویش رۆیشتنی بێ ورتە، رۆیشتنی قڕوقەپی، لەو شەوڕۆیەی دەو زێدا هێندە ترسام نەبێتەوە، ترسانێ ناوی خۆمی له بیربردمەوە، ناوی زێیەکەشی له بیربردمەوە، ئێستاش نازانم ئەو شەوەی به بێدەنگی به دەو زێدا به پێی زێ رێمان دەکرد، ناوم چی بوو، نازانم ئەو زێیەی ناوی خۆمی له بیربردمەوە ناوی چی بوو، ناشزانم زێ رووەو باکوور دەکشا یان ئێمه، ئەوەی بیرناچێتەوە، زێ پێچەوانەی ئێمه تیژ تیژ دەڕۆیشت، نەمدەزانی له کوێوە بۆ کوێ دەچووین، هۆشیشم بەوە نەدەشکا، لەم بارەیەوە پرسیارێك بچرپێنمه گوێی کەسێکەوە، بیرم له ئارامیی زێ دەکردەوە، دەمگوت هەبێ نەبێ له بن ئەو بێدەنگیە، دەنگدانەوەیەکی گەورە له سەر پێیه و ئێستا نا دەمێکیدی زرمەی دێ. خۆزگەم دەخواست زێیەکی به هاتوهاوار بایە، بۆ وەی دەنگی ئێمەش له هی ویدا بزر بێ.

دۆڵێکی قووڵ، پێدەچوو قـووڵترین دۆڵـی دنیـا بێـت، پـێش ڕۆژئاوابوون، لەو سەرەوە، سەری پشتەوە، ورد ڕوانـیم، چ چیـاو چۆل و شاخ و داخێ بوو! دوندی وا بە سەر دۆڵدا دەیـانڕوانی، هــیچ باڵــدارێ لە خەونیشــدا ســێبەری بــاڵی لەوێ هەڵــنەداوە، دۆڵێکی کپ کپ، هەمیشە کپ، زێ بڕۆ، تۆ بـڕۆ، تـا ڕۆیشـتن هەیە هەر ڕۆیشــتن، ئـێمە هەشــت نــۆ دە جەنگــاوەری بە دۆڵ کەوتوو بووین، تاکە ڕستەیەك کە نـاوە نـاوە و زۆر بە ئەسـپایی دەهاتە گوێ:

پێ هەڵێنن.

بڕۆ بڕۆ هەر بڕۆ، ماندووم، برسیم، خەوم دێ! کەسـێ ڕێـی بکەوێتە ئەو دۆڵەوە، فریادڕەس لە کوێوە دێ! سەری گێژم دێنم و دەبەم، سووکە باوەڕهێنانێك بێنمە سەرمەوە نایەت، نا بڕوام نیە ئەو شاخ و داخانە پێی سەربازێکی پێکەوتبێ، تا ڕۆخی دڵنیـایی لە دڵنیایی نزیك دەبمەوە، لە بنی دۆڵەوە تا دەگـاتە سـەری دۆڵ کە نــازانم ســەرو بــن دەکەونە کــوێ، بــێجگە لەو دەســتە جەنگاوەرە دۆڵێیوە، کەس نە بە زیندوویی نە بە مردوویـی ڕێـی بێــرە نەکەوتــووە، گومــانم هەیە لە سەردەســتە کە لە قــوولایی دڵنیاییەوە دەیگوت:

ئەو بەری زێ سەربازی تـارانێ، ئەم بەرە سـەربازی تـورانێ، ئاگاداربن لە بن هەر بەردەکـی لە بـن هەر دارەکـی ئەو دۆڵە لە عەردەوە تا ئاسمانێ، سەربازەك جاشەك سێرەی گرتووە.

تا دەهـات گومـان لە قسـەی سەردەسـتە پتـر دەبـوو، پـلەی گومان پێ بە پێی ماندوویتی هەڵدەکشا، لە دلی خۆم دەمگـوت، باشە ئەو سەرباز و جاشانە دەمیـان دووراوە! کـۆخەیێ، پژمینـێ،

ترپێکــی گەورە! ئــێ خــۆ خۆیــان بە دار و بەردەکـانەوە نەبەستۆتەوە، لەو هەڵدێرە هەزار بە هەزارانە، لەو تەلان و باسکە سەختانە، خلیسکانێ، پێ لە بەرد گیربوونێ، کوڕە بەربوونەوەی تاوێرێك! نا هـێ لەو دەسته جەنگاوەرە کە بەو شەوە بەو دۆڵە سەختە بێدەنگە وەربوونە و بە پێچەوانەی زێ رێدەکەن، هیچ گیانلەبەرێ چ دوو پێ چ چوار پێ، چ باڵدار چ بێ باڵ، رێی هەڵەش بێرەی نەگەیاندوون، نازانم چ کاتی شەو بوو، وەلێ دەمدیت بەرە بەرە روونـاکی دەکەوتە دۆڵەوە، سـەرەتا وام زەنکرد بەرەبەیانە، نەمزانی مانگە و لەو لـووتکە بەرزانەوە هەڵاتووە و رووناکمان دەکاتەوە.

+ پشووێکی کورت دەدەین، بەڵام نە جگەرە نە قسە.

دانیشتین، نە کەس دەستی بۆ کیسەی توتن برد، نە کەس ورتەیەکی لێوە دەهات، ئەودەمانێ دانیشتنی بێ قسە بە قەد رۆیشتنی بێ قسە منی دەترساند، پشـووێکی باشمان دا، مانگەشەوێکی زۆر رووناك بوو، دەموچاوی یەکدیمان بە روونی دەدیت.

کوڕە توودەیی لە سەر بەردێك دانیشتبوو، بە دانیشتنەوە وەك فرفرۆکە بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە، ئەو کوڕە کەم رستەی لە دەم دەردەچوو، وشەی توودەهای تێدا نەبێت، هەر بۆیەش توودە نازناوی وی بوو.

ئاراستەی با بە ئاراستەی مانگ پشتی دابووە تیشە بەردێك و چاوی بڕیبووە ئاسمانێ، ئەو کورەش هەمیشە باسی ئاراستەی بای دەکرد، ئەمڕۆ لە کوێوە هەڵدەکات؟ بەیانی، وشەی ئاراستەشی زۆر لە سەر زاری بوو، جارێك فاتیمە پرسیبووی:

ئەریَ ئاراستە چیە؟

لەوەوە ئەو ناوەی بە سەردا برِا.

سەپانی ئالاَش کە هەمیشە ئالاَیەکی بە تفەنگەکەیەوە بەستبوو، کەسیش نەیدەزانی ئالاَی چ ولاَتیَکە، لە پەنای درەختیَکی کورتە بنە خوَی گرموَلە کردبوو دەتگوت ئالای پیَچراوەیە.

ئەستیَرەی ئیَوارە دەستی هەر لە ناو ئاویَ بوو، پیَدەچوو ئەستیَران بژمیَریَ، ئەو کچە دەتگوت بوَ ئەستیَرە ژماردن هاتوَتە دنیاییَ، خوَیشی لە ئەستیَرەی سیوەیل دەچوو.

لاتەی لات لە سەر پشت راکشابوو، لاتە عەردیَکی گرتبوو، ژانیَکی بوَماوە چووبووە پشتیەوە، دیاربوو هەر ئەو ژانەش هەموومانی لە پشوویَکدا کوَکردبوَوە، من لای خوَمەوە زوَر سوپاسی ئەو ژانەم کرد، ئاخر ئەگەر ژانی لاتەی لات فریام نەکەوتبایە، دەپسام و کەسیش نەیدەزانی، دەزانن گەیشتبوومە کویَی ماندوو بوون.

قاسەی دیموَکراتی بە پیَوە پشتی دابووە درەختیَك، پیَیەکانیشی هەر لە جوولە و سوورِانەوەدا بوون، دەتگوت پایسکل داژوا، ئەو کورِە دوو پیَی سەیری هەبوو، رووبار ماندوو بایە، ئەو دوو پیَیە ماندوو نەدەبوون، ئەو دوو پیَیە خوداوەند تایبەت بوَ روَیشتنی درووستکردبوون، هەر بە روَیشتنەوە گریَدرابوون، ئەگەر هەموو پیَیەکان وەکوو پیَی وی بان، سەرجەم مروَڤایەتی شەو و روَژ، چوار وەرزەی ساڵ، کوَچەری دەبوون و لەو دنیایەدا نە شاریَ، نە گوندیَ ئاوا نەدەبوو، دەڵیَن لەو روَژەوەی پیَشەوای دیوە وا بە ئاسمانی

سێدارەوە دەشنێتەوە، بڕیاریداوە ئاو بوەستێ ئەو نەوەستێ، من بە چاوی خۆم دیتمە لە بای ڕۆیشتنێ خەوی لێکەوتووە، قاسەی دیمۆکراتی لە هەموو مەملەکەتی چیا تاکە سەردەستەی هەڵبژێردراو بوو، کاتێ سەردەستەی پێشوو نەخۆشکەوت، لە ڕێی دەنگدانی نهێنیەوە بووە سەردەستەمان، بە زۆرینەی ڕەها دەرچوو، هەر لەوەشەوە دیمۆکراتی پێوە نووسا.

سیامەندی بزە و ئومێدی خەندە، ئەو بزە و خەندەیە کە بە تڕی سەگ و فڕینی باڵندەش پێدەکەنین، لە گەرمەی شەڕیش لە پێکەنین نەدەکەوتن، بێدەنگ لە تەنیشت یەکەوە، مەلوول مەلوول چوار مەشقی دانیشتبوون، ئەو دوو کوڕە تەنها لەو ساتانە مەلوولی بە سیمایانەوە دیار بوو کە بڕیاری قەدەخەکردنی پێکەنین دەردەچوو.

ئێ، هەریەکە و بە شێوەیەک و لە شوێنێ دانیشتبوون.

من لەسەر بەردێك کە نیوەی لە وشکانی نیوەی لە بن ئاوێ بوو، پێڵاوم لێی داکەندبوو، پێیەکم لە بن ئاوێ، پێیەکم لە سەر پێی ناو ئاوێ، ئەستێرەی ئێواران نەبێ دوو هەنگاوێ لە پێشمەوە، گەمەی بە ئاو دەکرد، دەنا ئەوانیدی هەموویان کەوتبوونە تەنیشتمەوە، پشتم لە نادیاریو ڕووم لەماڵی زێ بوو...

-ئەرێ شەوی دۆڵەکەت لە بیرە؟

-کام شەو؟

-ئەو شەوەی ناونرا بەزمی شمشاڵ!

-ئەها!

ئۆی، سەردەستەی مراویانیش وەك من گەڕاوەتەوە ئەوێ،

دەڵێی ئاگای لێیە من وا لەوێ دانیشتووم، دەترسم ئەویش شاگردی ئەسحابەکوژ بێت، سیخوڕ بێت بە سەر گێڕانەوەی سەرهاتەکانم، بە بیریهێنامەوە، ئەویش لەگەڵمان بوو، ئا، خڕو خڕ لە سەر بەردێکی خڕ خڕ دانیشتبوو، چاوم هەڵەی نەکردبێ، دەویشی دەجوولا.

سیپانی سەلماش پێیەکانی توند لە بەردێك گیرکردبوو و پشتی دابووە بنە دار بیەك، دەتگوت منداڵە و پشتی بە پشتی باوکی داوە و منەتی کەس نازانێ، ئەو سیپانە کوڕی ئەو سەلمایەیە کە هەتا نەوزی دڵبەری مەلای جزیریە، ئەو سەلمایەی سووندی بە مەلەکی تاوس خواردووە کە پرچی سپی بهۆنێتەوە و شوو نەکات، جزیرە و بۆتانیان بە ورد و درشتەوە سوێندی دەخۆن کە دەستی هیچ پیاوێك بە مەلای جزیریشەوە بە سەلما نەکەوتووە، هەندێك دەڵێن:

سەلما، سیپانی لە رێی سیپانێ هەڵگرتۆتەوە و بۆ خۆی بەخێوی کردووە.

هەندێك دبێژن:

سیپان لە زگی سەلمایەوە هاتۆتە دنیایێ و کوڕی حەقی ویە و بابی سیپانیش مەلای جزیریە، بەڵام دەڵێن مەلا لە دوورەوە و بە شیعر زگی سەلمای پڕ کردووە.

سیپان دەڵێ:

من کوڕی راستەقینەی شیعرم.

قسەیەکیدیش لە بارەی زگپڕبوونی دایکی سیپانەوە لە سەر زاران بوو، گوایە لە زاری سەلماوە بیستوویانە:

من ئەو نیوەڕۆ هاوینیەی کە لە گۆماوێك مەلەم کرد، سیپانم کەتە زگی، پێش من بە ماوەی جگەرەکێشانێ مەلای جزیریش لە هەمان گۆماو مەلەی کردبوو.

خەو بەرینەدەدام، باش بوو کزە بایەکی سارد هەڵیکردبوو، لە پەنجەرەی زستانەوە دەهات و سووکە لەرزی دەخستە گیانی ئەو شەوە هاوینیەی ئەوێوە، کزە با موچڕکەی دەخستە وەنەوزەکانمەوە، خەونیشم بە خواردنەوە دی، ئەو شمشاڵەی لە لێم کەوت و ئەنفال بردی، هەمیشە لە بەر پشتم بوو، زۆر جار تفەنگم لە بیردەکرد، بەڵام نایەتە بیرم بۆ جارێکیش شمشاڵم لە جێیەك بەجێهێشتبێ.

شمشاڵم بە دەستەوە بوو، پەنجەکان جێگەی خۆیان دیتبۆوە، شمشاڵ لە لێوم نزیکدەبۆوە، دوورم دەخستەوە، نزیکدەبۆوە، شمشاڵ و پەنجە و لێو ئاوێزانی یەکدی بوون! ئەوەتا (مەستوورەی مەستان) لەگەڵ زێدا دەڕوا، باڵی بای گرتووە، بە شاخانا هەڵدەگەڕێ، بەرزدەبێتەوە، دەگاتە دوندە بەرزەکان، هێندەم لە بیرە شمشاڵیان لە دەستم راپسکاند:

کوڕە تۆ شێت بووی! دەڵێین وس بە لۆ وس نابی؟

تێگەیشتم چ کەتنێکی گەورەم کردووە، چ ئاژاوەیەکم ناوەتەوە، ئەو ساتانەی شمشاڵ دەژەنم، لە کەڕان کەڕترم، جگە لە شمشاڵ گوێم لە هیچ دەنگێك نابێت، جا با ئەو دەنگە رووخانی ئاسمان بێ.

هێندەی نەبرد ئەوەی نەدەبوو ببێ بوو، گوللە بە گوللە دەکەوت، بووە هاتوهاوارێك، هەموو دەنگەکان تێکەڵی یەکتر بوون، دەنگی جاش، دەنگی سەرباز، دەنگی پێشمەرگە، کەس

کەسی نەدەناسیەوە، هێندە ترسام، نهێنیی شەویشم بیرچوو، لە بەدبەختیش شەو تا دەهات روونـاکتر دەبوو، مانگ تەواو دابەزیبوو، دەتگوت نیازی نیشتنەوەی لە دڵ دایە، تەقوهۆڕێ بوو، رەنگە نیوەی فیشەکی دنیایێ لەو شەوە مانگەشەویە و لەو دۆڵەدا و بە سەر ئێمەدا تەقیینەوە، شەو شەوی تەقە بوو، دەبووایە تەقە بکەیت، ژیان لە تەقەدا دەدرەوشایەوە، لە ژیانمدا هێندە تەقەم نەکردبوو، ترسانێ ترسابووم، کەس وا نەترساوە، ئەوەی پێیدەڵێن ترسی باڵا، من لە سەر سەری ئەو باڵایە وەستابووم، لە ساتەکانی ترسان تەنهاو تەنها تەقەکردنە ئەگەر فریاد کەوێ و کەمێ دڵت بداتەوە، بێ وەستان تەقەم دەکرد، تەقەم لە دنیا دەکرد، فیشەک برا، هەیە و نیە فیشەکە حیزەی سەر شانمە و تەواو، هاوارمکرد:

فیشەکم نەما.

دەنگێک:

هاوار مەکە، هی هەموومان لەخشە خشە.

دەنگێک نەمناسیەوە:

تاکە رێگە زێیە زێ.

جاشەکانیش بەردەوام هاواریان دەکرد:

خوێڕینە، خۆ رادەستکەن، دەنا دایك و خوشکتان...

قاسەی دیمۆکراتی کە لە ناو دنیایەك دەنگ دەنگی ئەوم دەناسیەوە:

راوەستن خوێڕینە، دەبێت بە قون دڕاوی یەکە یەکەتان بنێرینەوە.

لە لای ئـێمەوە تەقە بـڕا، تـرس تەواو دایگـرتم، بیـرم لە فیشەکەکەی سەر شانم دەکردەوە.

کوڕینە، خۆ بە زێدا بدەن.

زێ خـۆت بگـرە هـاتین، هێنـدەم لەبیـرە لە نـاو ئـاوێ هەر گوللە بـوو لە تەنیشـتم لە پێشـم، لە بـن پێم، چـزەی دەهـات و دەکوژایەوە، جار جارە لەگەڵ زێ دەڕۆیشـتم، هەنـدێ جـاریش بە دژی زێ، نـاوە نـاوەش قەدبـڕ زێـم دەبـڕی، نەشـمدەزانی کەناری ئارام کەوتۆتە کیهە لا، نازانم نە دەنگی تەقە نەمابوو، نە لەبەر قرچە قرچی ددانەکانم گوێم لێیان نەبوو، ئەو زێیە هـاوینیە دەتگوت لە ساردواوی ماڵی زستانەوە رژاوە.

ئێستا مراویەکی تەنیـام لە نـاو زێـدا، مراویەکـی دابـڕاوی بە نەفرەتکـراو، ئەو شـەوەم لە نـاو زێ کـردەوە، دنیـا رووناکـایی تێکەوتووە، جاش و پێشمەرگە لێکدی جودادەکرێنەوە.

ئەودەمە ماڵی من تەنکاوی بوو، تەنکاویەکی تەواوێك دوور لە کەنار، ئاو دەگەیشتە دامەنم، بەردێکم دیت بە ئاستەم سـەری بە دەرەوە بوو، ئەویش وەك من تامەزرۆی هەواڵ بـوو، لە سـەر شـانی لێـی دانیشـتم، دۆڵ کشـومات، بێـدەنگتر لەو سـاتانەی کە هێشـتا شمشـاڵ تێیهەڵنەکردبـوو، ئێـرە کـوێی دۆڵە! دۆڵ کـوێی دنیایە! هاوڕێکان چیان بە سـەرهات! سـەربازەکان، جاشـەکان لە کوێن! کوا تفەنـگەکەم لە کـوێیە! ئەدی کـێ تـاکە پێڵاوەکەم! ئای دەفتەرە جگەرە و کیسەی توتن! ئەوە چۆنە زێ کۆڵەپشت و شمشاڵەکەمی نەبـردووە! ئەو شمشـاڵە سـەر بە گۆبەنـدە لە نـاو کۆڵەپشتەکەمەوە جوان جوان بە گاڵتەوە تەماشام دەکات.

رقی دنیام لە شمشاڵ هەستا، بە نەفـرەت بیـت شمشـاڵ وەك

چۆن منت بە نەفرەت کرد، ئای هاوڕێکانم، ئێستا لاشە ساردو سڕەکانتان لە کوێی کەنار کەوتووە و... ئای شمشاڵی سەرەخۆرە! سەری هەمووانت خوارد، هەر من مامەوە، منی تەنیا، منی بێ تفەنگ، من و فیشەکێکی ڕووت و قووت.

وەرە شمشاڵ مەرد بە و سەری منیش بخۆ، بە نیازی تامکردنی مەرگ فووم بە شمشاڵدا کرد دەزانم بەندی یەکەم مەستوورە بوو، حەزمدەکرد لە چڕینی مەستوورە، ڕێژنە گوللە بێ و زێ بمگەیەنێتە لای هاوڕێکانم، نەهات، لە چاوەڕوانی مەرگ بێ پشوو شمشاڵ دەژەنم، بەند لە دوای بەند بەندی چیایی دەچڕم، لە ناو زێ شمشاڵ دەژەنم، نازانم لە کوێوە دێ و بەرەو کوێ دەچێت و هاوڕێکانمی بۆ کوێ برد، شمشاڵی ئەو جارەم تایبەتە بە دیتنەوەی خۆم لای هاوڕێ بە ڕووباردا چووەکانم، شمشاڵ بۆ هاتنی یەك گوللەی گەرم گەرمە، لە پۆلووی دۆزەخ گەرمتر و لە مندا ساردبێتەوە و بلێ چز چززززز... شمشاڵ بۆ مەرگێکە لە ڕووبار خێراتر بگاتە سەرم و بێ سڵاوکردن دەستم بگرێ و بمگەیەنێتە هاوڕێکانم، ئەوانەی بێ خواستی خۆیان من لە ڕێی شمشاڵەوە ڕەوانەی ئەوێم کردن، با گوللەیەك بێ و هەڵمبگرێ، بارم سووکە، نە تفەنگم لایە نە کیسەی تووتن، بارم سووکە، خۆم و کۆڵەپشتێکی گچکە و شمشاڵێکی مەرگاوی و تاکێ پێڵاوی دڕاو، هەڵمگرە گوللەی جوان هەڵمگرە، سووکم، زۆر سووکم، ماندوو نابیت، کێشی پووشکەیەکی تەڕم نیە.

شەوم بەرێکرد، دنیا ڕووناکە، گوللە هەر نەهات، دنیایەکی چەند کشوماتە، نە دەنگێ، نە جوولەیێ، دەڵێی دنیای سەردەمی پێش هاتنە گۆی شمشاڵە، دنیای شەوی چووی، بە جیاوازیی

کاتەوە، بە جیاوازیی منی ئێستا و منی هەینیێ، رەنگە مەرگ گوێی گران بووبێت و باش نەبیستێ، نابیستێ، پڕ بە شمشاڵ بانگیدەکەم نابیستێ، مەرگ گوێی گران بووە، دەبێت تیژتر، بەرزتر فوو بە شمشاڵدا بکەم، دەبێت بچمەوە سەر ئەو ئاوازەی زووتر بە گوێی مەرگ دەگات.

لە سەر بەردێ کە لە ناوەندی رووبار بۆ هەناسە وەرگرتنەوە سەری دەرهێناوە، بە دانیشتنەوەوە، شمشاڵ دەژەنم و خولدەخۆمەوە، وەك میلی سائەت خول دەخۆمەوە و چرك چرك سات دەژمێرم، ئەو ساتانەی بۆ گەیشتنی مەرگ پێویستن، چاو دەگێرم، بە ئاودا چاو دەگێرم، بە کەناردا چاو دەگێرم، بە قەدپاڵ و دوندەکانی هەردوو بەردا چاو دەگێرم، کەس دیار نیە کەس، دەزانم جەنگاوەرکان ئاوە و ئاو چوون، بەڵام نازانم ئەو هەموو سەرباز و جاشەی شەوێ بە چیدا چوون! بێ وەستان، بێ پسانەوە شمشاڵ دەژەنم، سوێندم خواردووە ماندوو نەبم، رووبار بوەستێ، من نابێ بوەستم، کەنار بپسێتەوە، من نابێ بپسێمەوە، من ماندوو نابم و شمشاڵ دەژەنم، تا گوللەیەك نەیەت و نەمخاتە ئاوەوە و هەڵمنەگرێ، من هەر شمشاڵ دەژەنم، هەرچی ئاوازی مەرگ هەیە، هەرچی مەرگ پێی خۆشە، دەیژەنم، ئەو دۆڵە ئەو رووبارە، ئەو کەنار و لاپاڵ و دوندانە پڕ پڕ دەکەم لە ئاوازی مەرگ، چاو لە دوندە هەرە بەرزەکان دەبڕم.

دەڵێن مەرگ لە بەرزاییەوە دێت، با بێت رێکاورێك بۆم بێت، نا من ناوێرم چاو لە چاوی مەرگ ببڕم، لە خۆی ناترسم، بەڵام چاوی پڕ ترسە، چاوم شۆڕدەکەمەوە، دەیهێنمەوە سەر رووبار و بن کەنار، من هەمیشە حەزم لێبووە لە شیرنەی خەوێ مەرگ بگاتە سەرم، بەڵام ئێستا کوا کاتم هەیە بۆ خەوتن، هەتا

زووه دەبێت بمرم، هاوڕێکانم چاوەڕێمن، ناچارم لە گەرمەی شمشاڵ ژەنینـدا بمرم، رەنگە ساتەکانی شمشاڵ ژەنینیش جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبێت لەگەڵ ساتەکانی خەوتن، لە بیرمە زۆر جەنگاوەر بە منیان گوتووە:

تۆ لەو ساتانەی شمشاڵ دەژەنی، بە شێوەیەك لە دەوروبەر و دنیا دادەبڕێی، جلوبەرگیشت لەبەربکەنەوە، ئاگات لێنیە.

دەیانگوت:

شمشاڵ ژەنینی تۆ خەوێکی قورسە بە هیچ خەبەرت نابێتەوە، خەوتن نیە، چ جاوازیەکی لەگەڵ مردن نیە، هەر مردنێکە بۆ خۆی.

بە دەوری خۆمدا دەخولێمەوە، چاوم لە سەر رووبارە، ئەها..! چاوم هەڵەتەی نەکردبم، بێخەوی بینایمی سەروبن نەکردبێت، لە ناو ئاوێ شت دەبینم، شتێك وا رووەو من دێت، ماسیە! نا هەو نیە، تەنها سەری دیارە، دەڵێی زەلامە!

ئەوە خەونە یا راستی! هەر سەری زەلامە لە ناو ئاوێ بە دیار دەکەون، ئەوەتا سەرەك لەولا یەکیدی لەم لا، لە سەرێ لە خوارێ، هەموویان رووەو من دێن، ئەها دەڵێی بێچووە مراویی پەرتەوازەن و گوێیان لە دەنگی دایکیان بووە، هاتن هەر هەموویان لە دەورم خڕ بوونەوە، ئەوانەی لە چاو تروکانێکدا بزرمکردن لە چەند چاوتروکانێکدا دۆزیمنەوە، سەردەستە گوتی:

دەی با بچینە ئەو بەر.

چووین، خۆمان دا بەر رۆژێ، من سەری خۆم

شـۆڕکردبۆوە، تنـۆك تنـۆك شـەرمەزاریم لێـدەتکا، دەمبیسـت دەیانگوت:

لە مەترسی دەرچووین.

روویان لە من کرد:

گـوێ مەدێ، ئیشـەکەت بـاش کەوتەوە، شمشـاڵ ئەگەر پەرتەوازەشمان بکات، جوانتر و رێکتر خرماندەکاتەوە.

**دیارە نەهاتنەوە، خۆتان جوان بپێچنەوە، بە دوایانـدا دەچـین، بەسە پسانەوە.**

**ئیمامەی پساوە، بە دەنگێک وای گۆ، داغستانیش هاتە رایێ و نارەزایی دەرنەبڕی، فاتیمە گوتی:**

**نابێ، چیدی بپسێینەوە، دەچین.**

تا خۆمان دەپێچینەوە و لە بەفر دەدەین، دەچـمەوە لای تـاکە پێڵاو و تاقە رەشماڵ.

نـان نـان، چـا چـا، ماسـت، پەنیـر، ژاژی... لە دڵـی خـۆم دەمگوت:

ناکا بگەینە رەشماڵێک تاکە پێڵاوێکی زیادیشیان هەبێت.

پـێڵاو بەجێهێشـتن، چ شـەرمێکی گەورەیە، زۆر کەس ئامادەن سەر بەجێبهێلن، بەڵام پـێڵاو نـا، مـن لەوێـوە نـاوم بـووە یەکتاك، زۆری برد تـا ناوێکیـدی جێـی یەکتـاکی گـرتەوە، ئەو پـێڵاوە لە کـنە مـن زۆر ئەزیـز و لە بەر دڵان بـوو، رەنـگە خۆشەویسـتیی ئەو پـێڵاوە لەوەوە هـاتبێتە دڵـم، پـارەی خـۆم

پێینەدابوو، بەری رەنجی ئارەقەی نێوچەوانی خۆم نەبوو، لەوەدا پێچەوانەی زۆر کەس بووم، بەوەی هەر شتێك پێوەی ماندوونەبم و بێ پارە دەستگیری بکەم، پتر رێزی دەگرم و دەستی پێوە دەگرم و خۆشمدەوێ، بەر لەوەی رێی دوور بگرمە بەر، پێلاوێکم لە پێ بوو بەرگەی رۆژە رێیەکی نەبوو، گیرفانیشم لە پێلاوەکەم نابووتر بوو، چ بکەم باشە! غیرەتم دا بەر خۆ، روو لە کەسێك بنێم و پێلاوێکی رێی دووری پێبکرم، لە گەراج راوەستابووم، گەراجی بێ داد و کونەگورگ.. روو لە کێ بنێم باشە! ئەگەر دەستیان بە روومەوە نا!

مەلایێ هەبوو، مەلای رەشیان دەگۆتێ، بابەلباب هەر مەلا بوونە، یەکەم مەلا کە لە چیا پەیدابووە، باپیرە گەورەی ئەو مەلایە بووە، مەلا زۆر دینناس و سەرناس بوو، بەر لەوەی رووی لێبنێم دیاربوو دڵی منی خوێندبۆوە، دەستمی گرت و گوتی:

بخوازە، چی دەخوازی.

رێی دوورم لەبەرە، پێلاوم نیە.

گوتی:

هەی لە منت نەکەوێ.

پارەی دوو سێ پێلاوی رێی دووری خستە بەرکمەوە، بێ ئەوەی بپرسێ: رێیەکت رێی دینە، یان بێدینان.

بە هەموویان دڵمیاندەدایەوە، بەرێکەوتین، یەك دوانێکیدیش وەك من بێ تفەنگ بەرێدا دەرۆیشتن، بەڵام جگە لە من کەس نەبوو تاکە پێلاوی بەجێهێشتبێ.

سەری چەند ژەمان بوو، زارمان تامی زادی نەکردبوو، لە

بەدبەختی ئێمە نە ئاژەڵێك نە باڵندەیەك چ ئەوانەی چەقزیان لە سەرە چ ئەوانەی لە سەریان نیە، نە لە عەرد نە لە ئاسمان نەدەبینران، چۆلەوانیەك بوو ئەوەی گیانلەبەرە ڕێی بەو شوێنە نەکەوتووە، بڕۆ برۆ، وێنەی گورگی برسی بڕۆ، بە چاوی باز لە ئاوەدانی بگەڕێ..

ئۆخەیش، لە قەدپاڵێ تاقە رەشماڵێ دەرکەوت.

پیاوێکی بە تەمەندا چووی کەڵەگەتی لاواز، بە شەلە شەل، گۆپاڵ بە دەستەوە و تفەنگ بە شانەوە هاتە دەرێ، ژنێکی گەنج و سێ چوار منداڵی ورتکە و پرتکەش.

+ کێن ئێوە؟ بوەستن، نێنە پێش.

-پێشمەرگەین، لە شەڕی سەرباز و جاشان دێینەوە.

خۆی دایە پەنای بەردێک و سێرەی لێگرتین:

+ ئێوە جاشن، بەو خودایەی لە سەر سەرانە یەک بست بێنە پێشێ، قل قل هەڵتاندەگرم.

- جاش نین، برا جاش نین، ئەگەر دەڵێی چەکەکانمان دادەنێین و بێ چەک دێین.

کابرا بە گوێیدا ناچێ، سەنگەر بەرنادا و هەڕەشەی کوشتن دەکات، ژنەش تفەنگی هێنا و سەنگەری لێگرتین و بە دەنگێک چ پێنەدەچوو لە هەوکی ژنەوە بێتە دەرێ:

کوڕە هەی جاشینە، هەی ئەنفالچینە، هەی حەرامزادە و بێ نمەکینە، بێ حەیاو ناموسینە، خوێری سەرسەرینە، ئێستا هەمووتان دەکوژم، هەر ئەنگۆن تا لە ماڵی مە دەخۆن، هێندەی

گایەك دەخۆن، دوایيش خۆ رادەستدەکەنەوە و بە گرتنمان دەدەن، مێردەکەمتان لە کوێ کوشت؟ تا حەفت دەژمێرم، نەکشێنەوە، لە خوێندتان دەگەوزێنم.

کەمێ دوورکەوتینەوە، خۆمان خستە پەنای بەرد و بنەدارەوە، چ بکەین، برسێتی برسێتی، لە رێی خوێنیش ناگەڕێتەوە.

دوورتر کەوتینەوە و لە سەر برسێتی، کۆبوونەوەیەکمان لە بارەی برسێتیەوە بەست.

- با هەندێ تەقەی هەواییان بە سەردا بکەین، دەترسێن و ملدەدەن.

- وا باشە گوللەیەک لەو سەگبابە بدەین، بەڵام بە نیازی کوشتن نا.

- با خۆمانیان لێ نزیکبکەینەوە و پەلاماریان بدەین و چەکیان بکەین.

پێشنیار زۆر بوو، هەر جەنگاوەرە و شتێکی دەگۆ، نەدەگەیشتنە یەک، هێندەی نەما لە ناوەخۆ چەک لێکدی راکێشن، من گوتم:

بە قسەی من دەکەن، با چەکەکانمان ئەها لێرێ‌هێ، دوور لە خۆمان لە سەر یەك دابنێین و بە خۆشمان رێك بەرانبەر رەشماڵ بە مەلوولی دانیشین، ئەویدی بۆ من لێگەڕێن.

جەنگاوەری برسی ناچارە زۆر رێگر بگرێتە بەر بۆ تێربوون، بە نابەدڵی چیم گوت، وایان کرد، ژنە و پیاوەش هەر وا لە سەنگەرن و هەڕەشەی کوشتن دەکەن.

له سەر برسێتیەوە فووم بە شمشاڵدا کرد، لە سەر برسێتی پەنجەکانم دایە شمشاڵ، لەبەر برسێتی بڕواناکەم دەنگی شمشاڵ هێندە ڕۆیشتبێت، نازانم چەند بەندم چڕی، نازانم لە ڕێی شمشاڵەوە چەند وردە فرمێسکم بۆ خۆم و تاقە ڕەشماڵ هەڵوەراند، هێندە دەزانم دەستی ژنێك لە سەر شانم بوو:

وەرنە ژووری، با نان بخۆین.

پیاوی یەک پێ، پێیەکی لە گۆزینگیەوە پێوەنەمابوو، دیتبووی پێیەکم بێ پێڵاوە، گوتی:

هی چەپت بزرکردووە یان ڕاست.

بە شەرمەوە گوتم:

ڕاست

گوتی:

بزانم بە پێم دەکات!

پڕ بە پێی بوو، گوتی:

پێڵاوەکانمان دەگۆڕینەوە.

گۆڕیمانەوە، تاکێکم بە جووتێ گۆڕیەوە، تێروپڕمان خوارد و ماڵاوا ڕەشماڵ، لە ڕێ، ئاراستەی با کە دەنگێکی شمشاڵی هەبوو، ئاوڕی لە ڕەشماڵ دایەوە و تێیهەڵکرد، گۆرانیەکەی هەر زوو بووە گۆرانیی جەنگاوەر:

**لە مانگەشەودا شمشاڵ هەڵیکرد**

**چیلکە داری دەم ڕەشەباین و**

بە زێدا دەچین
شمشاڵ بوو هەڵیکرد و
لە ئاودا پەرتەوازەی کردین
بەرەبەیانە شمشاڵ هەڵیکرد
بنج بنج پەرتەوازەیی کۆدەکەینەوە
دەسك دەسك دێینەوە
بەرەو ماڵی شمشاڵ دێینەوە
ئەوە شمشاڵە
تەڕ تەڕمان دەکاو وشك وشکمان دەکاتەوە
فوویێ لە شمشاڵ پەرتمان دەکات
پەنجەیێ لە شمشاڵ بانگمان دەکات و
لەوێ خڕدەبینەوە
درەنگە شمشاڵ، درەنگە
ڕەشماڵت کردە لانکی منداڵی
کوشتەی خەونێکی ڕەشماڵیم
لایلایەکی دایکانە، با خەو بمباتەوە

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٤

- ها ها وا!!!!!!!!

- کوڕە، ئەوە هاوڕێی گیڤارایە بانگدەکات.

- وس بن وس.

- وەرن وەرن، دیتمانەوە دیتمانەوە.

- دیتیانەوە! هەڵێن.

**یەکێ‌ هەموومان غارمان دا، لە ناو بەفرێ‌ ساتمەمان لە یەکدی دەکرد، بەسەر یەکا بەردەبووینەوە، لە پێش هەمووان گەیشتمێ‌.**

- ها چ بووە!

- کوڕە، کۆلکەدار، کۆلکەدار...

کۆلکەدار چ کۆلکەدار! هەر کۆلکەدار بوو لە سەر کۆلکەدار.

- ئەو گونیە چی تێدایە؟

- برنجە، ئەوەیان گوێزە گوێز.

- ئەها قۆدی ئاوەتەماتەیە.

- ئەوە پیازە.

- خوێ، شەکر، تۆچا...

- ئەها مەنجەڵی کۆڵێ.

- وەرن ئەو چینکۆیە گەورانە راکێشن.

- ئەوە وا بزانم چادرە، ئەها تەشتە نان، تەنەکە هەنگوین.

- ئەوانە، ئەوانە بەتانین، ئەها دۆشەك دۆشەك.

- تەماشاکەن، نۆك، فاسۆلیا،...

-تایت، سابوون. لیفکەی خۆشووشتنێ.

- کورە، ئەو هەموو هیربالە، ئەها فەردە ئارد، تەنەکە رۆن...

- ئێرە ماڵی ئایشەگوڵ و...

یەك ماڵی تەواو لە بن ئەو کۆلکە دارانە ئێخستبووی، ماڵێك بە دیوار و بانەوە، بە رایەخ و کەرەستەی نانـدێن و گەرماوەوە، شوێنەکە ئەشکەوتێکی گچکە بوو، بەڵام زۆر هەڵکەنـدرابوو، بووبووە خانوویێکی گەورە، دیار بوو بۆ حەوانەوەی ئێمە دەستی نەدەدا، یەك: چاڵایی بوو، دوو: بەفری زۆر دەگرتەوە، دەبوو بە بەردەوامی حەفت جەنگاوەر بەفر بماڵن، ئەگەر ژمارەمان سێ حەفتی بایە، بێ سێودوو لێکردن لێی پاڵمان دەدایەوە و خەنی دەبووین، هەر جارەی دوو حەفتمان پشوومان دەدا و حەفتێکمان بەفرمان دەماڵی.

دەستمان بە کێشانەوەیان کرد، لە تەنیشت ماڵی شەیتان چادرمان هەڵدا، سەرشۆرکێ لە چینکۆ چێکرا، ئاگرێکی

دۆزەخیمان کردەوە، سێ چوار مەنجەڵمان خستە سەری، بەفر بێنە و بیخە ناو مەنجەڵەوە، مەنجەڵی کوڵێ زۆر گەورە بوو بەشی خۆ شووشتنی خێزانێکی گەورەی دەکرد، لەولا برنج دەکولا، لە تەنیشتی فاسۆلیا، بەتەنیشتیەوە قۆریەی گەورە.

- دەی با نان بخۆین، ئەوجا نۆرەی خۆشوشتن بگرین.

- ئەرێ نانەکە تێك نەچووبوو؟

- نا، دەڵێی دوێنێ نا پێرێ برژاوە

فاتیمە کۆڵەپشتێکی گچکەی لە دەست بوو، هەر هەڵگێڕووەرگێڕی دەکرد.

- ئەوە چییە! لە کوێت بوو؟

+ لە ناو شتەکان بوو، بەڵام سەیرە دەرگای چوونە ژوورەوەی نیە! ها ها

- ئەگەر دەرگاشی نەبێت، پەنجەرەیەکی هەر هەیە، لە پەنجەرەوە برۆ ژوورەوە، ها، ها ها

+ بڕوات بێت، هیچی نیە، کۆڵەپشتێکی سەیرە!

- کا بێنە، کوو وەیە!

کۆڵەپشت رێك لە هێلکە دەچێت، داخراو لە بەرد داخراوتر، جێی تەقەڵ چییە پێیەوە دیار نیە، کۆڵەپشت نە زۆر سووکە نە زۆر گرانیش، دیار نیە چی تێدایە، وەك بڵێی تۆپێکی کەم هەوا بێت، چەندی پەنجەی پێوە دەنێی و پالی دەدەیت، بە هیچ ناگەیت.

- راوەستە بیدڕێنم.

+ نا ئەوە نەکەیت، لێیگەڕێ.

- خۆ نووشتە نیە بەکردنەوە بەتاڵبێتەوە.

+ وازی لێبێنە بۆ خۆم دەیکەمە سەرین.

کۆڵەپشتی بزبووم بیرکەوتەوە، گوتم:

تۆ بڵێی کۆڵەپشتی راز و پەنهان نەبێ!

گوتی:

منیش بیر لەوە دەکەمەوە.

گوتم:

ئەدی لەسەر چی راوەستاوی؟ بیدڕێنە.

گوتی:

دڕان نابێ، بیستوومە لە زارکی خۆیەوە نەچیە ناوی، هیچ بە هیچ ناکەی، لێیگەڕێ بزانین...

قەندیل هەرگیز ئاگری وای بە خۆیەوە نەدیتبوو، ئەو ناوە یەکپارچە پشکۆی ئاگربوو، پشکۆی دار بەڕوو، هێندە برنج و فاسۆلیامان خوارد، خەریکبوو بە دان بکەوین، وا بزانم پێیکەوتین، لەو قەندیلە سەرشۆڕکێکمان داخستبوو، سەردەستەی مراویان گۆتەنی: لە ئەسفەهانیش گەرماوی وا گەرم دانەخرابوو.

دەبوایە تا جلکەکان وشکدەبوونەوە، خۆ لە بەتانی بپێچی و بە دیار پشکۆی ئاگر و جلک وشککردنەوەدا سەمای ئاگریی بکەیت.

ئـای چەنـد مانـدووم، مانـدووتر لە خـۆم، مانـدووم وەك ئایشەگوڵ ماندووم، خوداوەندی خەوا! ئەو پیاوەتیەم لەگەڵ بـکە، دەستم بگرە و فڕێمـدە خەوێکـی قـووڵ قـووڵەوە، لە خەونـێکم هەڵکێشەو بمهێنەوە، خەونێك تك تك رازەکانی ئایشەگوڵی لێـوە بتکێ، زۆر تامەزرۆی خۆشووشتنم، بە خۆشم نازانم لە کەنگێـوە خۆم نەشووشـتووە، ئەگەر بـزانم لە کەیەوە لە ئاقـاری قەنـدیلم، رەنـگە بتـوانم پەنـجەی کـات لە سـەر شـوێنی دوا خۆشووشـتن دابنـێم، رەنـگە ئەو تـامەزرۆییەم بـۆ سەرشـۆرک بە مەبەسـتی خۆشووشتن نەبێ و بەس، خوا خـوامە نـۆرەی مـن بێـت، زانـیم شەشەمین کەسم، نازانم پێنجەمین کێیە! پێنجەمین بۆ من گرنگە، زۆریـش گـرنگە، حەزدەکەم فـاتیمە بێـت، لەوەتەی حەزدەکەم بچمە سەرشۆرێکەوە، تازە ژنێکی لێ دەرچووبێ و هێشتا کەفـی لەشولاری وی گەرماوی بەرنەدابێ.

- تۆ لە دوای منی، بەڵام لە پێش من برۆ.

- لەبەرچی ناچی؟

- حەزدەکەم پتر گەرمدابێ.

چـوارەمین کەس کێـیە! کارمـان بە پێنجەمـین نەمـا، وێنـاچێ چوارەمین کەس فاتیمە بێـت، ئەو بـایە سەردەسـتەی مراویـان بە پێنجەمی دەمایەوە و ئەو چاکەیەی لەگەڵ من نەدەکرد.

زۆر ماندووم، حەزم لەخەوتنە و خەونی پێـوە دەبیـنم، تەواو شەکەت و پرزە لێبـڕاوم، توانـای سـەر بەرزکـردنەوەیەك و چـاو ێـڕانێکم بە دەوروپشـتی خۆمـدا نـیە، ئاگـادار نـیم کـێ خـۆی شووشتووە و کێ ماوە! رەنـگە بەو رادەیەش بـێ توانـا و دابـڕاو نەبم، راستیتان دەوێ، من نامەوێ یان ناوێرم، بزانم کێ لە پـێش

من گەرماو دەکات، دەمەوێ بە هیـواوە لە چـاوەڕێی گەرمـاودا بم و حەزناکەم لەم بارەیەوە پرسـیار لە کەس بـکەم، ئێسـتا دوو شـــت لە نـــاو ســـەرمدا گێژەلـــووکەن و بە تەنیشـــت یەکەوە گێژدەدەن، ئەوانیش ئایشەگوڵ و فاتیمەن، ئایشەگوڵ لەو قەندیلە سەهۆڵبەندانە، گەرماوێکی کـردەوە! فـاتیمەش نـازانم چەنـدەمین کەســە دەچێــتە گەرمــاوەکەی ئایشــەگوڵ و خــۆی خــاوێن دەکـاتەوە، لە ئێسـتا بە دواوە لە قەنـدیلێ، سەرشـۆرکێ هەیە بە ناوی سەرشۆرکی ئایشەگوڵ.

- بڕۆ خۆت بشۆ سەرشۆرک چۆلە.

- کێ لەوێ بوو هاتە دەرێ؟

دیتم فاتیمە بە تانیەکی لە خۆی ئاڵاندووە و دەموچاوی سـەد سـووند دەخـۆی مـانگی نـاو بەفـرێیە، بە حەز و شـەوقەوە بەرەو حەمـام هەیـپەم لێکـرد، وەك ئەوەی مەهنازێـك، ژنێـك لەوێ بە رووتی لە چاوەڕێی مندا وەستابێ و لێـو بکـرۆژێ، سەرشـۆرک بۆنی ژنی لێدەهات، پڕ بوو لە تـاڵە قـژی ژن، ژنێـك نەمـدەزانی چـی مـنە! نەمـدەزانی بـۆ کەس رووتبـۆتەوە یـاخود لە خـۆی و دیجلە بترازێ کەس بە رووتـی نەیبینیـوە، لە بـۆنی فـاتیمەوە ئەو بۆنەی لە گەرماوەکەی ئایشەگوڵ بەجێیهێشت یان لە بیریکرد.

خەیاڵم لە سەرشۆرکیە قەندیلەکەوە هەڵفڕی، بەو بۆنە ژنـانیە گەیشـــتمەوە هـــۆدە خەونـــیەکەی مەســـتوورە و لەوێشـــەوە راستەوراســـت بەرەو رەشـــماڵی مەهنـــازی، سەرشـــۆرک مەســـتی کـردم، دەتگـوت بە دیـار چاوەکـانی مەسـتوورەوە دانیشـتوومە، ئارام بوو وەك نیگای فاتیمە ئارام، لە ناو ئەو سەهۆڵبەندانە گەرم بـــوو، گەرم وەك رانەگۆشـــتنەکانی بەر تـــریفەی مانگەشـــەوی مەهناز، گەرم گەرم.

مەهناز چەند ئەمەکدارە، خۆی گەیاندە ناو سەرشۆرکی قەندیلێ و تێر تێر لە ئامێزم گرت و بە یادی رەشماڵی خێلان و مانگەشەوەوە، بوومەوە پەڵە هەور و بە خوڕ دامکرد، لە چاو نوقاندنـدا مەستوورە و مەهناز بە رووتی هاتن، بەڵام فاتیمە نەهات، نەك لەبەر ئەوەی جێگەی نەدەبۆوە نا سەرشۆرکە یەك کەسیەکەی قەندیل لەو ساتەدا جێی حەفتاوحەفت ژنیشی تێدا دەبۆوە، بەڵام جێی فاتیمەم نەکردەوە، چوونکێ کاتێ لە سەرشۆرک بۆنی فاتیمەم کرد و تاڵە قژی ئەوم لە کەلێنی بەردەکانی بن پێمەوە دیتەوە، فاتیمە هێندەی بۆنی خوشکی دا، بۆنی لە خوشك دوورتری لە خۆی نەدابوو، هێندەی وەك دایك خۆی پیشاندا هێندە لە دایك دوورتر نەهاتە پێشێ، من لە سەرشۆرکێ زۆر نەدەمامەوە، لە خۆشترین گەرماو چ هاوین چ زستان لە چارێگێ پترم پێنەچووە، ئەو جارە زۆرم پێچوو.

سەرشۆرک خۆش بوو، پۆڵای فاتیمە نەخشەی کێشابوو، هەر خۆیشی دروستی کرد، هەموو ئەو کارانەشی بە بێدەنگی و بێ ئەوەی داوای شتێك بکا، کرد، درێژیەکەی دوو گەز، بەرینی هەر گەزێ دەبوو، بڵندیشی ئیمامەی پساوە دەبێت خۆی نەوی بکات، مەنجەڵەکە گەورە بوو لەگەڵ تەشتێك و مەنجەڵێکی گچکەتر جێی کەسێک و نیویان گرتبوو، لە دەرەوە ئاگرت دەدا، پۆڵای ئەندازیاری سەشۆرک بە شێوەیەك دایمەزراندبوو، دووکەڵ نەدەهاتەوە ناوی. ئەگەر مەرگ نەگات رۆژێ لە رۆژان بە مەهناز شاد ببمەوە و من تریفە بناسێت، کاتێ هەرسێکمان پێکەوە دانیشتین و داوای گێڕانەوەی سەربردەیان لێم کرد، پێش هەموو شتێ باسی ئەو سەرشۆرکەیان بۆ دەکەم، ئەو سەرشۆرکە ئەگەر لە گێڕانەوەیدا بەهاراتیشی پێوەنەکەیت، چیرۆکێکە نزیك لە ئەفسانە، ئەوە نیە لە دوو سێ

پارچە تەنەکە لە سەهۆڵبەندانی قەندیلیٚ سەشۆرکیٚ چێکراوە، کاتیٚ دەچیتە ناویەوە ئارەقە لە هەموو لەشت چۆڕ چۆڕ دادەچۆڕیٚ، لەشت حەفتا چین چلکیشی لە سەر بێت، لە چەند ساتێکدا دەگاتە ساخە و لە بەفر خاوێنتر دەبیتەوە.

خۆم جوان جوان بەتاڵ و خاوێن کردەوە، هێندەی بزنێك مووم لە خۆم کردەوە، چلکی وەرزێکم لە خۆم داماڵی، جلکەکانمم شووشت، بەتانیم لە خۆم لوولدا و هاتمە دەریٚ، هەستمکرد لەشم زۆر سووکە، سووکتر لەو کلوو بەفرەی وا لە ئاسمانیٚ با سەمای پێدەکات، سووکتر لەو تاڵە قژەی وا فاتیمە جاروبار دەیداتە دەستی با، هەر بە فڕین هەڵفڕیمە ناو چادرەکە، لەم سەرەوە تا ئەو سەر بە ریز پشکۆ گەش گەش دەگەشانەوە، منیش دەستم بە وشککردنەوەی جلکەکانم کرد، فاتیمە لە ناو هۆڵەکە بوو، لەویٚ خەریکی جلک وشککردنەوە بوو، ئەویش پشکۆریژ بوو.

ئێمە ئێستا سیٚ پەناگەمان هەیە، سیٚ گابەردی گەورە کە ناومان ناوە هۆڵ، ئەو هۆڵە هەر بە فشە جێگەی حەفت کەسی تێدا دەبێتەوە، چادرێك ئەویش حەفت کەسیە، سەرشۆرکێکی تاکە کەسیش، ئەو سیٚ پەناگەیە، دوورایی هەر پەناگەیەك لە ئەویدی هەر حەفت هەنگاوی پیاسەیی دەبێت، ئەگەر لە هەر یەکیانەوە بۆ ئەویدی خەتێك رابکێشی، جا ئەو خەتە لە سەر بەفر بێت یان لە سەر پشکۆی ئاگر، سێگۆشەیەکی بەفری یان ئاگریی بە دیار دەکەوێت، دوای راکێشانی سیٚ خەتەکە، بە سڕینەوەی هەر خەتێك لەو سیٚ خەتە، ئەگەر حەز بکەیت، خۆت لە ناو ژمارە (٧) دەبینیتەوە ئەو ژمارەیەش بە ڕێنووسی ئەنفال.

له ناوەنـدی هـۆڵ و چـادر و سەرشـۆرک، بلێسـە هەمیشـە بلێسەی ئاگر، ئەگەر بەفری هەموو ئاسمانان کلوو کلوو بە سـەر قەندیلـدا داکـات و تـا رۆژی پەسـڵانێ لێنەکـاتەوە، زەفەر بەو بلێسانە نابات کە لە کۆلکەدارەکـانی ئایشـەگوڵەوە بلێسـە دەدەن، داربەڕوو کە دایە گڕ و ڕێگەی ئاگری گـرتە بەر، ئـاگر لە نـاو زریـانیش هەر بە ئـاگری دەمێنێـتەوە و خـۆ بەدەسـتەوە نـادا، جەنگاوەریش زۆر جار خۆی لە بەرەی ئاگر دەبینێتەوە.

هەموو لە خۆشووشتن بـووینەوە، فـاتیمە لە هەمـووان جـوانتر خۆشووشـتنی پێـوە دیـار بـوو، ئەگەر هەمـوو ژنێـك لە دوورەوە گەرماوکردنی پێوە دیار بێت، هی فاتیمە زۆر لە دوورترەوە دیار بوو، چەند ناسك بوو هێندەیدی ناسکتر دەینواند.

هەندێکمان هەر لە ناو بەتانی بووین، ئەوانیدی جلکەکانیـان وشك بووبوونەوە، لەبەتانی هاتبوونە دەرێ، هەڵمی جلکی لەسەر پشکۆ هەڵـدراو، لەپەڵە هەورێکـی ناسـك دەچێـت، هەر زەیـنەتە تەماشـایکەیت، مـن دەمێـدی کە تیچـاوێکم دایە هـۆڵەکە، پەڵە هەوری باوەشـی فـاتیمەم دیـت، رووخسـاری دەتگـوت مـانگە، بەڵام هەور بەری گرتبـوو، جـوان نەدەبینـران، کەچـی سـەمای دەکرد و جوانتر خـۆی دەنوانـد، فـاتیمەی دوای گەرمـاوکردنی ناو پەڵە هەور، لە هەموو فاتیمەکانی دنیا جوانتر بوو، هەر فـاتیمە نـا، سەرشـۆرکی ئایشـەگوڵ هەمـووانی جـوانکرد، پێشـتر کەس بێزی نەدەهات دەست بخاتە ناو پرچی خۆیەوە، ئێسـتا پرچێکـی نەرم و خاو، مـن کە پەنجەکـانم بە نـاو پرچمـدا دەگێـڕم، چێـژ وەردەگرم.

ئێستا لەبن چـادر دانیشـتووین، بڕیـاردراوە لەمەودوا هـۆڵەکە

بکـرێته نانـدێن و ئێـرەش جـێگەی دانیشـتن و خەوتـن، ئەگەر پێویستیشـی کـرد یەك دووانێـك لە نانـدێن دەخەون، شـەش جـێگەی خەو پێویسـتە، چـادرەکەش جـێگەی شـەش جـێگە دەکاتەوە، بۆ حەفتیش سەری پێوە نیە، بە زمانی سووتاوم گوتم:

وا بزانم ئێـرە جـێگەیەکە نە دوو پـێ نە چـوار پـێ نایگـاتێ، بۆیە پێویست ناکات ئێشکگریی بگرین.

- هەر ئەوە مابوو، ئەوجا بە چاکەت و بێجامەش دەخەوین!

- ئەگەر ئێشـــکگریی و نهێنیـــی شــــەو لە پێشـــمەرگە وەربگـریتەوە، چـی تێـدا دەمێنێـتەوە! ئەدی نـازانی پێشـمەرگە لە سەر سێ شت راوەستایە و خۆی گرتووە:

ئێشکگریی، نهێنیی شەو، تفەنگ،

- نـا، ئەوە دەیەوێـت کۆپتەرێـك بێـت، لە خەوێ وەکـوو کەروێشك بمانگرێ و بمانبا بمانبـا، لە ئاسـمانی شـار فڕێمانـداتە خوارێ و وێنەی شفتی شەق ببەین، ئەو دەم چ بە خۆمان بڵێین، بـۆ هەتـا هەتـایێ حەیـا و ناموسـمان دەچێـت، دەڵـێن حەفـت پێشمەرگە لە خەوێ گیران!

فاتیمە گوتی:

کـوڕە دە وازی لێبێـنن، هێنـدە سـەرکۆنەی مەکەن، گـاڵتەی کرد.

پـۆلای فـاتیمە و داغسـتانی بە بـێ دەنگـی مـانەوە و بـاش و خراپ قسەیەکیان نەکرد، بێدەنگیی داغستانی بـۆنی لایەنگیریـی منی لێدەهات، بەلام بێدەنگیی پۆلای فـاتیمە، درێـژەی بێـدەنگیە هەمیشەییەکەیە و هیچ نیشانەی لایەنگیری و دژیی پێوە دیار نیە، کەس قسەی فاتیمەی نەشکاند.

هێندەم بیست، داغستانی لە بن لێوانەوە گوتی:

ئەگەر سەیەکی وەک سەی ڕێوانمان دەبوو، بێ خەم لێمان پاڵدەدایەوە.

ئۆی، سەی ڕێوان!

وازیان لە سەرکۆنەکردنم هێنا و قسەیان بە لایەکی دیکەدا ڕاکێشا، نازانم بە چ لایەکدا چوون، سەی ڕێوان وەها بە شمشاڵەوە نەنووسا، نەمتوانی لای ئەوان بمێنمەوە، بە تەنیشت خەیاڵی سەگەکەشەوە کۆپتەر وەها زراوی نەبردم ئاگام لە قسە و باسی ئەوان بمێنێ، باڵم لێکدا و فڕیم.

شمشاڵ تەنها دەروەستی ئەنفال نایە، تەنها دڵی ئەنفالە بە شمشاڵ نابێتە ئاو و بە کونی شمشاڵدا چۆڕاوگە نابەستێت، شمشاڵ سەگەکەشی دەبستەمۆکرد، ئەو سەگەی هەزار جار پتر پری داوەتە قاچی ئەنفال و ئێشی پێگەیاندووە، ئەنفالیش هیچی لەگەڵی پێنەکراوە، هەزار تیری تێگرتووە هیچیانی بەرنەکەوتووە، دەڵێن:

زۆر جار ئەنفال لە ترسی وی ڕێی خۆی گۆڕیوە، سە خۆی لە گوللە لادەدات، لە چوار لاوە بەر دەستڕێژی بدە، گوللەیەکی بەرناکەوێ، بەریشیکەوێ، گوللە نایبڕێ.

سە لە سەر کەلێ هەمیشە ڕێوان بوو، بە گیان پاسی لە ئاوایی دەکرد، ئەو ئاواییەی بەو سەگەوە دەناسرایەوە، ئاوای بە (سەی ڕێوان) ناوی کەوتبوو ناو ناوان، لە دیدی سەی ڕێوانەوە هەر کەسێ بە ڕەچەڵەك سەر بە ئاوایی سەی ڕێوان نەبا، دوژمن بوو، بێ پرسی خەڵکی ئاوایی ڕێی نەدەدا لە کەلی سەر ئاوایی

ئاوا بێت، هەبوو دەیگۆ:

ئەگەر هەمـوو مرۆڤێـك وەك ئەو سـەیە پاسـەوانی لە زێـدی خۆی بکات، هیچ زێدێك داگیرناکرێـت، ئەگەر هەمـوو دنیـاش هێرشی بۆ بێنێت.

هەبوو دەیگۆ:

ئەو سـەیە زۆر رەگەزپەرسـتە، مەگەر ئەنفـال ئەوهـا رەگەزپەرست بێت.

کەسیش نەیدەزانی رقلێبوونەوەی سەی رێوان بەرانبەر دنیـای دەرەوەی ئاوایی سەی رێوان لە چیەوە هاتبوو.

ئەنفال راوینابووین، مانـدوو مـردوو، برسـی و تینـوو، رێمـان کەوتەکەلـی سـەی رێـوان، نزامـان دەخوێنـد، بەر لەوەی سـەی رێوان رێمان لێبگرێت، کەسێکی ئـاوایی سـەی رێـوان بگـات و بمانپارێزێت، نزا نەگیرا.

ئێمە لەگژ نزاخوێدن بووین، دەنگی هات، دەنگ چ دەنـگ! لە دەنگی هـیچ سـەگێك نەدەچـوو، ئەوەی مـن بیسـتم، وەڕینـی ترس بوو، دەنگی ترس بـوو، بە دیـارکەوت، سـەگ چ سـەگ هێندەی سێ سە دەبوو، ترساین، ئەنفالیش بەرەو رووماں بهاتـایە هەر هێندە دەترساین، چ بکەین باشە! ئەو داغستانیەی ئێستا سەی رێوانی بەبیرهێنامەوە، چەند فیشەکێکی هاویشتێ، سە بە سـانایی خـۆی لە بەر لادان، وەك ئەوەی خـۆ لە بەر بەردێکـی لە دوورەوە هاوێژراو لابدەیت.

چ بکەین باشە! رێی لێگرتـووین و کەسـیش لە ئـاواییەوە بە هانامانەوە نایێ، تۆزێ بچینە پێش، جلکمـان بە بەرەوە ناهێڵێـت،

رووتمـان دەکـاتەوە، لە جلـك و چەك رووتمـان دەکـاتەوە، لە جەنگاوەریی رووتمان دەکاتەوە.

شمشاڵم بە خەیاڵدا هات، گۆتم:

ئەنگۆ بەرگریکەن و ڕێمەدەن پڕمان داتێ، من...

بە تـرس و لەرزەوە لە سـەر بەردێـك دانیشـتم، فـووم بە شمشـاڵدا کـرد، پەنجەکـانم دایە بـای شمشـاڵی، وا بـزانم گەیشتبوومە هاوار دەلال، دیتم سـەگ وا کلکـی بـادەدات، ئەو کلك بادانە بادانی پێشوازی بوو، سـەگ دۆسـتانە نـزیککەوتەوە، کلکی مێوانداریتی لە چۆکمان هەڵدەسوو، لە پێشـمان نەرم نەرم دەڕۆیشت، جارجارە ئاوڕیدەدایەوە، بۆ ئەوەی بزانێت بە دوویـدا دەڕۆین، من کەمێك پشوومدا، گوتیان:

کاتی پشوو نیە، تێهەڵکە، با پەژیوانەبێتەوە.

وام کـرد، سـەی ڕێـوان لەگەڵ شمشـاڵ کلکـی مێوانـداریی دەجوولاند، بڕۆ، ئێمەی گەیاندە ئاوایی.

ئاوایی سەی ڕێوان حەپەسان، پیرێ سەیری کلکبادانی سـەی کرد، گوتی:

کارەسـاتێکی گەورە بەڕێـوەیە، خـودایە، لە سـەی ڕێـوانی بە دوور بگریت.

کاتێك ماڵئاواییمان لە ئاوایی سەی ڕێوان کرد، سـەی ڕێـوان تا دوور ئاوایی بە دوامانەوە بـوو، چـاوی لە شمشـاڵەکە بڕیبـوو، هەستمکرد فرمێسک دادەبارێنێ، لەو ساتە گڕەی کـۆپتەر هـات، سەی ڕێوان گوێی هەڵخست، یەکپێ بەرە و ئاوایی بەرەو کەلی خۆی قووچاندی.

ئـای، سـەی رێـوان، داخـوا ئێسـتا لە کـوێی، خـۆزی لێـرە دەبووی.

هەسـتمکرد تارمـاییێ بە سـەرمەوە، راچڵەکـیم، وا تێگەیشـتم کەوتوومەتە بن سێبەری کۆپتەرەوە، ئیمامەی پساوە بوو، لە سەر سەرم راوەستابوو، گوتی:

هێندە بیری لێمەکەوە، بە خەمان هیچ چا نـابێ، ئێشـکگرییش پێویستە.

من ترسابووم، من ترسام لە کۆپتەر ترسام، ترسانێ، راسـتە و راست چاومی بە ئاسـمانەوە هەڵواسـی و ئێسـتا نـا ئێسـتا کـۆپتەر دەگات و هەڵمدەگرێ، ترسانێ، بەهای بەخشیەوە بە نۆبەتـداری و پڕاوپـڕی کـردەوە لە واتـا، ئەو نۆبەتـدارییەی پـێش ناوهێنـانی کۆپتەر، بۆ گاڵتەش لە لای من واتایەکی تێدا نەما بوو، کـۆپتەر چیرۆکێکـی ترسـناکە، سـەراپا سـەرهاتێکە لە وەیشـوومە، بەر لەوەی کۆپتەر و فڕۆکە بە ئاسمان وەربن، ئاسمان خـاوێن بـوو، جوان بوو، هەر جوانیەکم لە سەر زەوی لێ بزر بـایە لە ئاسـمان لە دوای دەگەڕام، بەڵام کۆپتەر و فڕۆکە گوویـان لە ئاسـمانیش کرد، کۆپتەر دنیایەك سەرهاتی هەیە، خەیاڵی کۆپتەر هەڵیگرتم.

دوو جەنگـاوەر زۆر مانـدوودەبن، لە شـەڕێکی گەورە دەگەڕێـنەوە، لە سـەر گـردۆلکەیەك پشـوودەدەن، خەویـان لێـدەکەوێت، کـۆپتەر دەگـاتە سـەریان، گـڕ گـڕ لە سـەریان دەسووڕێتەوە و گێژیان پێدەدات و بە گێژی بە ئاگایان دێنێـتەوە و سواریان دەکات و دەیانبات.

شوانێك لە دوورەوە چاوی لەو دیمەنە دەبێت.

کۆپتەر دەیانبات و دەڕوات، زۆر کەس ئەوەیان دیتووە کە لە بەرزایی ئاسمانەوە لە کۆپتەرێکەوە دوو شتی بۆر بەردەبێتەوە، دێن دێن لە کۆڵانیماڵی ئایشەگوڵی دەکەونەوە، ئایشەگوڵ بۆ زۆر کەسی گێڕاوەتەوە:

یەکەم کەس بووم کە گەیشتمە سەریان، یەکیان هەپروون بە هەپروون بووبوو، ئەویدی هەناسەی لەبەرمابوو، ئەو رستەیەی گوت و گیانی دەرچوو:

پێشمەرگە بە ئێشکگریەوە پێشمەرگەیە، وەرنا وەکوو ئێمەی لێدێت.

دەڵێن: کۆپتەرەکە بۆیە لە پێش ماڵی ئایشەگوڵ فڕێیدابوون، تا بیترسێنن و بچێت کوڕەکانی بهێنێتەوە، ئەگەر نەیانهێنێتەوە، ئەوانیش بەو دەردە دەبەن.

بەڵام ئایشەگوڵ گوتبووی:

کوڕی من ئەگەر کوڕی من بن ناخەون و هەر بە ئاگان.

خەیاڵی کۆپتەر بەرمنادات.

شاخەکۆپتەرشکێنێ هەبوو، زۆر حەزی لە برنۆ دەبێ، برنۆش لە خۆی درێژتر بوو، بۆیێ بە ناچاری و لە شەرمەوە وازیلێهێنا و کلاشینکۆفی کردە شانی، شاخە کۆپتەرشکێن لە شەڕێکی درێژخایەندا لە برادەرەکانی دادەبڕێ و بە تەنێ دەمێنێتەوە و ڕێ بزردەکات، لە رووتەنێك خۆی دەبینێتەوە، لەپڕ کۆپتەرێك لە دوورەوە بە دیار دەکەوێت و وەك بزبزۆك بەرەو لای وی دێت، چاو دەگێڕێ پنچکەکیش بۆ خۆشاردنەوە نابینێتەوە، هەر هێندەی لەدەستدێت کلاشینکۆفەکەی بخاتە بن قەمسەڵەکەی و

دەستی خۆبەدەستەوەدان بەرزبکاتەوە، لە ناو وڕەوڕ و تڕەتڕەی کۆپتەردا، پەیژەیەك لە کۆپتەرەوە دێتە خوارێ.

خۆی گێڕایەوە:

دەمویست دەستی بۆ ببەم و سوار بم، گوێم لە دەنگێك بوو، زۆر لە دەنگی خولە دەچوو، وا بزانم هەر هەو بوو، دەنگەکە گۆتی:

کوڕە دەست بۆ پەیژە نەبەیت، لە منت نەکەوێت دەست بۆ تفەنگەکەت ببە.

منیش وەکو مەردان بە قسەمکرد، دەستوبرد، دەستم برد و یەك دەستڕێژم بە کۆپتەرەوە نا، کۆپتەر بە تەقلە بەرز بۆوە و هەڵات و لە چاو ون بوو.

دەڵێن: کۆپتەرەکە لە نزیك ماڵی موختاری کونەگورگ بە ئاگرەوە کەوتبووە خوارێ.

شاخە کۆپتەرشکێن دەیگۆت:

کاتێ دیتم کۆپتەر بە تەقلە دەڕوات و زانیم بەردەبێتەوە نزامکرد کە لە حەوشەی ماڵی موختارێك بکەوێت و کاولی بکات، جا هەر موختارێك بێت.

ئەو کوڕە رقی دنیای لە موختار بوو، دوژمنی سەرەکی ئەو موختار بوو، جا ئەو موختارە لە بن دەستی با، یان لە بنی دنیا، دەیگۆ:

موختار هەر موختارە لە هەر شوێن و سەردەمێك بێت، بڕۆ بیکوژە و ئۆباڵ بە ئەستۆی من، هەرچی کەتنی دنیایێ هەیە لە

بن سەری موختارە، ئەگەر موختار نەمێنێ دنیا ئاسوودە دەبێ، موختار چاوساخیی ئەنفالیش دەکات، ئەگەر موختار نەبێت ئەنفال بە شەوان ماڵی کەس نابینێتەوە، بڕۆ بۆ من باشە، نیشانەی راستە، لە دوورەوە قل قل موختاران سەگتۆپ دەکەم.

لەگژ جلك وشككردنەوەن، هی هەندێك لە سەر وشكبوونەوەن، هی هەندێك كزر بوونەتەوە، من جلکم لەبەرکرد و چایەکی ئایشەگوڵیم خواردەوە و بە دوایدا جگەرەیەکی داخستانیش کێشا، ئێستا نۆرەی خەوە، خەوم دێت، رەنگە خەوهاتنەکەم لە ترسی کۆپتەرەوە بێت، جگە لە من و پۆلای فاتیمە ئەوانیدی سەرگەرمی قسە بوون، لە دوای دیتنەوەی ماڵی ئایشەگوڵ و گەرماوکردن و نان خواردن لەو ماڵە، ئاهی قسەیان هاتبووەوەبەر و باسوخواس دەکرایەوە، سەردەستەی مراویان شیعری دەگۆت، هاوڕێی گیڤارا سروودانی دەچڕی، داغستانی هەرچی جوێن هەیە بە قەندیلی دەدا، ئیمامەی پساوە سەرهاتی کۆنی دەگێڕایەوە، فاتیمە جاروبار وەك گوڵ پێدەکەنی، ئێستا ئێمە وا لە ماڵی ئایشەگوڵین و خواردنمان لە بڕانە، ئەوەی لەو ماڵە دەستناکەوێت تەنها گۆشتە، چوار پێنج قوتووە گۆشت هەبوو، زوو لرف کرا، جێوریێشمان خۆشە و لە تێری جێمان دەبێتەوە، چ زۆرە بەتانیش زۆرە، ئاگریش، هەتا رۆژی حەشر کۆلکەدار بسووتێنە لە بن نایەت.

ئایشەگوڵ لە هەموو لایەکەوە دەهاتەوە ناو قسە، قسە بە هەر لایەکدا دەڕۆیشت، دەگەیشتەوە ئایشەگوڵ و قسە ئایشەگوڵی رادەکێشا، ئەوەتا ئەو دوو جەنگاوەرە لە سەر ئایشەگوڵ پیس تێکگیراون، هاوڕێی گیڤارا دەڵێ:

هەموومـــان قەرداری ئایشـــەگوڵین، ئەو نەبـــایە ئێســـتا نـــا دەمێکیدی لە سەرماشدا نەمردباین، لە برسان دەمردین، نابێـت لە قســـەی وی دەربچـــین، پێویســـتە هەر لە قەنـــدیل بمێنیـــنەوە و بگەڕێین تا ئەوانیدیش دەبینینەوە.

داغستانی هەزار سوێند دەخوات:

بێجگە لەو حەفت کەرە، گیـانلەبەرێ لەو قەنـدیلەدا هەناسـە نادا، هەرچی دەڵێی لێت وەردەگرم، بەڵام مـانەوە لە قەنـدیل نـا، ئاخر بۆچی بمێنیـنەوە؟ تـا کەی بمێنیـنەوە؟ ئایشـەگوڵ ئەو قسـە گەورانە دەکـات، ئەدی خـۆی لـۆ نەیتـوانی لێـرە بمێنێـتەوە! بە کوڕو کچی خەڵکی دەڵێ لێرە بمێننەوە، بەڵام خۆی قووچاندی! بە خودای بە قسەی ئەو ژنە ئاخر شـەڕە بکەیـن، لە تـڕێ سـەی دەچین.

هاوڕێی گیڤارا:

هەر کەســێ بە قســـەی ئەو ژنە بکـات زیـان ناکـات، ئەو هەرگیز زیانی ئێمەی نەویستووە و ناوێ.

ئەو دووە لە بـــارەی ئایشـــەگوڵەوە نەدەگەیشـــتنە یەك، هەر ئەوان نا، دیدی کەسـمان لە بـارەی ئەو ژنەوە تێکینەدەکـردەوە، ئەوە نەبـــوو دوو بەرە بـــین، نـــا کە ســـەری قســـە دەگەیشـــتەوە ئایشەگوڵ، حەفت رستەی لێکدی جیا بـووین و بە ئـامرازێکیش خزمی یەکدی نەدەبووینەوە،

داغســـتانی لە رێـــی هـــاوڕێی گیڤـــاراوە رقـــی قەنـــدیلی بە ئایشـــەگوڵ هەڵدەڕشـــت، دەنـــا پێنەدەچـــوو کێشـــەیەکی ئەوتـــۆی لەگەڵی هەبێت.

سەردەستەی مراویان خۆی لە داغستانی نزیکدەکاتەوە:

+ ها جگەرەیەك لەو تووتنە بپێچەوە، بزانە چتۆ تووتنە؟

- تووتنی چی، هەر لە هی خۆم نیە!

+ نــا، لە مــاڵی ئایشــەگوڵم دیــتەوە، لە ســایەی مــاڵەکەی ئایشەگوڵەوە، چایەش لە کوپ دەخۆینەوە.

لە ناو بەفرێ، ئاڵۆزترین کێشە و بێ ســەروبەرترین دەمەقاڵێ و بگــرەو بەردە، بە کــوپێ چــای بە هــێلەوە دەبــنە هەڵــم و ئاسەواریان نامێنێ، داغستانی چەند جگەرەیەکی پێچـایەوە، مـژی زۆر قووڵ، مژی کرپاری لێدەدا:

ئەوە خۆشــترین تــووتنە لە دنیــایێ لە مۆســکۆش جــگەرەی ئەوهام نەکێشایە.

هاوڕێی گیڤارا:

بە راستی وایە، ئەو جگەرەیەی لە گیڤاراشم وەرگرت ناگاتە ئەو جگەرەیە.

تــووتنە نەك گەمە، مــن یەکەم جــارمە جــگەرەی وا خــۆش بکێشم، سەد ئەو سۆمەرەی بە قوربــان بێــت کە کــاتی خــۆی لە پیاسەی عەسرانی نــاو شــار دەمکێشــا و دووکەڵەکەیــم بە پرچــی ئەو کچانەدا دەکرد کە تیچاویان دەدایە هەموو شتێك، تەنها مــن نەبێت، ئەو هەموو پێکەنینەیان بە سەر دوکانداره‌کانـدا دەڕژانـد، بەڵام بۆ جارێکیش بزەیەکیان بۆ من نەدەکرد، منــیش لە داخــان لە ناو دووکەڵی جگەرەم هەڵدەکێشان.

خەو بەرمنادا، دەڵێن چایە خەوڕەوێنە، بەڵام وا نیە، بۆ مــن وا

نیه، بۆ منی قەندیلی، بۆ منی چێنراوی ناو بەفر و زریان، بۆ منی ترساوی هەمیشە ترساو، چ پێناچێ من ببمە جەنگاوەر، نا بە جەنگاوەری نامرم، بشمرم نامخەنە لیستی جەنگاوەرە شەهیدەکانەوە، بژیم تا دنیا دنیایە هەر بژیم، نامخەنە لیستی جەنگاوەرە دێرینەکانەوە، نا من بۆ جەنگاوەری لە دایك نەبووم، جەنگاوەر دەبێت بە جەنگاوەری لە دایکبێت، جەنگاوەر لە ساتە ترساوەکان نابێت نزیکببێتەوە لە مالی خەو، ئەوەتا من لە هەر ترسانێکدا راستە و راست دەگەمەوە مالی خەو، نا من بە جەنگاوەریی نامرم، بە جەنگاوەریی نامێنمەوە، نا من جەنگاوەر نیم و نابمە جەنگاوەر، من دەبێت تا زووە بگەمەوە شمشال و بچمەوە ناو رەشمالی خێلان، لە بیرمە پێش خەوتن لەگەل خۆم زۆر بگرە و بەردەم کرد و دەستم بۆ گەلێك سەرەداوی باسان برد، بیرمناکەویتەوە تا کوێ رۆیشتم و بە چی گەیشتم و ئەوەی هەمبوو لە کوێ خستم!

- *باشترە بنووسی.*

+ *نا، وادەی نیە، هێشتا زووە.*

- *درەنگ هاتووم زوو نەهاتووم، بینووسە.*

+ *زۆر زوو هاتی، رەنگە هەلەت کردبێت، بیربکەوە، ناوی چی بوو تەمەنی چەند بوو!*

- *خۆتی و هەلەم نەکردووە، ئەگەر نایننووسی دەرۆم و دەلێم نەینووسی.*

+ *تۆ راوەستە با تێکبگەین.*

- *قسەمان لە سەر تێگەیشتن و تێنەگەیشتن نیە راسپارەکەت بنووسە و تەواو.*

+ *نایبنووسم، پێیبڵێ هێشتا زۆر زووە نایبنووسم.*

خراپ راچڵەکیم، راچڵەکینێ مەگەر هەر خۆم لە خەونی خەوێدا وا راچڵەکیبم، ئۆخەیش خەون بوو.

+ هێشتا زووە، نا....

- زووی چی!

هاورێی گیڤارا بە ئاگای هێنام، وا بزانم تێگەیشت خەو و ئاگاییم تێکەڵکردووە، بۆیە لە سەری نەرۆیشت و لیستی ئێشکگریی خستە دەستم، دەمویست بخەومەوە و خەونەکەم تەواو بکەم و بزانم چی بەسەردێت، ئەو کابرا تارماییە بۆچی دەیویست وەسیەتم پێ بنووسێ! من بۆ نەمنووسی! دەمویست ئەنجامی ململانێیەکە ببینم و پێبکەوم کاممان لاملترین، نەموێرا بنوومەوە، کەرەتێ وام کرد، سزایان دام، سزایەکی قورس، حەفت رۆژ شیویان پێم لێنا، ئا ئەوەی لە کاتی ئێشکگریی بخەوێت، زۆر جار سزای زۆر قورس دەخوا، سزاکەی من لە چاو سزایان هەر هیچ نەبوو.

شەوێ بوو خوێتی دەبەست، قەندیل کپ کپ، سپی سپی، دەتگوت نە زریان نە تۆپی بێ داد و شام و تاران و توران هەرگیز رێیان بە قەندیل نەکەوتووە، دنیا لە ئاوێنە روونتر و لووستر بوو، خۆت بۆ خلیسکانێك شل بکردایە، شەیتانیش نەیدەزانی لە کوێ خۆت دەبینیەوە، چوومە ناندێنەکە و پشکۆم گەشتر کردەوە، سەیری پارچە کاغەزەکەم کرد، ناوی پۆلای فاتیمە لە دوای ناوی من بوو، نهێنیی شەویش (حەیدەر )بوو.

حەیدەر کێ بوو! کێ بوو!! ئا ناسیمەوە، ماڵیان لە

ڕۆژهەڵاتی پەردەکە بوو، خانووەکەیان دوو قات بوو، لە قاتی سەرێ ژوورێکی گەورە هەبوو، پەنجەرەیەك لەو ژوورە دەیڕوانیە چیا، ڕۆژێ لە پەنجەرەوە گازیکردم، چووم، بە سەر کتێبدا کەوتم، جێی دانیشتنی خۆیشی نەدەبۆوە.

+ تۆ کتێب دەخوێنیتەوە؟

- بەڵێ

+ کتێبی باشت بدەمێ دەیخوێنیەوە.

- بەڵێ

لە ڕێ دەستم بە خوێندنەوە کرد، چیرۆکێکی خۆش بوو باسی لە بە ئەفسانەبوونی چەند کەسێکی ئاسایی دەکرد.

ڕۆژێ قسە بە کۆڵانێ وەربوو، حەیدەر ژوورەکەی لە سەر خۆی داخستووە و لە کەس ناکاتەوە، گەڕەك خڕبوونەوە:

حەیدەر، بیکەوە کوڕم بیکەوە، بابم بیکەوە.

دەنگ لە کتێبەوە هات، لەوەوە نەهات، دەرگای نەکردەوە. دەرگایان شکاند، ئەو لا حەیدەر ئەم لا حەیدەر، نەبوو، دایکیشی سوێندی دەخوارد، بە چاوی خۆی بینیویەتی چۆتە ژوورێ و دەرگای لە سەر خۆی داخستووە.

ئێ، خانوو جگە لە دەرگا چ کونەکی دەرچوونی تێدا نیە، دەی، بن کتێبان بگەڕێ، ناو کتێبان بگەڕێ، حەیدەر بووە بەردی بن گومێ، حەیدەر بووە وشەیەك لە ناو ئەو هەموو کتێبانە، کەس نەیدیتەوە.

ئیدی من حەیدەرم لە ژوورەکەی خۆی ونکرد و

نەمدیتەوە، ئەوەتا ئەوشەو لە قەندیلێ و لە سەر ئەو پەڕە کاغەزە دیتمەوە، دەنگم ناگاتە دایکی، دەنا پێیدەڵێم:

کوڕەکەت لە ناو پەڕە کاغەزان بزر بوو، لە ناو پەڕە کاغەزانیش لە دووی بگەڕێ.

بیستمەوە، ژوورەکەی حەیدەر هەتا ئێستاش وەکو خۆیەتی و دەستی لێنەدراوە، دایکی دەرگاکەی داخستۆتەوە و ناهێلێ کەس لێی نزیك بێتەوە، هەرکێ لێی دەپرسێ:

سۆراخێکی نیە؟

دوور لە گومان و بە دڵنیاییەوە دەڵێ:

با وا لە هۆدەکەی خۆیەتی، خەریکی خوێندنەوەیە.

ئەگەر بتەوێ دیدەنی بکەیت، توند دەستت دەگرێت و بە میهرەبانی پێتدەڵێت:

وازیلێبێنە، لە خوێندنەوەی مەکە.

خەو بەرمنادا، ئاگرم جوانتر گەشاندەوە، قۆرییەکەم خستە سەری، دوو پەتاتەی گەورەم هەر یەکەی هێندەی مستێ هاویشتە ناو پشکۆوە، بخۆ چایە و پەتاتە بخۆ، مژی وا لە دار جگەرە دەدەم، هەر مژێك ئاسمانێك دووکەڵ دەخاتەوە، خەو بەرمنادا، لە نێوان ناندێن و جێی نووستن دەستم بە پیاسەکردن کرد، پیاسەیەکی پڕ ترس، ترس لە هەڵخلیسکان، لەو قەندیلە هەر کەسێك پێی بڕوا و پێی نەگیرێتەوە، ڕۆیشتنێ دەڕوا، نە ڕێی بە دۆزەخ دەکەوێت، نە بە بەهەشت، خوداوەندیش نایبینێتەوە.

لـــوورەی تۆپێـــك، چ نـــیە دوور خـــۆی بە عەرد دادا، تۆپێکیدی، تـۆپ تـۆپ، نزیکتـر، زۆر نزیـك، هەمـوو راپەڕیـن: چیە؟ چ بووە؟! چ نیە نە، تۆپانێیە!

- ئەوە لە کام لاوە دێن!

- لە بێ دادەوە.

- ئەوەیان لە تارانەوە هات.

- وا نیە لە تورانەوە بوو.

- ئەوەیان لە ناوەڕاستی شامەوە هات.

- مـن بـزانم قسـەی هەمووتـان راسـتە، لە هەر چـوار لاوە تۆپبارانە.

پێـدەچوو قسـەی هـاوڕێی گیڤـارا راسـت بێـت، مـن چ تێنەگەیشتم تۆپەکان لە چ لایەکەوە دێن، هەموویان کۆك بـوون لە سەر ئەوەی ە تۆپەکـان لە هەمـوو لایەکەوە دێـن، هەر تـۆپ بوو لە نـاو بەفـرێ تەپەی دەهـات، بەڵام هەنـدێکیان وا بـزانم بە بەرد دەکەوتن، دەنگێکی وایان لێ بەرزدەبۆوە، قەندیلیان کـاس دەکرد، هاوڕێی گیڤارا دەڵێ:

ئاگرەکە کز کەن و تەواو هیچ لە گۆڕێ نیە.

ئیمامەی پساوە لێی وەردەگرتەوە:

من دڵنیام ئێرە تۆپی هیچ دەوڵەتێك نایگرێتەوە، نـابینن چەنـد دوور لە ئێمە دەکەونەوە، کوا هەتا ئێستا چ مەترسیەکیان لە سەر ئێمە درووستکردووە!

دڵـم بەو قسـانە ئـاوی خـواردەوە، ئەوەی ترسـە لـێم نزیـك نەکەوتەوە، ئەو تۆپانە نەبان هەرگیز خەو بەری نەدەدام.

جێـی خەوتنمـان گـۆڕی چـووینەوە نانـدێنەکە، گوتیـان بـۆ ساچمە ئێرە باشترە، ئەگەر بشگات، گـابەرد دەیـانگێڕێتەوە، زۆر بە تاسەوە بووم لە تێـری بـخەوم، بەڵام دەنگـی تـۆپ نەیهێشـت چـاوم بچێـتە خەو، ئەو تـۆپە دنیـا هەژێنـانە دیڵـن کەس خەوی لێبکەوێت! ئەوەتا دەبینم ئەوانیـدیش خۆیـان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکەن و خەویان لێناکەوێت و هەڵدەستنەوە.

داغستانی هات هات، تا گەیشتە نێوان من و فاتیمە هەر هات و نەوەستا:

بە ناوی من بەو کچە تاقانەیە بڵێ، کـووت پێـدەڵێم ئەوهـای پێبڵێ، ئەویش کووی بە تۆ گۆت ئەوها بە منی بڵێوە، نەگـۆڕی قسە گۆڕین ئەگەر بە نیازی چاکەش بێت هەر خراپە.

گۆتم:

قسەی تۆیە فەرموو بڵێ.

گۆتی:

پێبڵـێ بەو کـچە بەسـراییە بڵـێ، ئەوا ئـێمە وەکـو دەڵـێن چارەنووسمان قەندیلە بە گچکەیی نا، بە جحێڵی، بە جحێڵی نـا، بە پیری هەر دەبێـت سەرمان پێبکەوێـت، بەڵام پێمنـاڵێ تـۆ چ جێیـدی نەبـوو رووی تێبکەیـت، ئەو قەنـدیلە سـەر بە گۆبەنـدە نەبێت؟!

فـاتیمە وەك بڵێـی کەوتبێـتە بەر پرسـیارێکی وا کە هەرگیـز چاوەڕوان نەبووە کەسێك لێی بکات، تەواوێـك دامـا، چـاوی لە

چاوی داغستانی بڕی، ئەوجا بە بزەیەك لە دەم و لێوە قەسپییەکانیەوە، شیرین شیرین هاتە گۆ:

بە راستی من نەك هەر قەندیل هیچ چیایەکم لە خەونی شەوانیش نەدیتبوو، نەك هەر قەندیل خولیای چوونە سەر هیچ چیایەکم لە سەر نەبوو، رۆژێك لە رۆژانیش کەسێك نەهاتە بن گوێم و گەشتی چیام بۆ بخوێنێت، تا وردە وردە خۆشەویستیی چیا بێتە دڵمەوە، خۆشم نازانم چۆن بوو! هێندە دەزانم رووداوێکی دیاریکراو، منی گەیاندە ئێرە، پاشا منی گەیاندە ئێرە

داغستانی گۆتی:

دەی پێیبڵێ ئەو رووداوە چی بوو؟ پاشا بۆچی تۆی ناردە قەندیل؟

فاتیمە هیچ وەڵامی نەبوو، بێدەنگ ما، دیتمان چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، خەریکبوو بڕژێن، باش بوو داغستانی زوو گرتیەوە و نەیهێشت بڕژێن:

پێیبڵێ بەس نەگریێ شەرت بێت لە شەرتی پیاوان جارێکیدی پرسیاری ئەوها قۆڕی لێنەکەم.

**لە کۆڵەپشتی کۆچەری**

**خەو ورتکە نانی لە خۆ ئاڵاندووە**

**ئێشك دەستم گرێدەدا بە تفەنگەوە**

**پێم وا بە کەلەپچەی بای رۆیشتنەوە**

شەوو رۆژانی تەمەن لە ئێشکگری دەکەمەوە

شینبە پێی نادیار شینبە

بەرپێنەیێ بە رۆیشتن ببەخشە

دابەزە دەستی نادیار دابەزە

هێشووە خەوێ بگوشە ناو چاومەوە

لێم وەرگرنەوە بینایی نۆبەتداری

بمدەنەوە چاوێ بۆ خەوتن (سترانی جەنگاوەر)

## ١٥

تۆپەکان جیا بوون لەوانی پێشی، لە دەنگ جیا بوون، لە جێی کەوتنەوە جیا بوون، لە بەدوای یەکداهاتنیش هەر جیابوون، ئەوانەی پێشان قل قلەیان نەبێ کە دەنگیان زۆر گەورە بوو مردوویان زیندوو دەکردەوە، ئەوانیدی وا نەبوون، بۆ جەنگاوەر لە مێشوولەیەك کەمتر کاریگەریان بەجێدەهێشت، لە هەزار تۆپ تۆپێك نزیك دەکەوتەوە، ئەمانە بە گشتی لە دەوروبەر زرمەیان دێ، ئەوانیدی ناوە ناوە پشوویاندەدا، ئەمانە پشوو ناناسن، ناپسێنەوە، هەر دەڵێی تەزبێحی نەپساوەن، وەك تەزبێحەکەی دەستی داغستانی دنك دنك، هەندێ جار سێ دنك و زیاتریش خێرا خێرا دێن و ئاودیو دەبن، تۆپەکان ناپسێنەوە، دنیا دەپسێتەوە، تۆپەکان ناپسێنەوە، تۆپەکان پشوونادەن، بەفر پشوو دەدات، زریان پشوو دەدات، تۆپەکان پشوونادەن.

جەنگاوەران لەگەڵ نەپساوەیی تۆپەکانیش راهاتوون، لە ناو زرمەدا پاڵکەوتوون، هەر دیتت خەویشیان لێکەوت، لەگینە خەونی ناسك و وەنەوشەییش ببینن، لە بەدبەختیمە تۆپەکان نامترسێنن، ئەینا ئێستا بۆ خۆم پوختە دەخەوتم، خەوێکی درێژ درێژ، خەوێك وەك تۆپەکان نەپساوە، خەوێکی تژی لە خەون، نا هێشتا هەموویان بەئاگان، ئەوەی پاڵکەوتووە و لە سەر خەوتنە، بەئاگاترە لەوەی دانیشتووە و مژی نۆبەتداری لە جگەرە دەدات.

پـۆلای فـاتیمە بەرانـبەرم نیـوە پاڵـدانەوە لە سـەر تەنیشـت پاڵیـــدابۆوە، دەســـتی خســـتبووە بـــن چەنەگەیەوە، رۆچـــوونێ رۆچووبوو، قووڵتر لەو چاڵەی کچە خەونیەکە بە ئەسـحابەکوژی ئاشـناکرد، دەتگـوت لە ئاقـاری بیسـتنی ئەودا نەك هەر زرمەی تۆپ بگـرە زیـکەی زیکـزیکەش نـایەت، زاخـم دا بەر خـۆم و راستوراست چوومە ناو چاوی و هەست و خوستم لە خۆم بڕی، هەرچی نزام لەبەربوو خوێندم، ئێ، بیگرێ و هەنـدێ ئاشـنایەتی لە دیرۆکی وی پەیدا بکەم.

دیتم بە چیایەکدا هەڵدەگەڕێ، بە تاقی تەنێیە، ناوە ناوە ئاوڕ لە پشـتی خـۆی دەداتەوە و دەسـت رادەوەشـێنێ، دەڵێـی چەنـد کەسێك لە دواوەن، بە ئاستەم گوێم لە دەنگی پۆلای فاتیمەیە:

*دڵنیام هەوە، ئەو دیو ئەو لووتکەیە هەوە، دەبێت بیگەمێ، ئا هەوە، لەوێوە هەموو دنیـا دەبینـم، بە دەنـگ و رەنـگەوە هەمـوو دنیا دەبینم، دنیا بە کۆن و تازەیەوە دەبینم.*

گورج گورج هەنگاو دەنێ، وا گەیشتە سەر لـووتکەکە، لە شوێنی خۆی راوەستا، چاو بەو دیودا دەگێـڕێ، ئەو دیـو لە مـن دیار نیە، ئاوڕیدایەوە دەست رادەوەشێنێ و هاواردەکات:

*وەرن وەرن، دیتمەوە، کۆگەم دیتەوە.*

زرمەیەك دەنگی پۆلای فاتیمەی پێچایەوە و هێنـدەم لە خـۆم هەڵدا، ئەویش تەنیشتی گـۆڕی، رووی وەرسـووڕاند و لە بینینـی کـۆگەی کـردم، دڵـم خـۆش بـوو بەوەی ئەو کـوڕەش کەوتە چاڵەکەوە، بەڵام من حەزم لە رابردووی وی بوو نەك ئایندە.

لەگەڵ زرمەی تۆپەکە ئەوانەی بە نیـازی خەوتـن متەقیـان لە

خۆیان بڕیبوو، هەستانەوە و دەستکرا بە گوێز شکاندن، چایەش دێمی دا، بخۆ لە گوێز و چایە، نازانم وابوو یان من وام دیت پۆلای فاتیمە سەیریدەکردم، وەك ئەوەی هەستیکردبێت شتێکم لێی دزیوە، کاتی خۆی کە دزیم لە فاتیمەش کرد، هەستم بە سەیرکردنێکی وا کرد، دەبێت زیاتر لە پۆلای فاتیمە بدزم، ئەوە چ نەبوو، من رابردووم مەبەستە، نا ئەوەش گرنگە، زۆریش گرنگە، رەنگبێ ئێستای لە رابردووەکەی گرنگتر بێت، رابردووەکەی زیاتر هی خۆیەتی، بەڵام ئایندەکەی لەگینە بەشی منیشی پێوە بێت، ئا کێ ناڵێت ناگاتە کۆگە و یەکێك لەو کەسانەی کە لە دوایەوە دەڕۆیشتن، من نیم! زۆر لەو بێدەنگیەی وی دەترسم، شتی گەورە و وێنانەکراویش لەو بێدەنگیەیدا وێنادەکەم، بە دووری نازانم لە رێی پۆلای فاتیمەوە، رێمان بکەوێتە کۆگە و لەوێوە هەرچی نهێنیی دنیا هەیە دەیکەینە ئەنگوستیلە و لە پەنجەمانی دەکەین، لەو بێدەنگیە قووڵەی ئەو رادەبینم کە ئەو توانایەی لە خۆیدا هەڵگرتبێ.

- هەرگیز وا نەبووە، بێ پسانەوە لە هەر چوار لاوە، زرم زرم...

- چ نیە، ماندوو دەبن، گرنگ ئەوەیە زۆر هاتوچۆ نەکەین.

- دەڵێم دەبێت ئاگرەکەی ئێمەیان نەدیتبێ؟

-نا، وای نابینم، بەڵام با حەفت ساڵ، تۆ بڵێ حەفتا ساڵ، تۆپ بهاوێژن، وەك گوتم ئێرە تۆپی هیچ تۆپخانەیەك نایگرێتەوە.

هاوڕێی گیڤارا پرسیارێکی توندەی هاوێشتە ناو رستە پڕ لە باسوخواسەکانی ئیمامەی پساوە و داغستانی:

ئەرێ تۆ بە چی دەزانی ئێرە تۆپ نایگرێتەوە؟

ئیمامەی پساوە:

ئێ، کوا تا ئێستا تۆپێك لە نزیکت کەوتووە؟

هاوڕێی گیڤارا:

کە تا ئێستا نەکەوتووە، مانای ئەوە نیە کە ناکەوێت! دەبا پێتبڵێم، وەك من لێرە وردبوومەوە، لە دوو لاوە تۆپ نایگرێتەوە، لە دوو لاوەش تۆپێك ئەگەر زیرەك بێت رێك جێمان دەکاتە ئەوجێ و بەو سێ گابەردەوە تەختمان دەکات.

ئیمامەی پساوە:

باوەڕناکەم لە هیچ لایەکەوە ئێرە تۆپ بگرێتەوە.

هاوڕێی گیڤارا:

- وەرە بچینە دەرێ، ببینە بە چ شێوەیەك تۆپ دەمانگرێتەوە و گوومان پێدەکات.

چوونە دەرێ، فاتیمە و پۆلای فاتیمە و من ماینەوە، دیاربوو ئەوانیش وەك من بە لایانەوە گرنگ نەبوو داخوا تۆپ لە کام لاوە دەیگرێتەوە، لە کام لاوەش نایگرێتەوە، پۆلای فاتیمە بە رێی خۆیدا رۆیشتبوو، بێ من رۆیشتبوو، رەنگە ئێستا لە ناو کۆگەدا پیاسە بکات، من پۆلای فاتیمەم مەبەست بوو، بەڵام رووم لە فاتیمە کرد:

- دەبێت لە کۆگە چ باس بێت؟

+ زۆر بیری لێدەکەیتەوە!

- نا، کەمێك، ئەدی تۆ هیچ بە لایدا ناچیت!

+منیش لە بیرمنەچۆتەوە، بەڵام هێندەش خەریکم ناکات.

- پێدەچێت پۆلا زۆر بیری لێبکاتەوە!

پۆلای فاتیمە هەر بە پۆلایی مایەوە، نە نای هەبوو نە ئا، پێدەچوو هەر گوێی لە ئێمە نەبووبێت، جا با گوێیشی لێبێت چ ناچار نیە وەڵامبداتەوە، ئەو هەرگیز وەڵامی پرسیاری لابەلایی ناداتەوە، ئەگەر بتەوێ وەڵامت بداتەوە، دەبێت بچیتە ناو چاوی و دەست بخەیتە سەرشانی و راستورەوان پرسیاری خۆت بکەیت، یاڵا ئەگەر وەڵامت بداتەوە، چ وەڵامێکیش! نا بەلاشە، گێچەلکردن بە پۆلای فاتیمە جگە لە شەرمەزاری بۆ خۆت چیدی لێناکەویتەوە.

خەمساردانە تەماشایکردین:

ئەستێرە هەڵبێن، دەرچوون ئاسانە.

فاتیمە دەتگوت لە دڵی منە، لە باتی منیش بە نەرمیەوە لێی پرسی:

ئەستێرە لەو قەندیلە دەتوانێت ببێتە رێنیشاندەر؟ باوەڕناکەم ئەو ئیشە لە دەستی چ ئەستێرەیەك بێت، ئاخر کە نەزانرێت یان وەهامان لێ تێکچووبێت، قەندیل کەوتۆتە کوێی دنیا، با هەر بزانین باکوور باشوور دەکەونە کوێ، بە چی دەچێ، لات وایە ئەستێرە بە کەلکی ئێمە بێت؟

بێ خۆ شێلووکردن:

با ئەستێرەیەکم لێ هەڵبێت، ئەو ئەستێرەی خۆم دەیلێم، هەینێ دەبینن!

لەوێوە نزای هەڵاتنی ئەستێرەی پۆلای فاتیمەش هاتە سەر نزاکانیدی، ناوە ناوە، لە دڵەوە دەڵێم :

خودای ئەستێران، بە ئەستێرەکەی پۆلای فاتیمە بلێ خۆی پیشانمانبدا، دنیامان پیشانبدا، لە لای تۆ ئاسانە زۆر ئاسانە، هەڵاتنی ئەستێرەیەك کوا چی تێدەچێت!

نا ئاسان نەبوو، لە ئاسمانی قەندیلێ چ شتێك هێندەی بەدیارکەوتنی ئەستێرە زەحمەت نیە، نەك هەر زەحمەتە، پەرجووە، ئەوەی لە قەندیلێ ئەستێرە ببینێ، مرۆڤ نیە، نا نابێت مرۆڤ بێت، شتێکی دیکەیە، فریشتەیە، بزانە شەیتانە، چیە! دەڵێن بۆیە ئەستێران نابینرێن، چوونکە شەوی قەندیل گەلێك سپیە زۆر لە بەفر سپیتر، راستە زۆر لە بەفر سپیترە، لەبەر ئەوە چاو هەر چ بکات، چەندێ تیژ بێت، ئەستێرە نابینێت، نا کەس لە قەندیل ئەستێرەی نەدیتووە و نادینێت.

تۆپەکان نایبڕنەوە، بەفریش دەستپێکردەوە و چ پێناچێ لێبکاتەوە، سەردەستەی مراویانیش لە دوورەوە وا دەستی بە خوێندنەوەی شیعرێکی زۆر درێژ کرد، ئەگەر خوا بە خوایەتی خۆی زمانی لە گۆ ببات، دەنا وەها زوو لەو شیعرە نابێتەوە، ئیمامەی پساوە بە بێدەنگی خۆی بە بن گابەردا کرد و لە سەر پشت تەخت کەوت، دەتگوت بە دۆڕاوی لە شەڕدا گەڕاوەتەوە، تێگەیشتم هاوڕێی گیڤارا بۆی سەلماندووە کە ئێرە تۆپ دەیگرێتەوە، فاتیمە کۆڵەپشتە بێ دەرگا و پەنجەرەکەی لە باوەشی خۆی دانابوو، گەمەی پێدەکرد، وام هەستدەکرد گەمە لەگەڵ بووکەشووشە دەکات، پۆلای فاتیمە تا ئێستاش هەر روو لە دیوار، دەست لە بن چەنەگە، هاوڕێی گیڤارا هات، هات لە

بن پێی ئیمامەی پساوە چوار مەشقی لێی دانیشت و پێدەچوو چاوەڕێی بێدەنگبوونی سەردەستەی مراویان بکات، بۆ ئەوەی تێهەڵکا لە سروودێك و ورە ببەخشێتەوە گیانی جەنگاوەران، لە ناو دەنگی سەردەستەی مراویانەوە دەبیستم، داغستانی دەیگۆت:

دە بەسە بابم بەسە، لە لایەك دەنگی تۆپ لە لایەك دەنگی تۆ، ئەوجا وەرە شێت مەبە.

ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، چایەم دێمکردبوو، چایە چ چایە! بە خۆدا هەڵدان نەبێت، کەس وەك من چای وای لێنەناوە. فاتیمە کە لە تەنیشتم دانیشتبوو، فڕی ناسکی لە چای دەدا:

ئەگەر کاری چایەچێتیت کردبا، چاخانەکەت شەو و رۆژ جمەی دەهات.

گوتم:

لە سەری دەمنووسی بە رۆژ بۆ ژنان، بە شەو بۆ پیاوان.

سەردەستەی مراویان:

- من بە رۆژ دەهاتم و شیعریشم لێی دەخوێندەوە، ئەرێ بە راست من قسەیەکم هەیە، بەڵام وەك بڵێی شەرم دەکەم بیڵێم.

داغستانی:

+ وەی چەند شەرمنە!

- بە قوربانی ئەو سمێڵە ستالینیەت بم، ناوێرم شتێك بڵێم یەکسەر لە دەوم دەدەیتەوە.

+ دە بیڵێ دەی، هەر دەیڵێی.

- ئێ ئەنگۆ بە من بڵێن، ئێمە لەمێژە لێرەین؟ بە راستی و بە بێ درۆ من لێم تێکچووە، نازانم لە کەیەوە لێرەین!

+ ها ها ها ها ها... نا، پرسیارێکی خراپ نیە، منیش بە تەواوی نازانم لە کەنگێوە لێرەین.

- ئێستا کێ بە درووستی دەزانێت، با پێمبڵێ.

هەموو تەماشای یەکدیان دەکرد، وا دیاربوو کەس چاوەڕێی پرسیارێکی لەو بابەتە نەبووە و هەرگیزیش پرسیاری وەهای لە خۆی نەکردووە، من لە دنیایێ هیچ پرسیارێکم هێندەی ئەو پرسیارە لا نامۆ و سەیر نەبوو، نازانم بۆ! ئێ، خۆ پرسیارێکی زۆر سادە و ئاساییە، هەموو کەسێك بە ئاسانی و بە ژمارەیەك دەتوانێ وەڵامبداتەوە، ئەدی بۆچی لای من و لای ئەوانیدیش وا قورس و ئاڵۆز کەوتەوە؟!

ئاڵۆزە من لای خۆمەوە چەندی سەر دێنم و دەبەم ناگەمە وەڵامێکی درووست بۆ ئەو پرسیارە، هەستمکرد ئاڵۆزیەکە لەوەوە هاتووە کە رۆژژمێری قەندیل لەگەڵ هی دەرەوەی ئاقاری قەندیل بە هیچ شێوەیەك تێکناکەنەوە، ئا ئەو تێکنەکردنەوەم بیرکەوتەوە، دوای لێکدانەوە و لێبڕین و تێکردنەوەیەکی زۆر گەیشتمە ئەوەی یەکەم کەس بم وەڵامی پرسیارەکە بدەمەوە:

وا بزانم حەفت شەو و حەفت رۆژی رێکە ئێمە لێرەین.

- وەی تڕحێوا! تەڕت زانی، من بزانم، بە مانگ و رۆژ حەفت مانگی رێکە.

- من دەڵێم زیاترە زۆر زیاتریشە، حەفتساڵیش دەبێت.

حەفت رۆژی من، حەفت مانگی ئیمامەی پساوە، حەفت ساڵی داغستانی، لە ناو ئەو هەموو حەفتانە هەر یەکە بە حەفت چاو تەماشای یەکترمان دەکرد، من نەك هەر گومانم لە حەفتەکەی خۆم کرد، بگرە خۆم بە گەمژەش هاتە بەر چاو باشبوو تا ئەو دەمەش ناوەکەم هەر گەمژە بوو، بەراستی وای بۆ چووم نزیکەی نیوە تەمەنێکم لێرە کردۆتەوە، هاوڕێی گیڤارا بە ئەسپایی گۆتی:

- باشە ئەنگۆ لە خۆوە حەفت حەفتی فرێدەدەن، چ بەڵگەیەکتان لە دەستە؟ دەزانن چەند جار دەستتان بە ئاو گەیاندووە؟ دەزانن چەند ژەمە نانتان خواردووە؟ دەزانن چەند جار سەر و ریشتان تراشیوە؟ دەزانن چەند تاڵە موو لە قژتان سپی بووە؟ دەزانن...

سەردەستەی مراویان:

واز لەو هەموو دەزانن دەزانە بێنە، ئەگەر دەزانیت بیڵێ و وەڵامی پرسیارەکەم بدەوە.

هاوڕێی گیڤارا:

راستیت دەوێ، منیش بە تەواوی نازانم، بەڵام دەڵێم بۆ ئەوەی بزانین لە کەیەوە لێرەین دەبێت وەڵامی هەندێ پرسیارێدی بدەینەوە، ئا دەبێت بزانین لەوەتەی هاتووین سائەت چەند جار بە دەوری خۆیدا سووڕاوەتەوە، چەند چینە بەفر باریوە، چەند لۆچ لە نێوچەوانمان پەیدا بووە؟!

لە دڵی خۆم گوتم، نا بەهەڵەدا مەچن، باشترە ئەو پرسیارە لە فاتیمە بکرێ، رەنگە ئەو بە هۆی تایبەتمەندیەکەی خۆی کە

تایبەتە بە ئەو و هیچمان نیمانە، بزانێت ئەو سەری چەند دەورانە ئێمە لێرەین، هەر زوو، لەو بڕیارەی خۆم پەشیمانبوومەوە، گوتم، نا بێنوێژیش لە قەندیل وەك بێنوێژی دەرەوەی قەندیل نیە.

فاتیمە هێشتا چایەکەی تەواو نەکردبوو، ئەو دەست و ئەو دەستی پێدەکرد، پێنەدەچوو حەزبکات داینێ، زۆر بە ناسکی کەوتە قسە:

ئەوجا کەس هەیە وەڵامی ئەو پرسیارانەی لا دەست بکەوێت! من باوەڕ ناکەم وەڵامی پرسیارەکە لای هیچ کام لە ئێمە چنگ بکەوێت، وەڵامی ئەو پرسیارە وا لە لای ئەو کەسانەیە کە لە دەرەوەی ئاقاری قەندیل، لە سۆراخی ئێمەدا شەو و رۆژ دەکەنەوە، وا بزانم پێویست ناکات خۆمان بەو جۆرە پرسیارانەوە خەریك بکەین، چوونکە وەك من تێگەیشتبم لێرە تەمەن بە ئاسایی و سرووشتی بە رێدا ناچێت، بۆیە لە رێی تاڵە رەش و سپییەکانی سەر و ریشەوە، لە رێی لۆچەکانی دەست و قاچ و نێوچەوانەوە، لە رێی نینۆك و ددانەوە، زەحمەتە ئەو تەمەنە ببینینەوە کە لێرەدا بە سەرمان بردووە و دەیبەین.

سەردەستەی مراویان:

یانی کەس وەڵامی پرسیارەکەی منی نەزانی! ئەنگۆ زۆر دوور و قووڵتان کردەوە، من بمزانیایە وای لێدێت لە جیاتی ئەو پرسیارە قۆڕە شیعرێکم بۆتان دەخوێندەوە.

داغستانی:

نا چاوەکەم نەکەی، سەد پرسیار بکە بەس شیعرێك مەخوێنەوە

ئیمامەی پساوە روو لە پۆلای فاتیمە:

تۆ شتێ بڵێ.

پۆلای فاتیمە:

پێموایە ئەو پرسیارە لە ئایشەگوڵ بکرێ باشە، ئەگەر هاتەوە، من ئەو پرسیارەی لێدەکەم، هەر هێندە دەزانم لە نێوان حەفت کاتژمێر و حەفت سەد ساڵە!

من ئەزموونی زۆرم لەگەڵ پۆلای فاتیمە هەیە ئەزموونێك مەگەر چیا هێندە ئەزموونەی لەگەڵ پێشمەرگە و بەفر هەبێت، مەگەر هێستر و پێشمەرگە هێندە ئەزموونیان لەگەڵ یەکتر هەبێت، ئا دەزانم هەر کاتێك پۆلای فاتیمە بە درێژی وەڵامی پرسیارێکی دایەوە، ئەوە بزانە ژیان ئاڵۆزە و باروودۆخ ترسناکە، بە راست ئێمە لە کەیەوە لێرەین! سەیر نیە کەس نازانێت! باشە خۆ دەکرێ لە رێی جلکەکانمانەوە لە رێی پێڵاوەکانمانەوە، بزانین چەند دەبێت لێرەین، تو بڵێی پێڵاوناسی و جلکناسی کارێکی هێندە گران و لە دەستنەهاتوو بێت، ئەو کێشەیە یەکلابکەینەوە، تۆ بڵێی جلك و پێڵاویش لێرە لەو قەندیلەی هیچ شتێکی بە هی دنیا ناکات، تەمەنێکی جیایان هەبێت لە جلك و پێڵاوی دنیایێ! من زۆر بە گرنگی و قووڵیەوە وا ئەو پرسیارانەم رووبەرووی خۆم کردۆتەوە، خەیاڵم گەیشتەوە دووبارەبوونەوەی ئەو ئەفسانە ناسکەی کە داغستانی سەردەستەی مراویانی لە جێی سەگەکە دانابوو.

دێتەوەبیرم جارێکیدیش بەو شێوەیەی ئێستا کاتم لێ تێکچوو، نەمزانی لە کوێی ساڵ و سەدەم، کەوتمە نێوان دوو شەڕەوە، من ئەو کات لە بەرەی شەڕەکان نەبووم، بە رێکەوت

ڕێم بەوێ کەوتبوو، لەوێ کەوتمە دەستی قاجاریەکان، بە چاو بەستراوی و قۆڵ بەستراوی بردمیان، ئێستاش نازانم چەند ڕۆژ و حەفتە و مانگ و ساڵ بە ڕێدا بردمیان، لە جێگەیەگ دەست و چاومیان کردەوە، نازانم کوێ بوو، تاریك تاریك، هەر وەك ئەوەی چاوم بەسترابێت وابوو، هیچ شتێکم نەدی، نە گەورە نە گچکە، چەندی دەستم گێڕا دەستم بە هیچ شتێك نەکەوت نە رەق نە شل، نازانم چەند لەوێ مامەوە، کاتێ ئازدیان کردم و گەیشتمەوە ماڵ لە نێوان من و ماڵەوە لە سەر ئەو ماوەی زیندانیی من بووە کێشمەکێشم، من دەمگوت هێندەیە ئەوان دەیانگوت نا هێندە نیە و هێندەیە، ئێستاش نەگەیشتینە یەك، وا پێدەچێت ئەمجارەش بۆ من دووبارەبوونەوەی زیندانی قاجارییەکان بێت.

مەستوورە بۆ ئەمە باش بوو، هەموو شتێکی، هەموو ڕووداوێکی نەك هەر بە ڕۆژ بە خوولەکیش دەزانی، لە هەر کوێیەك لایدابا و دانیشتبا، دەیزانی ماوەی دانیشتنەکەی چەند بووە، بێ ئەوەی بە ساتێکیش هەڵەی تێدا بکات، ئەگەر مەستوورەمان لەگەڵ با ئێستا زۆر بە ئاسانی وەڵامی پرسیارەکەی سەردەستەی مراویان و هەمووومانی دەدایەوە و تووشی ئەو هەموو سەر ئێشە و دڵەڕاوکێیە نەدەهاتین، نا وێناچێ مەستوورەش لەو قەندیلە سەرەدەری لە کات دەر بکات، ئاخر قەندیل نە شەوی شەوە نە ڕۆژی ڕۆژ، لە قەندیل میلی کاتژمێریش هەر جارەی بە لایەکدا دەسووڕێتەوە، ئەو قەندیلەی هیچی بە دنیا ناچێت، کێ دەزانێ کات لێرە چۆنە و چ کاتە! پیرەی کونەکۆتری سەرەدەری لێی دەرنەدەکرد، خولەش وەك دەڵێن هەرگیز خۆی لەو باسە نەداوە، نا، کەس هیچی لە بارەیەوە نازانێت.

ئیمامەی پساوە پەنجەی ئەندێشەی خستە خوار بـرۆ پرەکـانی گوتی:

خولە لێرە با، دەیزانی، لە ناوەکەی خۆیەوە دەیزانی.

فاتیمە تینووانە پرسی:

بۆچی خولە واتای چیە؟

سەردەستەی مراویان هەڵیدایێ:

خولە هەر مەحموودەکەی ئێوەیە، وای بەسەرهاتووە.

ئیمامەی پساوە بە پێداگریەوە:

نەخێر، با من خولەت پێبناسێنم، بەر لەوەی مەحمـوودێ بێـتە دنیا، خولە هەبووە و هەمیشە خول خول، بە دەشـت و شـاخاندا، بە دەوری خۆیدا خولاوەتەوە.

هەموو باوەڕیان هات و بێ دەنگ بوون.

تەماشا دەکەم هەموو کز و مـاتن، بێدەسـەڵاتی لە سـیمایاندا دەبیـنم، پتـر دڵـم تونـد دەبێـت، دڵنیـام لە ئەوان پتـر بـێ ڕەنگوڕوویم پێوە دیارە، بەوەی باشە وەك چۆن سیمای ئەوان بە هەمیشەیی لە پێش چاومن ئاوا سـیمای خـۆم نـابینم و لـێم دیـار نیە، دەنا لە خەفەتان بە زگمدەدا.

لەهیکڕا سەردەستەی مراویان یەکێ هەستا و قووچاندی.

+ چ بوو؟ ها

- چ نیە زگم پێچدەدات.

گوێمـان لە فیـڕو هـۆڕ بـوو، سەردەسـتەی مراویـان بـوو

دۆشکەی دەتەقاند، تەقاندنی، دەتگوت لە گەرمەی شەڕداین، سەردەستەی مراویان هێشتا نەهاتبۆوە پۆلای فاتیمەش بۆی دەرچوو، هێشتا ئەو نەیتەقاندبوو، هاوڕێی گیڤارا دەستی بە زگی خۆی دادەهێنا:

منیش زگم دێشێ! ئەوە چیە هی خواردنەکەیە یان هی خۆ شووشتنەکە!

زۆری نەبرد تەنها داغستانی و فاتیمەی نەگرتەوە، لەو ناوە بووە یەك شیرو هۆڕ، تڕڕڕڕ تتتتتتت... کەس تڕی خۆی نەدەناسیەوە، یەك تڕوهۆڕ بوو، تڕی لە تۆپەکان بڕیبوو، ئیدی ڕێگەی ڕیخاندن چۆل نەدەبوو یەك دەهاتەوە دوو دەچوو، دوو دانیشتبووین سێ لە ڕێ.

هەمووانی گرتەوە بە فاتیمەوەش، باشبوو کۆڵەپشتەکەی من و فاتیمە پڕ لە داو و دەرمان بوو، من وەختی خۆی بۆ ماوەی حەفتەیەك دەورەی پزیشکیم دیتبوو، دەمزانی دەرزی لێبدەم و زۆر دەرمانیشم دەناسیەوە و دەمزانی بۆچی بە کاردێن، هاوڕێی گیڤاراش شتێکی لێدەزانی، فاتیمە هەر نیوە دکتۆرێك بوو، داغستانی نە هێشتی دەرزی لێبدەین نە دنکە حەبێکیشی خوارد، چوو گۆلمێك تۆچای هێنا و بجوو، تۆچا بجوو.

- هی خواردنەکەیە، تێکچووە .

- خەتای خواردنەکە نیە، خواردن هیچ بەڵای نیە، سووچی گەدەی خۆمانە لەمێژە چەوریمان نە خواردووە.

- ڕاستە، زۆرمان خوارد، بە دان کەوتین.

- من دەڵێم هی خۆشووشتنەکەیە سەرمامان بووە.

- دوورنیه وابێت، جلکەکانمان باش وشك نەکردەوە، لە بەرمان کردن.

- من دەڵێم سووچی هەردووکیانە، هی خۆشووشتن و هی خواردنەکە.

- من دەڵێم خەتای هەرسێکمانە خۆمان و دووەکەی دیکەش.

قەندیل زگچوونی وای بە خۆیەوە نەدیتبوو، رشانەوەشی هاتە سەر، شێرەی سەرێ و خوارێ کرابۆوە و بە کەیفی خۆی لە بەری دەرۆیشت، نە دەرزی نە حەب ئەو دوو شێرەیەی پێ نەدەگیرایەوە، هەرچی خواردبوومان بە زیادەوە هێنامانەوە هێشتا رانەدەوەستا، رەنگی بەفر بە تەواوی گۆڕا، بە چاوی خۆم دەمدیت کەرتە فاسۆلیا لە سەر بەفر غاری دەدا، داغستانی زۆر توورە بوو، رووی لە ئاسمان کرد:

خودایە ئەوها نابێت، چ رەوای حەقە! هەردوو کونت کردۆتەوە، ناڵێم هەردووکیان بەس هەرنا یەکیان بگرەوە، خۆ چ دوژمنایەتیەکمان لە بەین نیە، بۆچی وامان بەسەردێنی!

هاوڕێی گیڤارا:

کوو دوژمنایەتیت لەگەڵی نیە؟ کوا دەزانی کابە لە کام لایە؟

داغستانی:

قسەی حیز دەکەیت، پەیامبەر بە پەیامبەرایەتی خۆی لە جێی من بێت، بە کابە دەکەوێتەوە!

هاوڕێی گیڤارا بە پێکەنینەوە:

پێشتریش کابەناس نەبووی، هەر تۆ نەبووی لە مۆسکۆ سەرشۆرکی ژنی تێدا نەبا، نەدەچووی؟

داغستانی:

خودا رووت رەش بکات یاخوا، من کەنگێ شتی وام کردووە؟ جارێك نەبێت ئەویش هەر بۆ تاقیکردنەوە بوو گۆتم بزانم ژنانیش وەك پیاوان خۆیان دەشۆن یان نا! دوایی چوونە سەرشۆرکی ژنان شتێکە و کابەناسی شتێکیدی.

ئەو دووە بۆ لە بیربردنەوەی دەردی خۆیان کەوتبوونە گاڵتە و فشقیات، هەستم بەوە کرد پوولای فاتیمە دەیویست لە ریخاندن و رشانەوەشدا هەر بێدەنگ بێت، لە هەمووان دوورتر دەڕۆیشت بۆ ئەوەی کەس گوێی لە باو و بژی ئەو نەبێت، من و فاتیمە حاڵمان لە حاڵی ئەوانیدی باشتر بوو، لە بەرڕۆیشتنی ئێمە هەر لە خوارەوە بوو، داغستانی جاروبار هاواریدەکرد:

+ کورینە واز لە دنکە حەب و دەرزی بێنن، تۆچا بە وشکی بجوون و قووتبدەن، ئەگەر ئەوەشتان پێناکرێ، چایەی تفت و تاڵ بخۆنەوە، باش دەبن.

- کوا تۆ باش بوویت!

+ ئا، من باشترم.

- تەڕ باشی! ئەدی ئەوە تۆ نیت، قەندیلت لە گووی هەڵهێنا!

+ جا هەی سەردەستەی مراویان، ئەو قەندیلە تورەهاتە بۆچی باشە، ماڵی ئەوەیە لە گووی وەربدەی، بە قوربانتان بم، تا پێتاندەکرێ بە گوو سواخیبدەن، من نازانم کابرا چۆن باسی خۆ دووبارەکردنەوەی مێژووی کردووە، بەڵام ئەوە لێرە لە بەر

چاومان خۆی دووبارەکردەوە، ئەدی ئێرە ئەو قەندیلە ساڵانێك پێش ئێستا ئاودەست نەبوو! ئاودەستی شەیتان، ئەوە ئێستاش بۆوە ئاودەست، ئاودەستی ئێمە، دەڵێم باشترم و برایەوە، بە قسەم بکەن باش دەبن.

- تۆچا خوارێش رابگرێت، سەرێی پێڕاناگیرێت.

+ ئێ با خوارێ راوەستێ، خوا کەریمە بۆ سەرێ.

داغستانی دیسان رووی لە خوا کردەوە، بە تووڕەییەك، ئاگر لە چاوی دەباری:

+ بیگرەوە، بەسە، چەندمان خوارد دە هێندەمان هێنایەوە، بە گوللە نەتکوشتین دەتەوێ بە رشانەوە و زگچوون سەگتۆپمان بکەیت!

- خۆت ماندوو مەکە، تینی گوێڕاگرتنی تێدا نەمایە.

- بۆچی نەیماوە، ئیمامە، ها!

ئیمامەی پساوە زانی داغستانی زۆر تووڕەیە، قڕوقەپی لێکرد.

نازانم ئەوان، من ترسم لێنیشت، ترسی مردن، رەنگە قسەی داغستانی بێتەدی، خودا بە زگچوون و رشانەوە بمانکوژێت، بۆ ئەو دەردە کەم کەسی کوشتووە! باشم لە بیرە ساڵێك ئەو دەردە بە شار وەربوو، خەڵکی گەڕەکی برا بەش بەشکرد و نیوەی بەرەو گۆڕستانێ برد، زۆر دەترسم، لە ترساندا خەوم دێت، بەڵام پێچی زگ بوار دەدات سەرخەوێك بشکێنم! لە فاتیمە نزیك بوومەوە:

- تۆ بڵێی ئەو دەرمانانە ئیکسپایەر نەبن؟

+ بڵێم چی رەنگە چ ریکەوتیان لە سەر دیار نیە، نازانم.

فاتیمە دەزانێت زۆر ترساوم و نیوەی رەنگپەڕیویەکەم هی ترسە نەك هی ئاو لە بەر رۆیشتن، دایکانە سەیرم دەکات و خوشکانە دڵم دەداتەوە:

جێی مەترسی نیە، وابزانم سماقمان هەبوو، دەیخۆین چاکدەبینەوە.

پێکەوە لە ماڵی ئایشەگوڵ بە دوای سماقدا دەگەڕێین، پرێسکە پرێسکە دەکەینەوە و دەگەڕێین، لە گەرمەی گەڕان بووین، من هەڵاتم، بە تەنێ نەبووم ئەوانیدیش سەنگەریان گرتبوو، شەڕ گەرمە، زرم و هۆڕە، لەو قەندیلە دەنگ هەر دەنگی تۆپ و تڕە، سەردەستەی مراویان گۆتەنی: بەرگری بەهێزە، قەندیل شەڕ دەکا و خۆ بە دەستەوە نادا.

+ وەرن سماقاو بخۆنەوە، سماقاو.

- سماقت دیتەوە!

فاتیمە یەك کیسە سماقی لە ماڵی ئایشەگوڵ دیتەوە، بخۆوە سماقاو بخۆوە، خۆش بوو، هەناومان دەسووتا، داغستانی لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

مەگەر تۆچا هێندەی سماق بە کەلك بێت، بەڵام ئەوە هەیە سماق تامی خۆشترە و بە لەزەتە.

ئیمامەی پساوە بە پەنجە شەقرەییەکانی برۆ کەپریەکانی لە سەر چاوی لادا:

+ مـن بـزانم چـارەی ئەو دەردە تەنهـا شـێلان و خـۆ سوورکردنەوەیە، ئیمە سەرمامان بووە، سەرما، سماقاویش خراپ نیە.

- دەم خۆش، وایە، دەی با دەست پێبکەین...

سەردەسـتەی مراویـان قسـەکەی تەواو نەکـرد، بە سـەرە پەنجەیێك رۆنەوە غاری دایە داغسـتانی و پشـتی هەڵکـرد، ئـاگر خۆشکرا، شەش پیاو بە نۆرە یەکتریان سووردەکردەوە، فـاتیمەی تاقانە، سەیری دەکردین، قاقـا پێـدەکەنی، سەردەسـتەی مراویـان گۆتی:

سترانەک هەیە، (هەر من مـامەوە هەر مـن مـامەوە)بۆ خـۆت بیلێ.

فاتیمە لە سترانەکە تێگەیی:

پێویستم بەو سترانە نـیە، هەر بـزانە ئایشـەگوڵی دایـك هـات، خۆم بەو دەشێلم.

تا ئێستا بەو شـێوەیە دڵـم بە فـاتیمە نەسـووتابوو، بەو شـێوەیە هەستم بە تەنیایی و تاقانەیی ئەو نەکردبوو، ئێسـتا تێگەیشـتم ئەو لە هەموومان تەنیاتر و کەساسترە، لە دڵەوە خـۆزگەم دەخواسـت کچێکیدی لێرە با و لەگەڵ فاتیمە یەکتریان بشـێلایە، بـۆ خۆیـان هەنـدێ قسـەی تـایبەتی ژنانەیـان بکـردایە، فـاتیمە زۆر تەنیـایە، تەنیـاترین جەنگـاوەری دنیـایە، کەس لەو تەنیـاتر نـیە، بریـا مەستوورەی لەگەڵ بایە، بووکەکەی پیری شالیار، ژنێکـی لەگەڵ بایە، ئەو فاتیمەیە لەو قەندیلە چەنـد تەنیـایە خـودایە، تەنیـاتر لەو سـاتانەی کە بە چـاوی خـۆم دیـتم لە کەنـاری دیجـلە دەسـتی

خستبووە بن کەلەکەی و نەیدەزانی سەری خۆی بۆ کوێ هەڵبگرێ.

فاتیمە نەرم نەرم پێدەکەنێ و دەیەوێ لە ڕێی پێکەنینەوە تەنیایی خۆی لە ئێمە بشارێتەوە، ئەوەتا چوو تفەنگەکەی هێنا، لێکی کردەوە، دەستی کرد بە چەورکردنی، ئێمە یەکتر چەوردەکەین، فاتیمەش تفەنگەکەی، دەیەوێت بەوە دڵی خۆی بداتەوە، فاتیمەی تەنیا، پێکەنین فریای نەکەوت، هات تەنیایی خۆی بە خاوێنکردنەوە و چەورکردنی تفەنگەکەی دەشارێتەوە، ئۆی! من لەمێژە تفەنگەکەم خاوێن نەکردۆتەوە، فاتیمە بە بیری هێنامەوە.

**هەموومان بە خولامی ئەو کچە بین، بە راستی ئەوە پێشمەرگەی تەواوە، بزانە کەس تفەنگ خاوێنکردنەوەی لە بیربوو.**

لەگەڵ قسەی داغستانی هەموو روویان بۆ فاتیمە وەرگێڕا:

وایە.

- من ئامادەم ببمە خولامی.

+ ئەوجا کوو سەگ بە خولام وەردەگرێت!

داغستانی نەیهێشت سەردەستەی مراویان ببێتە خولامی فاتیمە، فاتیمە کە تێگەیشت مەسەلە چیە، پێکەنینێ پێکەنی، قەندیل لە تەمەنی خۆی پێکەنینی مێینانەی وای گوێ لێنەبووە، جوان پێکەنی، مرۆڤ ناوە ناوە گوێی لە پێکەنینی ئەوها بێت، بڕواناکەم بتوانێ هێندەی دنکە نیسکێ رق لە دڵی خۆی جێ

بکاتەوە و کەڵەکە بکات، پێکەنینی وا دەرمانی هەموو دەردانە، بە زگچوونیشەوە، لەدوای ئەو پێکەنینەوە، زگئێشەم نەما.

داغستانی پێدەچوو کەمێك باشتر بووبێت، هەر بە دانیشتنەوە سەری هەڵبڕی و لەگەڵ خوداوەند کەوتە قسە:

*خودایە، بە خراپەی ئێمە مەکە، بنیادەم شیری خاوی خواردووە و خەلەت هەر دەکات، خودایە، پیاوی چاك بە، بە زگچوون نەمانکوژی، مردن بە زگچوون بۆ جەنگاوەران حەیا چوونە، جەنگاوەر لۆیە پێیدەڵێن جەنگاوەر نابێت نە بە نەخۆشی نە بە مردنی خۆی بمرێت، جەنگاوەر دەبێت لە شەڕدا بکوژرێت، دەبێت بە گوللە بکوژرێت، هەتا دەمرێت دەبێت هێندەی حەفت بەرازان خوێنی لە بەر بڕوات، جەنگاوەر دەبێت لە جەنگدا بە پێوە بمرێت، نابێت بە هۆی زۆر خواردن، یان خواردنی پیس، یان سەرماوە بمرێت، نا ئەو جۆرە مردنانە هی جەنگاوەر نین، ئەوجا خودایە نەکەی ئەوەمان لەگەڵ بکەیت، بە نەخۆشی بمانتۆپێنی، ئاخر سبەینێ هەواڵ لە ناو خەڵك بڵاوبێتەوە کە حەفت جەنگاوەر مردوون، خەڵك کووی تێدەگەن!*

داغستانی بێ پسانەوە دەپەیڤی، ئێمەش هەموومان بە حەپەساویەوە تەماشای دەکەین.

*خودایە دەزانی کووی تێدەگەن، دەڵێن ئەو حەفت پێشمەرگە قارەمانە لە شەڕێکی حەفت شەو و حەفت رۆژە قارەمانانە شەهید بوون، شەڕ چ شەڕ! حەفت سەد دەبابە رووبەڕوو تەقەی لێدەکردن، حەفسەد هەزار سەرباز و جاش دەوریان دابوون، حەفتا فڕۆکە لە ئاسمانەوە دەیانکوتان، کوپتەرا هەر ناژمێردرێت... ئا ئا ئەوهای لێکدەدەنەوە، ئەگەر دەزانن بە*

*زگچوون مردین، حەیا و ناموسمان دەچێت، خودایە، ئەو پیاوەتیەمان لەگەڵ بکە، لەو قەندیلە مەمانکوژە، من نامەوێ لە قەندیل بمرم، لە کوێ دەمکوژی بمکوژە، هیچ منەتم نیە، تەنها لە قەندیل نا، من هەقم لە هاوڕێی گیڤارا نیە حەز دەکات لە قەندیل شەهید بێت، کەیفی خۆیتی، بەڵام بزانە ئەو بە ناوی من نادوێ، من لەگەڵ قسەی ئەو نیم، من لە جێیەک دی وەك سەگ بتۆپێنە بەس لەو قەندیلە شەهیدم مەکە، نا من شەهید بوونم لە قەندیل ناوێ، من قەد شانازی بەو مردنەوە ناکەم کە ئیزرائیل لە قەندیل سەردانم بکات، خودایە، بە خودای هەر کەسێك لەو قەندیلە بمرێ شەهید نیە، شەهیدی چی! تەڕەماشە، خودایە، ئەگەر بە هانای منیش نایەت، بە هانای ئەو کچەوە وەرە، تاقانەیە لە ناومان، خەڵکی مەملەکەتێکی گەلێك دوورە، لە بنی دنیایێیە، ئا ئەدی کوو، مردن، لە ناو، ئەها گوو، بەفری چی، جاش، ئایشەگوڵ.*

دەستی بە زگیەوە گرت و هەڵات، وا نەبا، نەیدەبڕیەوە، پێنەدەچوو وەها زوو دەسبەرداری خودا بایە، وەها یەخەی گرتبوو، تا لەگەڵی یەکلای نەکردبایەتەوە، بەری نەدەدا، دیار بوو هەموو بە سەرسوڕماوی تەماشای یەکترمان دەکرد.

-ئەوەش تێکچوو!

ئەوەی لەو پتر جێی سەرسوڕمانە، پۆلای فاتیمە لە خۆوە هاتەگۆ و داغستانیی بە تێکچوو هەژمارد، ئا داغستانی لە گۆتەکانی کۆتاییدا تێکچوونی پێوە دیاربوو، هێندە تۆچای وشکی کرۆشتبوو، وشەکانی دەتگوت تۆچای بەر بای توندن.

- منیش دەڵێم تێکچووە، دەبێت لەمەودوا بزانین چۆن دەیدوێنین.

-کوڕە ڕاوەستە هەموومان تێکدەچین.

- ئێ، باشە خەڵك شێت دەبێت بە قەندیل دەکەوێت، ئەدی ئێمە لە قەندیلەوە شێت بین بە کوێ بکەوین!

-جوانە سەردەستەی مراویان، قسەی پێشینانیش دەگۆڕێ.

هاوڕێی گیڤارا هاتە لای دەرگاکە و تەماشایەکی دەرێی کرد لەو کاتەدا سەردەستەی مراویان دەرپەڕی، بە ڕێی داغستانیدا ڕۆیشت:

- من خەمی هیچم نیە و فشەم بەو زگچوونە دیت، من تەنها لە یەك شت دەترسم و زۆر بیری لێدەکەمەوە، دەزانن چیە؟

-بە چ بزانین !

-ئەگەر ئێستا ئایشەگوڵ پەیدا بێت و بەو حاڵە بمانبینێ، چ بکەین و چ بە خۆمان بڵێین! کوڕە بۆ ئێمە گەلێك شەەم و کەموکوریە، هیچ نموودێکمان لای ئایشەگوڵ نامێنێ، ئاخر ئەو هەموو ئومێدێکی بە ئێمەیە، ئەوهامان ببینێ، نائومێد دەبێت، ببینێت، لە باتی خوێن، وا گوو قەندیل دەبات.

- هیچ خەم لەوە مەخۆ، چاوت بە ئایشەگوڵ ناکەویتەوە.

هێند لە دڵەوە وام گۆ، پێناچێ لە تەمەنی خۆم، هیچ ڕستەیەکم وا بە دڵنیایی بێ دوودڵی لە دەم دەرچوویێت، بەڵام بە هاوڕێی گیڤاراوە دیاربوو فشەی بە قسەکەی من دێت، چیدی لە سەریشی نەڕۆیشت .

ئیدی پێویستمان بە شەکر نەما، چای تاڵ و بەس، پێدەچوو بەرەو چاکبوونەوە بچین، وێدەچێ نزاکانی داغستانی گیرابن، نزا

بوو، تۆچا بـوو، حەب و دەرزی یـان سـماقاو، یـاخود شـێلان و سوورکردنەوە، یەك لەوانە یان هەموویان پێکەوە، هەندێ کـاری کرد و شێرەکانی کەمێ هێواش کردەوە.

من تۆزێك ترسم رەویەوە، لە دڵی خۆم گوتم پێناچێـت ئەو جارەش رۆژمان هاتبێت.

تۆپ بە لوورە و زرمەوە، بەردەوام بـوو، نەدەپسـایەوە، بەفـر کلوو کلـوو دادەکـا، دەتگـوت هەسـتی کـردووە قەنـدیل پـیس بووە، پەلەی کرد لە بارینا بۆ ئەوەی زوو تا رادەی پاکێتی سپی بکـاتەوە، ئـاگر هەمیشـە ئـاگر، کـۆلکە دارەکـانی ئایشـەگوڵ ناکوژێنەوە، ئیمامەی پساوەی هەمیشە مانـدوو لە هەمـوو سـاتێك مانـدووتر دەهـاتە پـێش چـاو، کـۆخینێ کـۆخی، ئەگەر بەفـر قەندیلی نەگرتبا، لە هەمـوو لایەکەوە، بەرد جـێ لەق دەبـوون و بەردەبـوونەوە، هەسـتمکرد کـۆخینەکەی قـورِگ خـاوێنکردنەوە بوو بۆ پەیڤین، دەبێـت لە دوای ئەو کـۆخینە، چ قسـەیەکی بـێ سەر و بن سەربکات، ورد تەماشای هەموومانی کرد:

کورِینە، قسەیەکم هەیە، بەڵام بە هەڵە تێمەگەن و بە خراپی لێکـی مەدەنەوە، جارێـك لەشـکری شاهنشـا دەوریـداین، زسـتان بـوو، بەفـر چۆکێـك کەوتبـوو، ئـێمە نـزیکەی پـازدە کەسـێك دەبووین، چەندی سـەرمان هێنـاو بـرد، بە هەمـوو لایەك لێکمـان دایەوە، هـیچ رێگەیەکـی دەرچوونمـان نەدیـتەوە، هەیە و نـیە، جەنگ تا مردن، ئیدی برِیارمانـدا بجەنگـین، ئەمـن فەرمانـدەیان بووم، جێگرەکەم گۆتی:

براینە بەر لەوەی دەست بە تەقە بکەین، وا چاکە هەموومـان وەسیەتنامەی خۆمان بنووسین.

گۆتم:

لەبەرچی؟

گۆتی:

جەنگـاوەر ئەگەر مردنیشـی لـێ دوور بێـت هەر پێویسـتە وەسیەت بکات، چوونکە وەسـیەتی جەنگـاوەر بـۆ دوای مردنـی زۆر گرنگە و خەڵك وەك چاویەشە بە دوای دەگەڕێن.

ئیدی هەمووومان وەسیەتمان نووسی، دوایـیش، دوای ئەوەی شەڕێکی گەرم و درێژمان کـرد، بێجگە لە سـێ پێشـمەرگە کە یەکیـان خـاوەن پێشـنیاری وەسـیەتنامەبوو، ئەوانیـدی هەمـوو دەرچووین.

نا نا خۆ ئێمە لێرە هـیچ مەترسـیەکی ئەوتۆمـان لەسـەر نـیە، بەڵام پـێم باشـە هەریەك لە ئـێمە راسـپاردەی خـۆی بنووسـێت، ئەوەی ناشنووسێت کەیفی خۆیەتی.

نـازانم قسـەیدیکەی مـابوو یـان تەواو، بە ئەسپایی خشـی و رۆیشت، بە بێ دەنگـی تەماشـای یەکترمـان دەکـرد، چاوەڕوان بووم، پۆلای فاتیمە بێتە دەنگ و بڵێت:

ئەوەش تێکچوو.

نە پـۆلای فـاتیمە و نە کەس ئیمـامەی پسـاوەیان بە شـێت دانەنا، بێدەنگیەکە منی پتر ترسـاند، لەبەر خـۆم ئاگـام لەوان نـیە ترساون یان نا، ئاخر وەسیەت، یانی سـەر لێـواری مەرگ، یـانی ئیزرائیـل بە رێکەوتـووە، هەر بـزانە گەیشـت، وەسـیەت، یـانی کۆتایی، کۆتایی ئەو چیرۆکەی تا ئێرەم هێناوە، چیرۆکی ژیان.

هەرگیز بیرم بۆ وەسیەت نەچووە، من زۆر جار مەرگ لە تەنیشتم بووە، لە بەر دەمم بووە، کوڕە لە پشتی ملم بووە، بەڵام قەت بیرم بەلای وەسیەتا نەچووە و نەچووە.

فاتیمە نەبێت ئەوانیدی پێدەچوو وەسیەتەکەیان بە ئاسایی وەرگرتبێت، بەڵام فاتیمە ڕەنگە هێندەی من پێی تێکچووبێت، دیار بوو لە سیمایەوە دیار بوو وەسیەت ترساندبووی.

لە نێوان خۆیان وا ڕێککەوتن هەر کەسە وەسیەتنامەی خۆی لە حەفت جار لە حەبفت پارچە کاغەز بنووسێتەوە، هەر حەفت جار ڕێك وەکوو یەك بێت و بە پیتێکیش جیاوازیان نەبێت، هاوڕێی گیڤارا زۆر جەختی لەوە دەکردەوە کە وەسیەتی هەر یەکەمان پێویستە لای هەر حەفتمان بێت، بۆ ئەوەی ئەگەر شەش کەسیشمان شەهید بووین، ئەوەی دەمێنێتەوە وەسیەتەکەمان بپارێزێت، پۆلای فاتیمە پێیباش بوو کەس وەسیەتی کەس نەبینێ و نەخوێنێتەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دڵنیا دەبین لە ژیان نەماوە، هەموو پشتگیرییان لە قسەکەی پۆلای فاتیمە کرد، ئیمامەی پساوە هەر زۆر زۆری لا پەسەند بوو، بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بن لەوەی پێش مردن وەسیەتی کەس ناخوێندرێتەوە، هاتن ڕەشنووسی سوێندێکیان ئامادە کرد، یەکە یەکە دەمانگوت:

بە گۆڕی شەهیدان، هەتا لە ژیاندا مابن، وەسیەتی هیچتان نەخوێنمەوە و ڕێگەش نەدەم بە هیچ جۆرێك کەس بیانبینێت.

کە سوێند خواردن گەیشتە پۆلای فاتیمە، گوتی:

دەبێت سوێندنامەکە بۆ من دەسکاری بکەن، چوونکە....

داغستانی هەڵیدایێ:

چوونکە وەسیەتەکەی منیش ئەو دەینووسێت و دەیبینێت.

سوێندەکەی وەك خۆی خوارد، بەڵام لە کۆتایی داغستانیی هەڵاوێرد، ئێ هەریەکە و حەفت پارچە کاغەزمان لە دەست بوو، هی پۆلای فاتیمە چواردەیە، دەستمان بە نووسینی وەسیەتنامە کرد، لەو ساتەی یەکەم وشەی وەسیەتم نووسی، خەونەکەمم بیر کەوتەوە، ئەو خەونەی دەیانویست وەسیەتم پێ بنووسن، هەر زراوم چوو، یەك بە دەنگی خۆم هاوارم رد:

- من وەسیەت نانووسم، نا...

+ ئێ مەنووسە، نا ئەو هاوارەی بۆ چیە!

- بە قسەم بکەن ئێوەش مەنووسن.

+ هەقت لە ئێمە نەبێت.

سەردەستەی مراویان باش لە دەوی دامەوە، فاتیمە بە سۆزەوە تەماشای کردم:

+ بۆ خۆت سەخڵەت دەکەیت؟ هیچ نیە، بینووسی و نەینووسی، فشەیە، ئەگەر حەز ناکەیت مەینووسە.

+ من لەوە دەترسم، تکایە مەینووسن.

هەموو دایانە پێکەنین و کردیانە فشقیاتێك خوا خوام بوو وەك خۆی لێبێتەوە، بەڵام نەمدیت فاتیمە و پۆلا پێبکەنن، فاتیمە هاتە بن گوێم و نەرم نەرم پەیڤی:

تۆ زۆر بە ئاڵۆزی و قورسی شتەکەت وەرگرتووە، بڕوات

بێت شتێکی زۆر ئاسایيه، ئێ، خۆ مەرج نیه ئەوەی وەسیەت بکات بمرێت، کوره به فشەی وەربگره، دەترسم خەونت دیتبێت! زۆر خۆت به خەونەوه مەبەستەوه، راسته جاری وا هەیه خەون راستدەکەوێتەوه، بەڵام زۆربەی جار ئێره و بنی دنیا لێك دوورن و...

دەمویست بڵێم چۆنت زانی خەونم دیتووه، پەشیمانبوومەوه، یەکسەر دەستم دایەوه قەڵەم و دەستم به نووسینی وەسیەت کرد، فاتیمه له خەونەکه بەهێزتر بوو، تەواوم کرد، هێندە به سووندەکەوه پەیوەست بووم، نەموێرا هی خۆشم بخوێنمەوه یەکسەر هەر حەفت پارچه کاغەزەکەم تەن به تەن لوولدا، ئیدی دەستکرا به دابەشکردنی وەسیەت به سەر یەکتردا، ئێستا به هی خۆمەوه وەسیەتنامەی حەفت جەنگاوەرم له گیرفاندایە، خەمی ئەوەشم نیه تەڕ بێت و بسڕێتەوه، نایلۆنم تێیان ئاڵاندووه و جوان له ناو جزدان تەقەتم کردوون.

دوای نووسینی راسپاردە هەر جەنگاوەره له شتێ گۆڕا، فاتیمه له گۆرانی.

فاتیمه به نەرمی، خورمایی به زمانی بەسرایی ستران دەچڕێ، کچه بەسرایی ناوە ناوە لەبەر خۆیەوه و بۆ خۆی و بەس، بەڵام سترانی ئەو جارەی، تەنها بۆ خۆی نەبوو، کەسی له دەنگی خۆی بێ بەش نەکرد، داغستانی له هەمووان پتر گوێی بۆ دەنگی فاتیمه شلکردبوو، من لەو سترانەوه زانیم فاتیمه چ دەنگێکی خۆش و پڕ سۆزی هەیه، لەوێ فاتیمه منی گریاند، گریانێك مەگەر ئەو ساتانەی له شمشاڵدا ون دەبم ئاوا فرمێسك دابارێنم، فاتیمه هاتبۆوه، ستران دەمێ بوو تەواو بووبوو، من هەر

خەریکی گریان بووم، داغستانیی داوای لێمکرد سترناکەی بۆ وەرگێڕمە سەر زمانی چیا و بەفر، هاوڕێی گیڤارا هەڵیدایێ:

راوەستە، تێکی مەدەن بە ستران دەیلێمەوە، بزانن چۆنی دەلێمەوە:

**دێمەوە دایە، دێمەوە**

**لە دیجلەوە بێ**

**یا بە ڕێی هەورا، دێمەوە**

**بانە و بان بێ**

**یا بە بەردەمی ماڵی پادشا، دێمەوە**

**دێمەوە دایە، من دێمەوە**

**سپێدەیەك، بە چاوی خۆت دەبینی**

**لە حەوشە، لەو شوێنەی**

**بە شانەی ددان ورد**

**نەرم نەرم پرچمت شانە دەکرد**

**لەوێ لەو جێیەی چەندان تاڵی قژم**

**زویر دەبوون و دەکەوتنە سەر زەوی**

**تا لەو جێیەی سبەینان درەنگ هەتاوی دەگەیشتێ و**

**تێر تێر دەخەوتم، ببینە**

**درەختێ رواوە**

لەوێ کەس درەختی وای نەدیوە

هاتمەوە دایە، هاتمەوە

کچەکەت درەختێکە

بەوێ، بە حەوشەی خۆمان نامۆیە

سەرهەڵبڕە دایە

کچەکەت ریزێك لە پێشت راوەستایە.

(سترانی جەنگاوەر)

# ١٦

هـاوڕێی گیڤـارا فاتیمەشـی بە گریـان ئێخسـت، داغسـتانی کڕنەدەبۆوە، کەس نەبوو فرمێسك هەڵنەوەرێنێ، سەرم سـوڕما لە دەنگی هاوڕێی گیڤارا، دەنگـی خـۆش بـوو، بەڵام ئەو دەنـگەی لەو گۆرانیەوە گوێم لێبوو، تازە بوو، پێشتر نەمبیستبوو، نـا پێشـتر دەنگـی ئەوهـا خـۆش نەبـوو، سـەرم لەوەش سـوڕما چـۆن بەو دەستوبردە گـۆرانیەکەی لە زمـانی فـاتیمەوە هێنـایە سـەر زمـانی داغستانی، ئەو گۆرانیە هەر دەستبەجێ بووە گـۆرانیی جەنگـاوەر و کەس نەبوو، لەبەر خۆیەوە نەیڵێتەوە.

من ئێستا ئامـادەم بـۆ مەرگ، بەڵام ئامـادەبوونێکی رووبەڕوو نا، نا من ئەو کەسە نیم رێك و رێك چاو لە چاوی مەرگ ببڕم و منەتـی بە هـیچ نەزانـم، وا بـێ مـنەت دەچـم بـۆی دەخەوم، مەرگ ئەگەر ئـازایە بـا لە سـاتەکانی خەوتـن بێـت و چـی نەکـردووە بـا بیکـات، لەبەر خـاتری فـاتیمە نەبـا هەرگیـز ئەو راسپاردەیەم نەدەنووسی، من و وەسـیەتکردنیان نەگوتـووە هێشـتا زووە، ئاخر وەسیەت واتە مردن، بیرمـدێ بـاپیرم ئەو ئێـوارەیەی وەسیەتی کرد بۆ شەوەکەی ماڵئـاوایی لێمـان کـرد، کەس شـك نابەم وەسیەتی کردبێت لە دوای ئەوە ماوەیەکی درێژ ژیـا بێـت، ئەوەی وەسیەتی کـرد، زۆری نەبـرد، مـرد، سیامەند بـزە لە بـن

دونـدیٚ وەسـیەتی نووسـی، گەیشـتە دۆڵـیٚ و نەگەیشـتیٚ، مـار پێوەیدا و جێی کردە ئەو جیٚ.

ئومێد خەند دەمەو عەسرانێك لە بناریٚ بەدەم ڕێوە وەسیەتی خوێنـد، هەر ئەو ڕۆژە درەنگـانی ئێـوارە، فەرمانـدەکەی خـۆی تـومەز دەسـچێنی مەلیکـی بـیٚ داد دەبێـت لە نـاو جەنگـاوەران، ئومێد لە پێدەشتێکدا بە ناو بۆسەیەکی ئەنفالـدا دەبـا، گـۆڕەکەی وا بە ئامێزی شاخێکەوە.

ئەوەی وەسـیەتی کـرد، مـرد، ڕەیحـانە ئەو کـوڕەی چـوار وەرزەی ساڵ و هەمیشە دەسکیٚ ڕەیحانەی لە سەر سینگی بـوو، لە نــاو ڕەوەزە شــاخیٚ وەســیەتی نووســی، لە شــۆڕبوونەوەدا، دیاربوو بـای مەرگ هەڵیگرتـووە لە چـاو تروو‌کانێکـدا دەگـاتە ئاواییەک بە کـڵاوەی ئەژنـۆ گـوللەیەك دەگـرێتەوە، بەو چـلەی هاوینە یەك رووبار خوێنی لە بەر دەڕوات، لاشەکەی کەوتە نـاو پوونگە و ڕێحانەوە.

سەپان ئاڵا و ئاراستەی با، نێوان وەسیەت و مەرگیـان، چەنـد هەناسەیەکی کورت بوو.

دڵنیام لەوەی مەرگمان نزیك بۆتەوە، لە خۆڕا نـیە وەسـیەت دەنووسین، نەدەبوو بینووسین هێشتا زووە بۆ مەرگ، ڕاستە مردن بۆ جەنگاوەر زوویی و درەنگی نازانێت، هەقی نیە گەنجـی یـان پیر، منداڵت هەیە یان زگورتی، بەڵام هەستدەکەم بۆ من گەلێك زووە، چ تەمەنم نەکـردووە، ئەگەر لە تەمەنـی ئیمـامەی پسـاوە، یان داغستانی بام، چ گـوێم لە مـردن نەبـوو، ئەوان زۆر ژیـاون، ماڵ و منداڵیان هەیە.

**کوڕینە، دەزانن، مردن لە چ تەمەنێك خۆشە؟**

ئەوە سەردەستەی مراویانە دیسان بە پرسیارێك هەموومانی لە خۆی کۆکردەوە، پرسیارێك دەڵێی ئاگای لە گفتوگۆکانی ناوەوەی منە، ئەویش نانێکی لەگەڵ ئەسحابەکوژ خواردووە، رەنگبێ لە چاومەوە دڵمی خوێندبێتەوە.

**یان زۆر زۆر پیر بوویی، یان زۆر زۆر گەنج کە هێشتا ماڵت پێکەوە نەنابێت.**

وەڵامی داغستانی بۆ من سەیر و جێی سەرنج بوو، زۆر هێنام و بردم هیچی تێنەگەیشتم، لێیم پرسی:

- بۆ ئەوها؟

+ کاتێ زۆر پیر دەبیت، خێزانت نەماوە تا بۆت بگری، منداڵەکانیشت گەورە بوونە هێندە خەفەت لەو مردنەت ناخۆن، لە کاتی گەنجیش کە دەمری لە دوای خۆت گرفت بەجێناهێلی، واتە نە هاوسەر نە منداڵ هیچت نیە، بەڵام ئەگەر لە تەمەنێك بمریت کە هاوسەرت ماوە و منداڵی وردت هەیە ئەوا دنیایەك کێشەو گرفت بۆ هاوسەر و سێویەکان بەجێدەهێلیت، ئەدی وا نیە!

ئیمامەی پساوە:

وایە، منیش هەر خەم لە ماڵ و منداڵەکانم دەخۆم، دەنا چ گوێم لە مردن نیە، خۆ راستە مرۆڤ چەندی بە تەمەندا بچێت، پتر ژیانی خۆشدەوێت، مرۆڤی گەنج زۆر رێزی ژیان ناگرێت، هەندێك سەرەڕۆیە، فشەی بە ژیان دێت، بە راستی من کە بیر لە مردن دەکەمەوە، خەریکە شێت دەبم، نەك لە ترسی خۆم کە دەمرم و چیدی ژیان نابینم، تامی ناکەم، هەناسەی لێنادەم، نا،

لەبەر ئەوانە نا، لەبەر منداڵەکانم، هەتیو دەبن، راستە ئێستاش هەر لە ریــزی هەتیوانن،کــوا چ دەمبیــنن و دەیــانبینم، ئێســتا ئەوی گچکە ببینم نایناسم، دەزانن لە کەیەوە نەمدیتنە! بەڵام هەر باشـە خۆ بە خۆیـان نـاڵێن هەتیـو، دەزانـن بابیـان هەیە و جەنگـاوەرە، ماوەو شەڕ دەکات.

تەنهـا داغســتانی و ئیمــامەی پســاوە وەڵامــی پرســیارەکەی سەردەستەی مراویان دایەوە، هەستیکرد، پرسیارەکانی گرنگیـان نەمـاوە، ئەوە یەکەم پرسـیاری سەردەسـتەی مراویـان بـوو، تەنهـا دوو کەس وەڵامبــدەنەوە و ئەوانیــدی فەرامۆشــی بــکەن، ئەو پرســیارە بە لای مـنەوە زۆر گرنـگ و لەجـێ بـوو، دەمویسـت وەڵامێـك بـدەمەوە، نەمـدەزانی چ بڵـێم، خـۆم بێـدەنگ کـرد، سەردەستەی مراویان خۆی پێنەگیرا:

دیارە کەسیدی وەڵامنـاداتەوە! وەڵامـی خۆشـم بـۆ پرسـیاری خۆم، ئەوەیە، مـن حەزنـاکەم بمـرم، تـا ئەو سـاتەی ژن دێـنم و کوڕێکم دەبێت، کە کوڕەکەم زمانی گرت و پێیگوتم بـابە، کە پێی گرت و بە رێدا رۆیشت، ئەوجا بشـمرم، فشـەم پێـدێ، مـن دەمەوێ وەچە بـخەمەوە، دوای خـۆم دەڵـێن ئەهـا ئەوە کـوڕی سەردەستەی مراویانە! دەزانن چەند خۆشە!

وەڵامەکەی سەردەستەی مراویـانم بە دڵ بـوو، ئـا پیـاو ژن و منداڵی هەبێت خۆشە، هـێ لەوەش پیـاو پـێش ژنهێنـان بمرێـت، زۆر نامرادە، ئاخر دەکـات هـیچ تـامی ژیـانی نەکـردووە، تـامی ژیان بۆ پیاو وەك من تێیگەیشـتبم لە تـامی ژنەوەیە، هـی ژنـیش هەر دەبێـت لە پیـاوەوە بێـت، سەردەسـتەی مراویـان جـوانی بـۆ چووە، کە چەند ساڵێك تامی ژنت کـرد و منـداڵت بـوو، ئیـدی

مردن فشەیە با بێت، من چوار پێنج ساڵ لە باوەشی مەهناز بخەوم، کورە بەسمە ژیانم بەسە، کە بیرم لە تریفەش دەکردەوە، هەستمدەکرد داغستانی و ئیمامەی پساوە جوان قسان دەکەن، کێ ناڵی من ئێستا کە هێندە لە مەرگ دەترسم لەبەر خاتری تریفە و مەهناز نیە، ئا تریفە بێ باوك دەبێت، دڵنیام مێردەکەی مەهناز لە شەڕی ئەنفال سەری تیاچووە، مەهناز ئێستا چاوەڕێی من دەکات، خۆ کە لە بن رەشماڵەکە دەرچوو، وابزانم قسەیەکی کرد بۆنی یەکتر دیتنەوەی لێدەهات، ئا ئەگەر ئێستا بمرم، مەهناز بێوەژن دەبێت، تریفە هەتیو دەبێت، نا من لەگەڵ قسەی سەردەستەی مراویان نیم، ئەوەتا ژن و منداڵیشم هەیە، کەچی زراوم لە مەرگ چووە، نا سەردەستەی مراویانیش راست دەکات، ئەوانیدیش راست دەکەن!

**لە زیرەی زنجیر دڵت نەلەرزێ**

**پێوەن بۆ لەشە نەوەك بۆ گیان**

ئەوە هاورێی گیڤارایە سروودان دەچرێ و فشە بە مردن دەکات، لە کاتێکی باش سروودی چڕی و منی پەرت و بڵاوکردەوە و خڕیکردمەوە، زۆر جار سروود دەرمانترین دەرمانی دەردانە، باشترین دکتۆری دەروونیە، ئەو سروودە نەبا، رەنگبوو لە نێوان وەڵامەکانم بۆ پرسیارەکە، تووشی سەرگەردانیەك ببم کە هەموو رێگاکانی بەرەو شێتبوون دەچوون، هاورێی گیڤارا زۆر جار بە کەڵکم هاتووە، ئەو جارەشی هاتە سەرێ.

تۆپەکان ناپسێنەوە، بەفر ناپسێتەوە، ئاگریش ناپسێتەوە، نەبەتداریش هەر بە نەپساوەیی دەمێنێتەوە، زریان وا لە سەر

هەڵکـردنە، قەنـدیل ئەوەی خۆشـە شـەو و ڕۆژی دیـار نـیە، ژەمەکانی خواردن دیار نین، میلی کاتژمێر بە هەوەسی خـۆیەتی هەر جـارەی بە لایەکـدا دەسـووڕێتەوە، مـن تەماشـای کـاتژمێرەکەی خـۆم و فـاتیمەم کـرد، پـێچەوانەی یەکتـر دەسـووڕانەوە، سـەرەتا ئەوەم زۆر لا سـەیر بـوو، ئێسـتا لام زۆر ئاساییە، ئەگەر وانەبێت، ڕەنگە نائاسایی بکەوێتەوە.

لە نان و چـای ئایشـەگوڵ و خواردمـان و خواردمـانەوە، لە تووتنی داغستانیمان کێشا کە بایی ساڵێکی داکردبـوو، هەنـدێك بەرەو بەفرماڵین چوون، نۆرەیان بوو، لە کۆڵەپشـتەکەم کـاغەز و پێنووسم دەرهێنا.

**نامناسنەوە**

**سیمام پرووشەی بەفرە و**

**بایێ هەڵیگرتووم بۆ ئەوێ**

**ڕامسپاردووە لە ناو چاوی دامبەزێنێ**

**بەڵام نامگرێتەوە**

**نیشانەی هیچ وەرزێ لە من نابینێتەوە**

**نایناسمەوە**

**چاوم پڕ پڕە لە بێخەوی**

**تیچاوێ نەماوە بۆ دیتن..**

**تفەنگ بوو ڕەنگی بێ وەرزیی پێدا پژاندم و**

مالی خۆمان نامناسنەوە

تفەنگ بوو رەنگی مالی ئێمەی کالکردەوە و

لەوێ کەس نەناسمەوە

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٧

هێندە بەفرمان بە دەوری خۆمان هەڵداوەتەوە، شوێنەکەمان لە شێوەی چاڵێك خۆ دەنوێنێ، چاڵێك لە ناو بەفری قەندیل، لەو چاڵەدا دوو ژووری هەریەکە حەفت کەسی و سەرشۆرکێکی گچکە هەیە، ژوورێکیان لە چادر کە لە ماڵی ئایشەگوڵ دیتمانەوە، ژوورەکەیدی لە بەرد ئەو ژوورە لەوەتی دنیا دنیایە هەیە، رەنگە بەر لە ئێمە جێی کۆبوونەوەی فریشتان، یان ئاودەستی شەیتان بووبێت، سەرشۆرکی دەستکردی پۆلای فاتیمەش.

لەو چاڵەدا حەفت جەنگاوەر، ژنێك و شەش پیاو، لە چاوەڕوانیدا دەخۆن و دەخەون و کاری بەفرماڵین و... ناوە ناوەش دادەبەستنە شایی و سەما، ئاگریش هەرگیز ناکوژێتەوە، هەناسەدان و وەرگرتنەوە لە بیربکەن، خۆشکردنەوەی ئاگر لە بیرناکەن.

حەفت جەنگاوەر لە ناو یادەوەریی خۆیاندا دەژین و وەك گوڵەبەڕۆژە دنك دنك کات دەقرتێنن، حەفت جەنگاوەری تەمەن هەمە ساڵ بە دووی یەکدا ئێشك دەگرن و لەو بازنەیەی ئێشکگری هەڵە ناکەن، حەفت جەنگاوەری هەمیشە گوێقوڵاخ، بێ پسانەوە گوێیان هەڵخستووە بۆ لوورە و زرمەی تۆپ، حەفت جەنگاوەری چاو تیژی دنیا دیتە، رێیان بزرکردووە و بە دنیا

ناکەونەوە، حەفت جەنگاوەری لاسار، وەك چۆن کەتیرە بە قژەوە دەنووسێت، ئەوها بە قەندیلەوە نووساون و لێی نابنەوە، حەفت جەنگاوەری هەمیشە بەئاگا، هەر حەفتیان لە دەستی خولەوە تفەنگیان وەرگرتووە و لە ڕێی کونەگورگیشەوە گەیشتوونەتە کونەکۆتر و لەوێوە دنیایان کردووە، هەر لەوێوەش ئاودیوی دیوی قەندیل بوونە و ئێستاش ڕێی دنیا نابیننەوە، لەو حەفت جەنگاوەرە سیانیان هەر ئەو جارە نا پێشتریش قەندیلیان دیتووە، بەڵام وەك من دەبینم هیچی لە بارەوە نازانن، یان ئەو قەندیلەی ئەوان بینیویانە ئەو قەندیلە نییە کە ئێستا ئێمە دەحەوێنێتەوە، کچێکمان لەگەڵە خەڵکی ناو دارخورماکانی بەسرایە من ناوم نا فاتیمە، هەر بەو ناوە ناسرا، سەرم سوڕماوە نازانم چی منە! چی ئەوان دەبێتەوە.

حەفت جەنگاوەری تینووی خەوین، بە دزی جاسووسانەوە خەونی خۆش بە کۆگەوە دەبینین و هەترەشیشمان لە چەکوچ چووە، ناوێرین سەر بەرز بکەینەوە، حەفت جەنگاوەرین، ئەگەر شەشەکەیدی وەك من بیربکەنەوە، هیچمان دڵنیا نین لەو ژنەی لە سیما و بەرگی ئایشەگوڵدا بە ناو ئەنفال و زریاندا خۆی گەیاندە ئێمە و بەرانپیلێ خواردنی بۆمان هێنا و ماڵێکی تەواویشی بۆ دۆزینەوە، دڵنیا نین کە ئەو ژنە ئایشەگوڵ بوو یان نا.

+ ئەوە چی دەنووسیت؟

- ئەها! لەگژم یادەوری دەنووسمەوە.

+ جوانە، برۆ دوای، منیش هەندێکم لێی نووسیەوە، بەڵام گەیشتمە جێگەیەك، رایگرتم و نەمتوانی چیدی بنووسم.

- چ شوێنێ رایگرتی؟

+ کونەکۆتر.

- ئەو جێیە نەبێت کە پێکەوە سەیری ناسك و دایکی ناسکمان دەکرد؟

+رەنگبێ، یان جێیەکیدی، نازانم، بە هەرحاڵ ئەوەی نوسیبووم هەموویم دڕاند، بە دڵم نەبوو، دەمەوێ سەرلەنوێ بنووسمەوە، دوورنیە ئەو جارە لە کۆتاییەوە دەستپێبکەم...

فاتیمە قسەی تەواونەکرد، لەوانەیە تەواویش بووبێت، یەکپێ هەستا، دیاربوو بۆ سەر پێشاو چوو، فاتیمە لە نووسینی کردم، ئەوەی نووسیبووم پێچامەوە و خستمە ناو کۆڵەپشتەکەمەوە، بیرم لەو کۆتاییە کردەوە کە فاتیمە دەیەوێ لێیەوە دەستپێبکات، هەوڵدەدەم تێبگەم ئەو کۆتاییەی ئەو دەیلێ ئەو کۆتاییەیە کە من کردوومەتە دەسپێك، یان کۆتاییەکیدی هەیە، چاوەڕێم فاتیمە بێتەوە وئەو پرسیارەی لێبکەم، لێشی دەپرسم، بێ شەرم پێیدەڵێم لە یاداشتەکەم بە ژن ناوت بێنم یان کچ، دەزانم بەو پرسیارە تووڕە دەبێت، تووڕەش نەبێت لە دڵی خۆش نیە، بەڵام هەر لێی دەپرسم، ئەدی ئەوانەی یاداشتەکەم دەخوێننەوە. نابێت بزانن، فاتیمە کچە یان ژنە! با بێتەوە ئەو شتانەی لەگەڵ یەکلا دەکەمەوە، چا کچ بێ یان ژن چی دەگۆڕێ!

پێیدەڵێم بە چی خۆم، بە چی پۆلا، ناوت بهێنم، با بێتەوە خۆم دەزانم، چۆن چۆنی قسەی لەگەڵ دەکەم و بە نەرمی قسەی لێ دەردێنم، نا واناکەم، جوان نیە، چۆن دڵی ئەو کچە تاقانەیە لە خۆم دەڕەنجێنم، دێم بۆی دەخوێنمەوە، بە شتێ ناوی دەهێنم وتامی زاری دەکەم، بزانم هەڵوێستی چۆن دەبێت،

ئەگەر قسەش نەکات بە سیمایەوە بە دیار دەکەوێت، ئا لە کاتی خوێندنەوەی یاداشتەکەم چاوێکم بۆ ئەو تەرخان دەکەم و لە سەر سیمای ئەو هەڵیناگرم.

زرمەیەك رایچڵەکاندم، دەنگی گەلێك گەورەبوو، وام هەستکرد وا لە ئاسمان بەرد بە بەرد دەکەوێت، هەموو بە پرتاو هاتنە ژوورەوە، بێدەنگ بە دەوری یەکتر و بە دەوری ئاگردا خڕبووینەوە، کەس ورتەیەکی لێوە نەدهات، هەموومان حەپەسابووین، لەوەتەی لەماڵی فریشتان و ماڵی ئایشەگوڵ مێوان بووین، زرمەی وا گەورەمان نەبیستبوو، هاوڕێی گیڤارا چووە دەرێ بە دوای ئەودا ئیمامەی پساوە، هەموومان بە دوایاندا، دیاربوو زۆر نزیك نەکەوتبووەوە، دووراییەکەی هەر وەك ئەوانیدی بوو، پێدەچوو بەر بەردێکی گەورە کەوتبێت، هێندە گرنگیم پێنەدا هاتمەوە ژوورێ، بە دووی مندا یەکە یەکە بە ژوور کەوتن، چاوەڕێ بووین، بزانین زرمەی وا گەورەی بە دواوەیە یان هەر ئەوە بوو، بڕایەوە.

پێدەچوو جگە لە من و پۆلای فاتیمە ئەوانیدی قسەیان لە زاردا بێت و بیانەوێت بیکەن، هاوڕێی گیڤارا چەند جارێك قوڕگی قسەی خاوێنکردەوە، هەستم بەوە کرد دەیەوێت قسەیەکی گرنگ و ترسناك بکات، سەیری هەمووماني دەکرد، دەیویست بیکات و دەیگێڕایەوە، بە تیچاو تەماشایم دەکرد، باش شارەزای ئەو کوڕە بووبووم، هەرکاتێك گۆلمێك قسەی گرنگی لە کن با، بە زەحمەت بە هەزار ئحم ئحم بە گۆڕێی وەردەکرد، دەیهێنا و دەیگێڕایەوە، دەهاتە سەر زاری و قووتیدەدایەوە، بە تەواوی تێگەیشتم قسەیەکی گەلێك ترسناکی لە ناو زارە، لە خۆوە ترسم لێنیشت، نا لە خۆوە نەبوو، زانیم

مەترسییەك لە پێشمانە، یەکسەر خەوم هات، دەمویست جێی پێیەکانم بکەمەوە و رابکشێم.

+ وا تێبگەم مانەوەمان لێرە زۆری نەماوە.

-کوو وایە، بە شەڕ یان بە خێرا ئەی روو لە کوێ دەکەین؟

+ روو لە کوێ دەکەین نازانم، بە خێر دەکەوێتەوە یان بە شەڕ ئەوەش نازانم، چۆن و کەنگێ، هەر نازانم، ئەوەی دەزانم دەبێت بیرێکی وردی لێبکەینەوە، وەك دیارە تۆپباران تا دێ خەستتر دەبێتەوە، بە خۆتان لە من باشتر دەزانن ئەو تۆپبارانە بەلاش نییە، لە خۆوە نییە، دوای هەر تۆپبارانێکی لەو شێوەیە هێرشێکی گەلێك گەورە بە دواوەیە، ئەگەر بە تۆپیش تیا نەچین و بە رێکەوت نەمانگرێتەوە، ئەوا هێرش دێنن و زوو یان درەنگ رەنگە بگەنە سەرمان.

ئیمامەی پساوە کە شانی دابۆوە، یەکسەر قیتبۆوە، بە دەنگە تایبەتییەکەی خۆی:

- نا، من پێموانیە سوپا و جاش هێندە دەبەنگ بن بەو بەفر و زریانە، بەو دنیا خراپبوونە، هێرش بکەنە سەر قەندیل، نا، ئێ، با هێرشیش بێنن، وای دانێ هێرشیان هێنا، کێ لە ترێ سەی دەچێت! هەر بە خۆیان، هەر لە ناو زریانێ سەگەنازیان دەگاتێ، با بێن، هەر پێویست بەوە ناکات ئێمە یەك تەقەش بکەین، بەڵام ئەوەی نازانم ئەگەر بە رێککەوت تۆپێك لە نزیکمان بکەوێت، چ دەبێت یان نابێت، بۆ ئەوە هیچی لێنازانم.

+ هێرشهێنان بە دوور نازانم، وێدەچێ تۆ لە من باشتر بزانی، بێگومان باشتر ئاگات لێیە، زۆر جار بە بەفر و بارانێش

هێرش کراوەتە سەر جەنگاوەران، دوایی بە خۆت دەزانی نیوەی دنیا جاشە، پاشاکان ئەگەر قیچەك دەست بە سەربازیشەوە بگرن، دەست بە جاشەوە ناگرن، چەندی لێیان بکوژرێ گوێیان لێ نیە، جاش کەرن هێرش دەکەن ئەگەر نەیکەن پێیان دەکەن، چەندی دەکوژرێن جێگەیان چۆل نابێت، سەد جاش دەکوژرێن دووسەد جاش جێیان پڕدەکەنەوە، من دڵنیام لەوە کە دوای وەستانی تۆپ یەکسەر هێرشێکی گەلێك گەورە لە هەر چوار لاوە دەکرێتە سەرمان، ئەوەش بزانن ئێمە بایی شەڕێکی دوور و درێژ فیشەکمان لا نیە.

هاوڕێی گیڤارا و ئیمامەی پساوە ملیان لە بەر ملی یەکدی نابوو، هیچیان بۆ ئەویدیان نەدەسەلماند، هێرش دەکرێ هێرش ناکرێ درێژبۆوە، من لە قسەکانی هاوڕێی گیڤارا پتر راستیم هەڵدەگرتەوە، وا بزانم ئەوانیدیش هەر بە لای هاوڕێی گیڤارادا دەیانشکاندەوە، بە تەواوی ترس هێرشی بۆم هێنا، لە چاومدا سێبەری جاش و سەرباز جوولە جوولیان بوو، ئا زۆر ترسام، وەك چۆن بەفر قەندیلی داگرتووە، وەك چۆن تۆپ قەندیلی داگرتووە، وەك چۆن بێدەنگی پۆلای داگرتووە، وەك چۆن تووڕەیی داغستانیی داگرتووە، ئاواش ترس منی داگرتووە و لێم نابێتەوە.

ئێستا لە دەنگی تۆپ ناترسێم، ترسی من لەو ساتانەیە کە تۆپ قرِوقەپی لێدەکات، هەتا چەند ساتێکیش لەمەوپێش نزام دەخوێند بۆ بێدەنگبوونی تۆپ، دەمگوت:

ئەی خوداوەندی تۆپ، تۆپەکان زۆر ماندوون پشوویکیان بدێ.

ئێستا حەزدەکەم تا دنیا دنیایە، هەتا قەندیل قەندیلە، هەتا ئێمە جەنگاوەرین، لوورەی تۆپ، لرمەی تۆپ، هەر بەردەوام بێت و نەبڕێتەوە، با قەندیل لە ناو دەنگی تۆپدا تەمەن بە ڕێبکات، خوداوەندی تۆپ، دەنگی تۆپ زۆر خۆشە، با هەر بێتە گوێ و نەپسێتەوە، خودایە لێمان تێك مەدە لە هیچمان کەم نیە، جێمان خۆشە، بە قسەی داغستانی مەکە، ئەو پیاوە هەر لە منداڵیەوە ناشوکرە، چ زۆرە لە سایەی سەری ئایشەگوڵەوە خواردن زۆرە، چایە زۆرە، توتن و پەڕە جگەرە لە بڕانە، دوو ژوورمان هەیە، سەرشۆرک هەیە، هەتا رۆژی حەشر کۆلکە دار بسووتێنین لە بن نایە، لە هیچمان کەم نیە، دەنگی تۆپیش چ نیە، هیچ بێزارمان ناکات، لێمان تێك مەدە، لە چوار لاوە ئەو هەموو جاش و سەربازە هێرش بێنن ئەگەر دنیایەکیشیان لێ پەلەواژ بکەینەوە، دنیایەکیدی جێگەیان دەگرنەوە و هێرش دەکەن و پارچە پارچەمان دەکەن.

## دەڵێی تێکچووی! ئەوە چ خوداوەندتە!

فاتیمە گرتمیەوە دەنا دەست بە نزاوە دەگەیشتمە ئاسمان، تێگەیشتم هەر بە لەش لە ناویانم، دەنا گەلێك لێیان دوور کەوتوومەتەوە و هیچ ئاگام لە باسوخواسان نەماوە.

-کوڕینە، من لە بەلاش و لە خۆوە و بێ هۆ رقم لەو قەندیلە توڕەهاتە نابێتەوە، ئەو گوللەی لە ناو دڵی منە، لە دڵی هەر یەکێك لە ئێوە بێت، لە من پتر رقتان لە قەندیل دەبێتەوە، ئەو گوللە لەو قەندیلەوە هاتە دڵی من، بە بەردێکی ئەو قەندیلە کەوت، ئەو دەمەی من دەڵێم لە هەندێك جێگە بەرد بە دیارەوە بوون، ئا لە بەردەکەوە هەڵبەزیەوە و ڕێك خۆی کوتایە ناو دڵی

من، سووندی خوارد نایەمە دەرەوە، بە نەفرەت بێت قەندیل بە بەفر و بەردیەوە، بە هەموو شتێکیەوە، هەزار جارم گۆتیە ئەو قەندیلە بەڵایە، بە خودای هەزار پشتئاشانی لە خۆی حەشارداوە، ئەنگۆ نازانن، من ئەو قەندیلە حیزە باش دەناسم، بە قسەی من دەکەن هەتا زووە با بڕۆین، بە هەر لایەکدا بێت با بڕۆین، با سەری خۆمان هەڵبگرین، لە دەرەوەی ئاقاری قەندیل هەر چیمان بە سەربێت خۆشترە لەوەی لە قەندیل بە سەرماندا بێت، ئەو قەندیلە بەس بۆ ئەوە باشە پێیدا بڕیخێنێت، ئێ لە تێریش پێیدا ریخاندمان، بە گوو سواخدانێك سواخمان دا، بەفریش ئەوهای سواخ نەدایە، هەتاهەتایە هەر بۆنی گووی ئێمەی لێدێت، شەیتانیش هێندە گووەی پێدا نەکردووە، قەندیل هی ئەوە نیە ئێمە خۆمانی لە سەر دابنێین.

هاوڕێی گیڤارا دیار بوو خۆشیی لە قسەکانی داغستانی نەدەهات بە دزیەوە هەر سەری لێ بادەدا، بە خۆی نەوەستا:

+من پێموایە باش نیە، هیچ جەنگاوەرێك سووکایەتی بە قەندیل بکات، قەندیل هێمای مانەوەیە، هێمای سەربەرزیە، لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی مید، قەندیل بۆتە جێگەی مانەوە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن بڕۆن بۆ خۆتان پرسیار بکەن، لەو دەمەوە هەتا ئێستا ئەگەر قەندیل نەبا، ئەنفال یەك هەناسەی بە چیاوە نەدەهێشت، بۆیە نابێت سووکایەتی بە قەندیل بکرێت، بۆیە مردن لە قەندیل شانازیە، بە دەست هەموو کەس ناکەوێت.

- ئەو کچەش خوشکی خۆمە، لەو کەسە بەم کە ئەو دەرسەی دای.

هەموو دایانە قاقای پێکەنین و لە سەرپشت کەوتن، پێکەنینی

فاتیمە لە ناو پێکەنینان، دەتگوت شنەی شەماڵە بە ناو قژی پرژی هاویندا گوزەر دەکات، پێکەنینی فاتیمە خۆ پێکەنین نەبوو، سەدایەك بوو لە گەرەکی فریشتانەوە بەرزدەبۆوە، پێکەنینێ بوو، ئارامیی دەبەخشیە ئەوکەسانەش کە خوێن بەری چاوی دەگرتن، ئارامتر لەو ئارامیە گۆتی:

باشە ئەوە بڕیارماندا بڕۆین، وا خۆمان کۆکردەوە، فەرموو کێ پێشمان دەکەوێت؟ کەس هەیە توانای شکانی ئەو بەفرەی هەبێت کە ناشزانێت بەرەو کوێ دەڕوات و ڕێگە چەند دوورە!

سەردەستەی مراویان کە ماوەیەك بوو بێدەنگ بوو، ئەو نەبووە هێندە بە بێدەنگی بمێنێتەوە:

- یەك کەس هەیە توانای شکانی ئەو بەفرەی هەبێت.

+ کێیە ئەو کەسە؟

- ئەسحابەکوژ.

+ تەح! شیر دا لۆ داپیر دا، ئەوجا کێ دەستی دەگاتە ئەو پیاوە!

ئای! ئەسحابەکوژ لە کوێی، من دەزانم تۆ چ ڕچەشکێنێکی ئەفسانەیی، خۆزگە لێرە دەبووی، من دەزانم تۆ چۆن بەفر دەشکێنیت، سێ بەژنە بەفر بکەوێ و ڕێگەش ڕێگەی نیوەی دنیا بێت، گوێت لێی نیە، دەیشکێنیت و دەردەچیت، هەر من دەزانم چۆن بە شان و سینگ بەفر دەشکێنی و ڕێگە دەکەیتەوە، ئەگەر لێرە دەبوویت، چەند بە ئاسانی بەفرت تەخت دەکرد و ڕێگەت بۆمان دەکردەوە، ئەی خوداوەند، ئەسحابەکوژمان بۆ بنێرە، چاوەڕێی دەکەین، ئەوەتا لە چاوی

هەمووانەوە، چاوەڕێیی ئەسحابەکوژ دیارە، ئەو قسانەم لە دڵی خۆم گوتەوە، بەڵام هەر لە خۆوە ئەو قسەیەم هەڵدا ناو قسان:

+ یان خولە یان ئەسحابەکوژ نەگەنە ئێرە، ئێمە بەو بەفر و زریانە بە هەرلایەکدا رێگە بگرین تیادەچین.

- ئەوجا ئەگەر خولە لێرە با، خەمی چیمان بوو، لە چاوترووکانێکدا دەیزانی رێی نزیك کامەیە، رێی دەرچوون کامەیە، ئەو هەر بە بن بەفرێدا دەڕوا خۆ پێویستی بە بەفر شکاندنیش نیە، ئەسحابەکوژ تاکە پیاوە لە دنیایێ ئەو توانایەی هەبێت لە بەفر شکاندن، هەر شۆفەڵێکە بۆ خۆی، بینیومە چۆن لە ناو بەفر رێگە دەکاتەوە.

- ئەدی مەستوورە! نەتانبینیوە، چۆن لە سەر بەفر بە فڕین دەفڕێت، پێی لە بەفر نوقم نابێت، لێرە با، هەوکە تا حەفتت نەدەژمارد، ئەو نیوەی قەندیلی کردبوو.

- راستە، من بە چاوی خۆم رۆیشتنی ئەوم لە سەر بەفر بینیوە.

پۆڵای فاتیمە چاوی بڕیوەتە ئاسمان، دەگەڕێت دڵنیام لە ئەستێرە دەگەڕێت ئەو ئەستێرەی هەر خۆی دەیناسێت و کەس نا، ئەو ئەستێرەی لەگەڵ هەڵهاتنی، دەستی دەگرێت و ئێمەش بە دوایەوە، دەمانبات، دەمانبات، هەر دەمانبات، هەتا لە دنیامان نەکاتەوە، ناوەستێت.

- ئایشەگوڵتان لە بیرکرد!

- ئەو گیڤارۆکە بە ئایشەگەڵی گرتووە، ئێ کوڕە ئەگەر ئەو جارەش بگاتە ئێرە کە ناگات، چیمان بۆ دەکات، هەندێك

خواردنمـان بـۆ دێنێـت، تێـر دەمانگرێنێـت، پێمانـدەڵێت: لێـرە بمێننەوە ئێوە بێرەوە پیاون، نەکەن قەندیل چۆلبکەن. ئیـدی هەتـا شل دەبێت ئەو قسە بێ کەلکـانە دەکـات و دوایـیش بـۆ خـۆی لێیدەدا و دەڕوا.

- من وای دەبینم ئایشەگوڵ دێت و بە تەنێش نـیە، خـولە و ئەسحابەکوژیشـــی لەگەڵە، ئـــا هەردووکیـــانی لەگەڵە، ئەگەر هەردووکیشیان نێن، یەکیان هەر دێت، دڵنیام ئایشەگوڵ بە تەنـێ نـایەتەوە، هێنـدە بـاوەڕم بە خەون و ئەو شـتانە نـیە، بەڵام ئەو خەونەی دەمێـدی دیـتم، هـی ئەوە نـیە، جـێگەی بـڕوا نەبێـت، ئایشەگوڵ هـات هەردووکیـانی لەگەڵ بـوو، ئەنگـۆ نووسـتبوون، پرخەپرختـان دەهـات، مـن ئێشـکگر بـووم، نهێنیـی شـەویش ئایشـەگوڵ بـوو، نزیکبـوونەوە، ئایشـەگوڵ گـۆتی: دەی کـوڕم، برادەران بە ئاگا بێنە و پێیانبڵێ، با خۆیان ئامادە بـکەن، پێیـانبڵێ، ئێمە دەرچووین و سەرکەوتین.

هـاوڕێی گیڤـارا هێنـدە بە خۆشـی و بە بـڕواوە خەونەکەی دەگێڕایەوە، هێنـدەی نەمـا بـوو تەقەی خۆشـی بـکەم، لە چـاوی ئەوانیدیشـەوە، خۆشـی و گەشـاوەییم چنیـیەوە، تەنهـا داغسـتانی نەبێت:

- تڕحێو! هاوڕێی گیڤارا! لە ڕێی خەونەوە، بە تەمـای ڕزگـار بیـت، لە ڕێـی خەونەوە ئایشـەگوڵ ڕزگـارت دەکـات، بە خـوا جوانە!

+ فشەی بە ئایشەگوڵ دێـت! دە ئەو هـاتنەی ئایشـەگوڵ بـۆ قەندیل ئەو هاتنەی کە هەتا ئێستا تۆ خواردنەکەی دەخۆیـت، لە ناو چادرەکەی دەخەویت و لە سەرشۆرکەکەی خۆت دەشۆیت

و به کەیفی خۆت کۆلکەداری ئەو ئاگر دەدەیت، ئەگەر ئەو هاتنەی ئایشەگوڵ بە ناو ئەنفال و زریاندا وەك خۆی بگاتە گیڤارا، من دڵنیام ناوی خۆی دەکاتە گیڤارای ئایشەگوڵ، تۆ بزانە ئەوەی ئایشەگوڵ بە بەر چاوی ئێمەوە نواندی، بە حەفتا پیاوی وەك من، تۆ بڵێ بە حەفسەد ناکرێ، غەدرە قسە بە ئایشەگوڵ بگوترێ.

داغستانی وەك بڵێی لە قسەی خۆی پەژیوانبووبێتەوە، وا هاتە بەر چاو، مژێکی زۆر قووڵی لە جگەرەکەی دا و بە شێنەیی گوتی:

- کوڕە، بە خەڵەت لە من تێمەگە، قسەی خراپم بە ئایشەگوڵ نەگوتووە، باشە تۆ دەڵێی هەر ئەو تۆپانە راوەستن، هێرش دەستپێدەکات، منیش هەر وای بۆ دەچم، لەو لایەش دەڵێی با چاوەڕوانی ئایشەگوڵ بکەین، تێناگەم، ئەگەر هێرش گەیشت و ئایشەگوڵ بە خۆو بە دوو خدری زیندەوە نەگەیشت، ئەو دەم چ بکەین؟!

+ چ قەیدیە! خۆ دەستمان نەبەستراوە، شەڕ دەکەین، هەتا شەهید دەبین، شەڕ دەکەین، جێگاکەمان بۆ شەڕ عەیبی نیە، دەبێت شەڕێك بکەین، لە دنیا و قیامەت دەنگ بداتەوە، دەبێت هێندە سەرباز و جاش لە خوێن وەردەین لەو قەندیلە رووباری خوێن هەستێ و سەران ببا، داستانێك تۆمار دەکەین، تا دنیا دنیایە، دەبێت ناوی ئەو حەفت جەنگاوەرە لە سەر زاران بمێنێتەوە، ورد و درشت بە حەفت قارەمانە نەمرەکە ناومان بێنن، ئەگەر یەك دووانێکیشمان دەرچووین، ئەوا باشتر، بە جوانی داستانەکە بۆ خەڵك دەگێڕێتەوە، ئەوە وەسیەتیشمان کردووە، خەمی چیمانە!

- کوڕە تۆ بۆچی لە من تێناگەیت؟ دەڵێی سووندت خواردووە لە من تێنەگەیت! کاکە، من نامەوێ لەو قەندیلە بمرم و بڕایەوە، گوو بەو...

+ دوایی کێ دەڵێ لە گەرمەی شەڕ، ئەو برادەرانەی کە ئێستا لە ئاقاری قەندیلن فریامان ناکەون، بە دووری نازانم خولەش هەر لەو دەوروبەرە بێت، ئەو دەم ژمارەمان گەلێك زۆر دەبێت، پێکەوە شەڕ دەکەین، مسۆگەر شەڕەکە دەبەینەوە، ساخ و سەلامەت دەمێنینەوە، با یەك دوو شەهیدیش بدەین، بە خۆتان دەزانن شەڕی ئەوها گەورە شەهیدی هەر دەوێت، ئەودەم لەشکر و جاشی هەر چوار دەوڵەت وەها تەمبێ دەکەین، جارێکیدی روویان نەیەت هەر رووش بە لای قەندیلێ وەربگێڕن، ئەنگۆ راوەستن با هێرش بکەن، ئەو دەم خۆیان دەبیننەوە.

- چ بڵێم، تۆ لە ناو ئەو بەفرە ئەستوورە کە کەس نازانێت چەند بەژنە، بەهارت هێنایەتە چۆکان و...

ترسام لەوەی کە لەم یەك دوو شەهیدە یەکیان من بم، لە دڵی خۆم گۆتم هەبێت نەبێت من و داغستانین، چوونکێ ئەو حەزناکات لە قەندیل شەهید بێت و منیش زۆر لە مردن دەترسێم، ئیزرائیلیش زۆر جار پێچەوانە ئیش دەکات، ئیدی دێت ئێمە دەبات.

حەزملێبوو، لە دڵەوەحەزم لێبوو، ناوی هێسترەبۆزیش بێتە ناو ناوانەوە، ئەو هێسترەی لە هەموو هێستران هێسترتر بوو، ئەو هێسترەی زۆر کەس دەیانگۆت بە حەفت جەنگاوەر هێندەی وی هۆشیان نیە، ئەو هێسترەی خۆشەویستی هەمووان بوو، نازانم

بۆچی ناوی هێسترەبۆزم نەخستە ناو ناوانەوە، وابزانم لە بیرم چوو، دەنا هەر ناوم دەهێنا، من دڵنیام ئەوانیش هێسترەبۆزیان لە خەیاڵ نەبووە، دەنا دەیانخستە لیستی فریادڕەسانەوە. هێسترەبۆز هەر من دەزانم چ چاوساخێ بوو، چاوساخترین چاوساخی دنیایێ بوو، هەرچی چیاو چۆلی دنیا هەیە، هەرچی ڕێگەی سەختی دنیا هەیە، هێسترەبۆز گەڕابوو، دیتبووی، یەك جار بتبردایەتە قیامەت، لەوێ بەرەلات بکردایە، بە یەك هەچە هەتا ناو دنیا گیر نەدەبوو، بە بێ ئەوەی ڕێگە هەڵە بکات، کوڕی ئاگری گۆتەنی:

مەگەر هێسترەبۆز هێندەی من دنیا گەڕابێت!

هەقی نەبوو، دنیا شەوە، ڕۆژە، بەفرە، بارانە، ڕێگە ئاوە، وشکانیە، خۆڵە، قوڕە، بەفرە، ئاگرە، شاخە... گوێی لێنەبوو، ڕێگەی خۆی دەدیتەوە و دەڕۆیشت، وەك دەڵێن ئەو هێسترە لەوەتەی هەیە بۆ یەك جاریش ڕێگەی هەڵە نەکردووە، من ئێستاش تێنەگەیشتم هێسترەبۆز لە دیتنەوەی ڕێگەی مەبەست لە ناو ئەو هەموو ڕێگایانە، دیتنی بەکار دەهێنا، یان بۆنکردن، شەوێکی درەنگانی پایزی، سێ جەنگاوەر بووین، هێسترەبۆزیشمان بە بارێکی گەورەی فیشەکەوە لەگەڵ بوو، کەوتینە کەمینی جاش و جەندرمانی تورکان، دەستمانکردەوە، شەڕێ دەستپێکرد، ئەمما شەڕ، ئیدی ئێمە لێکدی دابڕاین و پەرتەوازە بووین، کەس بە کەس نەبوو، هێسترەبۆز منی دیتەوە، دوو جەنگاوەرەکەیدی نەمزانی چیان بە سەر هات، من و هێسترەبۆز، تەواوێك لە شەڕگە دوورکەوتینەوە و خۆمان شاردەوە، تاکو شەوی داهاتوو هەر لەوێ ماینەوە و چاوەڕێی جەنگاوەرەکانمان کرد، چ سۆراخیان نەبوو، ئەو ڕێگەو بانەم

نەدیتبوو، جاری یەکەمم بوو، ڕێم بەویَ بکەوێت، نەمدەزانی کویَ کوێیە، ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواشم لێکدی نەدەکردەوە، ڕاستە ئەستێرە بە ئاسمانەوە بوون، بەس لە چاوی من ئەستێرەکان هەموویان وەکو یەك بوون، نەدەناسرانەوە، ناوی هێسترەبۆزیشم بیستبوو، بۆمیان باسکردبوو، چتۆ شارەزاو چاوساخە، بەلام چ ئەزموونێکم لەگەڵی نەبوو، لەو شتانەش هەتا بە چاوی خۆت نەبینیت، باوەڕهێنان زەحمەتە، چ بکەم خودایە، ناوی خودام لێهێنا، هەچەم لە هێستر کرد و هێستر بڕۆ، من لە دووی هێستر بڕۆ، ڕێگە زۆر سەخت و هەڵدێر بوو، پێت بڕۆیشتایە، تا دەروازەی دۆزەخ گیر نەدەبووی، زۆری نەبرد دنیا بووە تاریکەشەو، باران نم نم دایکرد، دنیا تاریك تاریك، بەر پێی خۆم نەدەدیت، بیرم بۆ ئەوە چوو کە شەوکوێر بووبم، ئیدی تەواو خۆم دەخیلی هێسترەبۆز کرد، توند دەستم بە کلکیەوە گرت، لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

بە گۆڕیی ئەو کلکە جوان و نەرمانەت بم، بە ڕێی زۆر ترسناکدا مەمبە، هەر بکەوم، لە ترِی تۆ دەچم.

بڕۆ بڕۆ، دنیای پێکردم، ترسم لێنیشت، ترسام لەوەی ئەنفال هێسترەبۆزیشی بە چەند مستە جۆیەك کڕیبێت و ڕادەستی ئەنفالم بکات، چەند جار هێسترم ڕادەگرت و دەمویست بە ڕێی هاتنیَ بگەڕێمەوە، پەژیواندەبوومەوە، من بیستبووم، لە جەنگاوەرانم بیستبوو:

مەترسن، هەرگیز لە هێسترەبۆز مەترسن، دڵنیا بن برا خیانەتتان لێبکات هێسترەبۆز خیانەت ناکات و ناکات..

بەلام دڵی من وای نەدەگۆت، دەترسام، دەمگۆت:

خۆ هێستڕەبۆزیش لەو جەنگاوەرانە زیاتر نیە کە دەبنە پیاوی ئەنفال.

دنیا ڕووناکایی تێکەوتبوو، بەر پێی خۆم بە ڕوونی دەدیت، کەپکە شاخ و بنە دارم لێکدی جیا دەکردەوە، دەستم لە کلکی هێستر بەردابوو، لە نشێوێکی گەلێك سەخت شۆڕبووینەوە، کەوتینە پێدەشتێك، تووشی چەند ڕیانێك بووین، ژماردم بە ژمار حەفت ڕێچکە بوو، ترسام، لەبەر خۆمەوە گوتم، ئەگەر هێستڕەبۆز هۆشی حەفت جەنگاوەریشی لە سەری بێت، هەر هەڵە دەکات، هێستڕەبۆز کە گەیشتە حەفت ڕیانەکە، قیچەك ڕاوەستا، دیتم تەماشای هەر حەفتیانی کرد، لموزی بە هەر حەفتیانەوە نا، لە لای چەپەوە سێیەمی گرت و خێرا ڕۆیشت، وەك ئەوەی تۆڵەی هێندە وەستانە بکاتەوە، ئیدی چارەنووسی منیش دووی کلکی هێستڕەبۆزە، کەوتمە دووی، بڕۆ بڕۆ، زۆری نەبرد بارەگایەك بە دیار کەوت، لە دوورەوە هەردوو جەنگاوەری بزربووم ناسیەوە، ئیدی لە کنە من بووە شتێکی پیرۆز، دەمویست هەزار ماچی لێبکەم، هەزار ڕەحمەتم بۆ دایك و باوکی هێستڕەبۆز نارد، من ئەگەر ئەو کەرە ببینمەوە کە دەکاتە باوکی وی، مەدالیایەکی بە ملیەوە دەکەم، من نەمدەزانی چۆن چاکەی بدەمەوە، چم لە دەست نەدەهات، بیرمکردەوە ئاوازێکی جوانی بۆ دابنێم لە ناو هەموو ئاوازان بناسرێتەوە، حەفت شەو بۆی دانیشتم تا ئاوازێکم دانا، ناوم لێنا ئاوازی هێستر، ئیدی هەر جارێك من و هێستڕەبۆز، بە دیداری یەکدی شاد باین، ئاوازەکەم بۆی دەژەند، زۆری پێخۆش بوو، کلکی

بادەدا، من دڵنیام ئەو لێرە بایە چارەیەکی لێدەکردین، ئەوەی کلکی هێسترەبۆز بگرێت و هەچەیەکی لێبکات و بڕوات، تووشی هیچ گرفتێك نابێت و دەگاتەوە جێگەیەکی ئارام، هێسترەبۆز چاوساخی هەموو دەور و زەمانێکە، لە بەفر شکاندنیش هەر شارەزایە و توانای حەفتاو حەفت جەنگاوەری هەیە، من دیتمە بە چاوی خۆم دیتمە چۆن بەفر دەشکێنێت، بە لمووز بەفر لادەدا و بە چۆك دەیپەستێتەوە، من گوێم لە ئەسحابەکوژ بووە دەیگۆت:

لە بەفر شکاندن، هێسترەبۆز لەگەڵ من دەردەچێت.

ئەگەر هێسترەبۆز لێرە بایە، دەیبردینەوە رێگەیەکی بێ گرفت و سەرئێشە، رێگەیەك دوور لە چاوی ئەنفال، دوور لە چاوی جاسووسان، ئەو لێرە بایە، بە رێگەیەکدا دەیبردینەوە دنیا، خوداوەندی قەندیلی، ئەگەر خولەش نانێری، ئەگەر ئەسحابەکوژیش نانێری، ئەگەر مەستوورەش نانێری ئەگەر ئایشەگوڵیش نانێری، ئەگەر ئەستێرەکەی پۆلای فاتیمەش نانێری، ئەگەر شمشاڵێکیش نانێری، ئەگەر بە خۆشت نایەیت، هێسترەبۆزمان بۆ بنێرە، هێندەمان بۆ بکە، بڕۆ ماڵی ئەنفال، دەڵێن لەوێ بە زنجیرێکی حەفت لۆیی بەستراوەتەوە، زنجیرەکە بپسێنە و بەس، خوداوەندی خۆم، من لە هێسترەبۆز پتر چیدیم لە تۆ ناوێت.

زریان وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بە دیوێکدا ئاودیو بوو، بەفر بە شەرمەوە، کەم کەم لێیدەکردەوە، ئەوەی پشووی نەدا و

نەدا، ئاگری ئێمە و تۆپی ئەوان بوو، تۆپ بە دوای تۆپ، بڵێسە لە بڵێسەوە، جەنگاوەر لە قەندیلی بەفردا، بە زۆر دانیشتن وێران دەبێت، وێرانیەك رەنگە هەرگیز ژیان نەکەوێتە گیانیەوە، دەبێتە کەلاوەیەك لە رابردوو، بە سەردانیش رێی بە ئاینده ناکەوێتەوە.

فاتیمە سەر چۆپی گرتبوو، شایی بە دەوری ئاگردا دەسووڕایەوە، سەردەستەی مراویان بە دەنگە گڕەکەی بەندان دەڵێ، هەموو بۆی دەسەننەوە بە فاتیمەوەش، بەڵام پۆلای فاتیمە بە بێدەنگی شایی دەکات، لە شایی چیاییەوە بۆ سەمای چیایی، ئاگر زەردەشتیانە بڵێسە دەدا، سەما لە گەڵ جوولەی ئاگر جوان دێتەوە، وەك چۆن فاتیمە لەگەڵ بەفردا جوان دێتەوە، وەك چۆن بە دیوی چۆڕاوگەدا بەفر لەگەڵ ئاگر جوان دێتەوە، وەك چۆن ژمارەی حەفت بە ئەفسانەییەوە لەگەڵ ئێمە جوان دێتەوە، ئاگر ئەوها لەگەڵ سەما جوان دێتەوە، تا رێگەت نەچێتەوە رێبەندانی قەندیلێ و باوەش بە زریاندا نەکەیت و بۆ چەند ساتێ نەچیە هەناسەی چلوورەوە، نازانیت ئاگرپەرستی چیە، نازانیت ئاگرپەرستی چ چێژێکی ئاهورامەزدایی دەڕژێنێتە ناختەوە، لە بیرمە فاتیمە جارێك بە منی گوت:

ئەگەر ئەوینی ئاگر نەبا، لەمێژ بوو لە بەسرام کردبۆوە.

من هەینێ گۆتەکی فاتیمەم بە هەند وەرنەگرت، ئێستا دەزانم ئەوینی ئاگر چ ئەوینێکە و پرچی چەندان فاتیمە و ریشی چەندان پۆلای لە دەستی خۆی ئاڵاندووە و بەری نادا، ئەو ساتانەی لەگەڵ ئاگر سەما دەکەیت، تۆپ لە بن پێشت

بکەویتەوە، دەنگی نایەت، فاتیمە بە دەم سەماوە دەیگۆت:

جەنگاوەر ئەگەر ناوە ناوە دەستی ئاگر نەگرێ و تێـر سـەما نەکـات، دەبێـتە بەرد، دەبێـتە ئاسـن، لە کەس ناگـات و کەس تێناگات.

فاتیمە وا دەڵێت و منیش بە زمانی دەروێشان و حاڵگرتووانە دەڵێم:

وایە، وایە، فـاتیمە وایە، ئەوەی تـۆ دەیڵێیـت هەر هەمـووی وایە.

ئەوانیدیش وایەکەی منیان پێخۆشـبوو، بـێ ئەوەی بـزانن چ وایە، تێکڕا وایە وایە دەگوترێتەوە، قەنـدیل لەو سـەرەوە بـۆ ئەو سەر وایە وایەی لێ بەرز دەبێتەوە، کێ ئاگای لە دەنگی تۆیە!

دوور نیشتمەوە، زۆر دوور

دوورتر لە باڵی فڕین

لێرە نیشتمەوە

دوورتر لەو نێوانەی

لە نێوان من و ماڵئاوایی هەبوو

لە نێوان تۆ و تەنیایی هەبوو

نیشتمەوە لێرە

لێرەوە نە ڕێی دەڕوا

**نە ڕێیێ دێ**

**ئەوەی هەیە لە مەرگەوەیە**

**بەرەو لای مەرگ دەچێ**

**لە خۆم شکستە باڵێ،**

**دەنگێك نیە بمبا بمبا**

**بمباتە ماڵی دنیا.**

(سترانی جەنگاوەر)

## ١٨

ئای بۆ شمشاڵێ! شمشاڵ نەبێت، ئێرە بن ئەو سێ گابەردە گەورەیە، ئێرە ئەو شوێنەی سەردەمانێ شوێنیی کۆبوونەوەی فریشتان بوو، سەردەمانێ بووە ئاودەستی شەیتان، سەردەمانێ حەفت جەنگاوەری هاتێ بە ماڵی ئایشەگوڵەوە، ئەگەر شمشاڵ نەیەت، رەنگە ئێرە ببێتە گۆڕستانی حەفت جەنگاوەری لە دنیا هەڵاتوو، حەفت جەنگاوەری لە دنیا بزربوو، حەفت جەنگاوەر رێی دیتنەوە نابیننەوە، مەگەر تەنها شمشاڵ سەرەداوێکی دیتنەوە بخاتە دیدەمانەوە.

لە ناو ئاو بزر بووم، شمشاڵ بوو دۆزیمیەوە، لە بن عەرد بزر بووم، شمشاڵ بوو دۆزیمیەوە، شمشاڵ بە سووکی دەستمی گرت و شان بە شانی مەستوورە بە ئاسماندا پیاسەی پێکردین و هەرچی جوانیی دەریا و چیا و پێدەشتان هەیە، رژاندیە چاو و دڵمانەوە و پڕاوپڕ هاتینەوە، شمشاڵ بوو... شمشاڵ بوو هێستری بەتاڵدەکردەوە لە جنە و پری دەکرد لە هێوری، لە دەستەمۆیی، لە سەمای ژنانە، شمشاڵ بوو هێسترەبۆزی دەخستە سەمای رۆژهەڵاتیانەی ژنانەوە، سەمایەك مەستوورە ئیرەیی پێدەبرد، سەمایەك کوڕی ئاگریی ئەگەر دەستیان نەگرتبا، کلکی هێستری دەگرت و دەیکردە سەمای رەشبەڵەکی، چی

هەیە بە شمشاڵ نەتوێتەوە و نەبێتە ئاو بە بەفری قەندیلیشەوە، خۆ ئەو بەفرە لە دڵی پیاو یەک پێیەکەی بن بەردەکە رەقتر نیە کردیە ئاو و ئێستاش وا لە بەری دەرِوات و نەگیراوەتەوە، شمشاڵ بوو، سەی رێوانی کردە هاورِێ، بە شمشاڵ نەبێ بە دنیا ناکەوینەوە.

ماندووم، لە خۆم ماندووتر، ئەگەر نۆبەتداری لێبگەرِێ، دەخوازم چاوێ گەرم بکەم، بە نیازی خەونێ کە یەك جار دیتم و نەمدیتەوە، ئارەزوومە بچمە ئامێزی خەوتنەوە، خەونێك خەریکی چنینەوەی ماچ بم و خولە بەئاگامبێنێ، بە ئاگاهاتنەوەم لە لایەن خولەوە، پێکەوتنەوەیە بە رێگەی دەرچوون، دەرچوون لەو مەرگەی وا لە قەندیلەوە سەرەدیقانێ لەگەڵ حەفت جەنگاوەری بێ چاوساخ دەکات،گەیشتنە بەو پنتەی کە جەنگاوەر بۆ ماوەیەکیدی گرێبەست لەگەڵ ژیان نوێدەکاتەوە.

تۆزێ چاوم گەرمکرد، نە خەونم دیت نە خولەش بە ئاگایهێنامەوە، ئەوە ئیمامەی پساوەیە لەسەر سەرمە، نهێنیی شەویش(ئاگر)ە، لە ساتەکانی ئێشکگری ئەگەر بە پێی خۆیشی نەهات دەبێت تۆ بە دوایدا بچیت و دەست بە خەیاڵێکەوە بگریت و بۆ کوێی بردیت پرسیار نەکەیت، ئێرە کوێیە؟ بۆ کوێم دەبەیت؟ ئەگەر وا نەکەیت، ئێشکگریی کۆتایی نایەت و دەتکوژێت، من چەندی بەو لاو بەم لادا هەڵمدەدا، خەیاڵێك نەیدەگرتمەوە و نەیدەبردم، نازانم لە سەرما بوو یان لە ترسان تۆ بڵێ لە ترسان بوو، چوونکە گرِ گرِ هاتمەوە سەر راسپاردەی گۆرینێ، راسپاردە لە کەللەی دام، دەمەوێ بزانم ئەوجەنگاوەرانە لە وەسیەتەکەیان چیان نووسیوە، دەمویست بچم کۆڵەپشتەکەم بێنم و وەسیەتەکانیان بخوێنمەوە، بەڵام ئەوە

ناپاکیە، شکاندنی پەیمانە، لە بنپێنانی سوێندێکە گەلێك گەورەیە، گــۆڕی شــەهید پیرۆزتــرین پیــرۆزیە لای جەنگــاوەر، لای جەنگاوەر یەكێ پیرۆزیی گەورە هەیە ئەویش گۆڕی شەهیدە، نـا ئەو سوێندە هـی گـاڵتە نـیە، ئەدی چ بـکەم بە چ ڕێـگەیەك ئەو وەسیەتانە ببینم و بیانخوێنمەوە و سـوێندیش نەشـکێنم، پیرۆزیـی نەخەمە بـن پـێمەوە، تـا دێـت تـامەزرۆییم بـۆ بینینـی ئەو شـەش پارچە کاغەزەی ناو کۆڵەپشتەکەم زیاد دەکات، چیم لە دەسـت نایەت، لەو بارەیەوە بێ دەسەڵاترین جەنگـاوەرم، ئـای لە خـۆم بێ دەسـەڵاتێ! ڕەنـگە هەرگیـز ئەو وەسـیەتانە نەبیـنم، دەمـرم و وەسیەتەکەی فاتیمە نابینم، هی کەسیان نابینم، تۆ بڵێـی ئەوانـیش وەك من تامەزرۆی بینینیان نەبێت! ڕەنگبێ بیریشی لێنەکەنەوە، نا وێناچێ وا بێ، خودایە، زوو یەکلایکەوە، یـان مـن بکـوژە یـان ئەوان، ئەوها بڕوا دەبێت گەورەترین سوێند بشکێنم، وەك چـۆن ئەو کۆلکەدارانە بەو بیورە دەشکێنم ئاواش سوێندەکە دەشکێنم، نا کاری وا ناکەم، یان من بکوژە یان ئەوان.

ئـاگرەکە لە کـزی دابـوو، کـۆلکەدارێکی گەورەم ڕاکێشـا، سووك بوو، تومەز ناوی کلۆڵ بوو، بیـورێکم لێیـدا لەو سـەر بـۆ ئەو سەر درزیبوو، دیتم شووشەیەکی گەورە لە ناو دارەکە هـاتە دەرێ، ئەوە چـیە! هەوە، بـادە و سـەر مـۆر، هەر خەنـی بـووم خەنــی، غارمــدایە کۆلکەدارەکانیــدی، هەڵگێــڕ و وەرگێــڕم دەکردن، بزانم چ شووشەیدی خۆی حەشار نەداوە، خوداوەندی بادەیی، لە تۆ بە زیاد بێت، خوداوەندی مەستی، زۆر سوپاس بـۆ ئەو دیـاریە کە بەو نـاوەختە بـۆت نـاردم، سـەریم کـردەوە و کەمێکم هەڵقوڕاند، پەشـیمانبوومەوە لەو نزایـانەی پـێش کەمێـك دەمخوێندن، هەستمکرد کاتی ئێشکگریەکەم تەواوبـووە، کـێ لە

دووی منه، فاتیمه، کاتێ چوومه سەری دەتگوت فریشتەیە خەوتووە، دڵم نەهات وەئاگایبهێنمەوە، گەڕامەوە، خۆی بەئاگاهات:

- نۆرەی منە؟

+ ئا، بەڵام ئەگەر خەوت دێت، بخەوە، لە جیاتی تۆیش دەیگرم.

-نا، واهاتم.

ڕۆیشتم و هات، پێمگوت کە شووشەیێ بادەم لە ناو کۆلکەدار دیتەوە، بە باوێشکێکی ناسکەوە گوتی:

جوانە، داربەڕوو بە سەوزی و بە پێوە بەڕوو دەگرێت، لە ساتەکانی پاڵکەوتنیش بادە!

دیاربوو حەزی لێوو چۆڕێ بخواتەوە، لەهۆدەکەیدی دانیشتین، خواردمانەوە، ئەو زۆر کەمی خواردەوە، من چارەگێك پتر، فاتیمە چوو پۆلا گازبکات، پۆلای فاتیمە بادەخۆرێکی بێرەزا بوو، فیرعەونانە هەڵیدەدا، دەتگوت سەپانی ماندووە، دۆ دەخواتەوە، من ئەوانم لە بیرنەکرد، سەردەستەی مراویان تەنها لەبادە لە مراوی نەدەچوو، کەمی دەخواردەوە، دەنا هەر شلەمەنیەکی لە پێش بایە وەك مراوی زاری لە سەر هەڵنەدەگرت هتا قوڕاوی بنی دەردەهێنا، هاوڕێی گیڤاراش کەمی دەخواردەوە، دووەکەیدیش لەمێژ بوو وازیان لێهێنابوو، هەبوو نەبوو پۆلای فاتیمە و من، ئەو شێتانە بینی پێوەنا، من و فاتیمە بە جێمانهێشت، بە نیازی خەوتن چووینەوە ژووری نووستن، گوێم لە دەنگی دار شکاندن بوو، تێگەیشتم ئەوە

پۆلای فاتیمەیە بە دووی شووشەی بادەدا دەگەڕێ.

راکشانێك راکشام، لە ماڵی بابیشم وا رانەکشاوم، نووستنێك نووستم، مەگەر لە سەر کۆشی دایکم خەوی وام کردبێت، خەونێکم دیت، هیچ بنیادەمێك خەونی وای نەبینیوە، خەونێك بوو لە ناو خەونان جێگەی نەدەبۆوە، خەونێك بوو کە دەمەوێت بیگێڕمەوە، رستەیەکم بۆ نایەت بۆ بە دیار خستنی دیمەنێکی، نا ناتوانم بیگێڕمەوە، هەرچی بیڵێم ئەو خەونە نیە کە من دیتم، دەبێت خۆم جوان کۆبکەمەوە بۆ گێڕانەوەی خەونەکە، دەبێت پێنووس و کاغەز بێنم و ورد ورد بینووسمەوە، نا ئەو خەونە بە من نانووسرێتەوە، من دیتم بە چاوی خۆم دیتم، خۆم لە ناوی بووم، بەڵام من ناتوانم وێنەکانی بە لێلیش پیشانبدەمەوە، ناتوانم قسەکانی بە نیوەچڵیش بڵێمەوە، لە بیرمە ئایشەگوڵی تێدا بوو، گوێم لە دەنگی بوو، برادەران هەموو هەستابوون، خەریکی خواردنی پەتاتە و چایە بوون، من دەمەوێت بە دەم چایە خواردنەوە هەندێك لە خەونەکەم ئەگەر بە پچڕپچڕ و شێواویش بێت بگێڕمەوە، رستەیەکم بۆ نایەت لێیەوە بچمە گێڕانەوەی خەونەکە.

+ دەزانن من خەونێکی گەلێك سەیرم دیت لەو خەونە، نازانم.

- کا، وس بن دەڵێی دەنگێك دێت!

- قسەیەتی، منیش گوێم لێیە.

هەموو یەکپێ بۆ دەرەوە، دەنگ دەهات و پێ بە پێ نزیك دەبۆوە، من بە دەنگی ئایشەگوڵی تێگەیشتم، گوتم نەبادا هەو نەبێت، با وا نەڵێم.

+ مـن سەردەسـتەی مراویـان نـیم، ئەگەر ئەوە دەنگـی ئایشەگوڵ نەبێ.

- دوور نیە هەو بێت.

تا ئێستا بە تەواوی روون نیە، دەنگەکە لە کام لاوەیە، دەنگ تەواو نزیکبۆوە، هەر دەنگە و بێ وشە، یان هێشتا مەودا مەودای وشـە چنیـنەوە نـیە، منـیش گومـانم نەمـا لەوەی کە ئەو دەنـگە دەنگی ئایشەگوڵی گوڵی هەموو گوڵانە:

کوڕەکانمممممممممممممم...

+ کوڕە خۆیەتی، ئەوەتا لەو لایەوە دێت .

راکە بە ناو بەفرێ راکە، دەنگ چـووە لایەکیـدی، لەو لاوە بە روونی و بێ قرتانی دەنگ:

کوڕەکـانم، تـۆش کـچە تاقـانەکەم، ئەو جـارە لێتـان نزیـك نابمەوە، جارێدی زۆر ئازارتان دام.

بە هەمـوو لایەکـدا چـاو دەگێـڕین، دیـار نـیە، دەڵێـی لە بـن بەفرەوە دەئاخفێ، گوتی:

*ئەهـا شـتێکی رەش دیـارە، رێـك بەرانـبەری کـچە چـاو رەشەکەم، برۆن بیهێنن، جلوبەرگ و خواردنی تێدایە، دەی زوو بن، دوایی هەندێك قسە هەیە دەیکەم.*

- کوا لە کوێیە؟

- گۆتم ئەو جارەش دێتەوە...

- دە دایکـی دایکـان خۆتمـان پیشـانبدە و بـا چـاکوچۆنی بکەین، بزانین چ بووە چ نەبووە!

به دەنگێک دەتگوت لە رووبارەوە دێ:

*خۆتان ماندوو مەکەن، چ دەڵێم ئەوە بکەن، دەنا گوێتان لە دەنگی من نابێتەوە.*

ئیمامەی پساوە بە پاڕانەوەوە:

باشە باش، بە قسەت دەکەین.

وابوو، لەو شوێنەی ئەو دیاریکرد، بەرانپیلێکی گەلێك گەورە لە ناو بەفر داندرابوو، بەرانپیلی ئەوها گەورەم نەدیتووە، بە چوار کەسان هەڵمانگرت و هێنامانەوە، کردمانەوە، حەفت دەستە جلکی تێدا بوو بە پشتێنیشەوە، حەفت جووت پێڵاو بە گۆریەی ئەستوورەوە، حەفت ساقۆ بە سەرکلاویشەوە، نازانم چەند نووردی نان، گۆشتی نەرمك، ئامادە بۆ لە شیشدان، سماق و خوێش کرابوو، جا چی تێدا نەبوو، شمشاڵێکی بەژن باریك، دەتگوت بە ژنی مەستوورەیە.

من کە شمشاڵم دیت، هیچ شتەکم نەهاتە بەر چاو، دەروازەی بە دنیاکەوتنەوەم دیتەوە، ترسی مەرگ رەویەوە، فاتیمە چاوی لە شمشاڵ بڕیبوو، لە چاویەوە دیارە، تامەزرۆی شمشاڵە، فاتیمە لە چیاییەك پتر حەزی لە شمشاڵی چیاییە، پێمگوت بە چاو بە فاتیمەم گوت:

ئارامت بێت دەمێکیدی ئاوازێکت بۆ دەژەنم، چ ئاوازا! بۆ مەستوورەشم نەژەندبێت، ئاوازێك بتبا بتبا بتخاتە دیجلەوە و لەوێوە بەرەو ماڵە بابان.

بە دەنگێکی ناسک:

*دەی کوڕەکانم، کچەکەم جلکەکانتان بگۆڕن، پێڵاوە*

*نوێیەکانتان لە پێ بکەن، بزانن کووە لۆتان؟ دەی نـانیش بخـۆن، زوو بـن، تـکەی لێـدەن، خەمـی منتـان نەبێـت، مـن برسـیم نـیە، خێرابن، هەندێك قسە هەیە دەبێت بیکەم، دەی، زوو، زوو.*

خۆمـان گـۆڕی، هەمـووی بە پێـوان هێنـابوو، نـازانم کـوو ژمارەی پێی ئێمەی زانیبوو، دەتگوت ئێمەی هەڵگرتووە، ئێمەی بـردۆتە لای بەرگـدروو، لای دووکـانی پـێڵاوان! ئێسـتا نـوێ بووینەوە، خـاوێن خـاوێن تـازە لە نـاو پـاکەت دەرهـاتووین، چ بایەك نەیگەچڵاندووین، شەش پیاوی قۆز و کچێکـی شـۆخ کە جلکـی پیـاوانەی لەبەرە، چەنـد جـوانین بە جلکـی خـاکیەوە، بە جلکـی تـازەوە، بە پـێڵاوی تـازەوە، مـن تـا بڵێـی کەیفـم بە پێڵاوەکەم هات، هەستمکرد بسـت بسـت بـاڵا دەکەم، مەگەر بە منداڵی هێندە بە پێڵاوی نوێ بـاڵام کردبێـت، نەمدەهێشـت بەفـر داپۆشێت، دەمویسـت هەر لە بەر چـاوم بێـت، لە تەماشـاکردنی تێر نەدەبووم، پێڵاوەکەم ئەوەی دایـکە ئایشـەگوڵ بـۆی هێنـاوم، جوانە، پڕ بە پێمە، پێڵاوێکی لاستیکە و لێـواری هەنـدێك بڵنـدە، وەك بڵێی نیوە پۆتینە، ناوی تووکنە، ڕەنگی پێڵاوەکەم ڕەشـێکی گەلێك جوانە ڕێك لە ڕەنگی قژی خۆم دەکـات، ڕەنگـی قـژی مـن قسـەی خـۆم نـیە، زۆر جـوانە، لە بیـرمە بە منـداڵی کـچە جحێلەکانی دەرو دراوسێ دەیانگوت:

جوانترین ڕەنگ بۆ پـرچ ڕەنگـی ڕەشـە، جـوانترین ڕەنگـی ڕەشیش ڕەشیی پرچی ئەو کوڕەیە.

شیشکەی تفەنگمان هێنا گۆشتی پێوەکە و لە سـەر پشـکۆی دار بەڕووی دانێ، بەفر بە نەرمی دەباری، تـۆپ لە بەفـر خێراتـر دەبارێت، بە دزیەوە چاو بە هەموو لایەکدا دەگێڕین، ئایشەگوڵ

دیار نیه، له بەینی خۆمان چرپەچرپ دەکەین، سەرمان تێدا مایه، هەیه دەڵێ:

ئەوه ئایشەگوڵ نیه، بیستوومانه جندۆکەیەکی تایبەتی هەیه له قەندیلێ رەنگه ئەوه هەو بێت.

هەیه دەڵێ:

نه بابه، ئایشەگوڵه و ئایشەگوڵ.

من لەو بەینه تێدامابووم نەمدەزانی کیهانیانه، حەزمدەکرد دەست به شمشاڵ لێدان بکەم، وەکات پەشیماندەبوومەوه، خۆشم نازانم بۆ! له ترسانه یان له خۆشیان! رەنگه بمەوێت سەربەند بگۆڕم، له مەستوورەی مەستانەوه بۆ فاتمۆکێی کێڵگەردن، شمشاڵەکەم له ئامێزم گرتووه، له ئامێزگرتنێ، مەگەر له ژووره خەونیەکەی ئەوێ مەستوورەم وا له ئامێز گرتبێت، وێناچێ مەهنازیشم بەو شێوەیه له ئامێز گرتبێت، له هیچ له خەیاڵەکانیشم، فاتیمەم وەك شمشاڵ به سینگمەوه نەناوه.

- ئەها ئەوەتێهێ، لێرێهێ راوەستایه!

- هەوه، سەراپا رەشپۆشه!

- باشتره قسه له قسەی نەکەین، با بزانین چ قسەیەکی پێیه.

- دایکی هەمووومان، ئەوه ئێمه له نان بووینەوه، فەرموو وەره لامان و قسان بکه.

لەو دوورەوه:

*نا کاتتان ناگرم، نزیکنابمەوه، منیش وەکوو ئێوه کارم هەیه، درەنگمه، زۆر درەنگمه، کورەکانم، کچه چاو رەشه تاقانەکەم،*

لەو مـاوەیە زۆر شـت روویـداوە، زۆر شـت گـۆڕاوە، یـان دەگۆڕێن نـازانم، بە خۆتـان دەزانـن، لە مـن باشتریش دەزانـن، جـاش و جێـژی چـوار دەوڵەتـێ، هـی دنیـایێ، وا وەك كلـۆ و مێرووسـتانێ بەرەو قەنـدیل دێـن، دەڵـێن پادشـای بـێ دادێ، پادشـای جێیەكانیـدیش سـووندیان خـواردووە، بە بەردە رەشەكەی كابە سـووندیان خـواردووە، كە قەنـدیل بتـاوێننەوە و بـیكەنە تاریكستـانێك روونـاكی رووی تێنەكـات، وای لێـبكەن ئیدی گۆلمە بەفرێكی لێ هەڵنەگیرێتەوە، سـووندیان خـواردووە، پێشـمەرگە بـكەنە دڕكـی نـاو ئـارد و كەس كەس نەیـانبینێتەوە، بەڵام گوویـان خـواردووە، هەمـوو پاشـاكان بە بـاب و بـاپیرەوە گوویان خواردووە، قەندیل خواردنی ئەوان نیە، هەتا دنیـا دنیـایە قەنـدیل بەفـری لێنـاچێتەوە، هەتـا دنیـا دنیـایە، قەنـدیل ئـاگری لێنـاكوژێتەوە، هەتـا دنیـا دنیـایە، پێشـمەرگە لە قەنـدیل نـابێتەوە، ئەوانە با لۆ خۆیان هەر وا بڵێن، بیستووشمە لە خەڵكـم بیستووە، قسەی من نیە، گوایە، لە بەینی قەندیل و بـێ داد رازێـك هەیە، بەڵام نازانم وایە یان نا، ئەنگۆ باشتر دەزانن.

- نەمگۆت! ئەمن دەڵێم وایە و زیاتریش.

- وسبە، با گوێی لێنەبێت، دەنا قسان ناكات.

لە نادیارەوە:

ئەوە چیە! ئەو فسكە فسكە لە بەینی خۆتـان، لەگێـنە مـن بە شێت تێبگەن؟ نا كوڕەكانم مـن شـێت نـیم، منـی جەرگسـووتاو هەرگیز شێت نابم، من دەبێت بە سەلامەتی بمێنمەوە، دەبێت بـۆ ئەو ئەنفالە گوێ رەشە هەر بمێنمەوە، دەبێت بە دەردێكـی بـبەم، عـارەب بە حوشـتری نەكردبێـت، ئەنگـۆ بە هێسـترە جوانەكـانی

*خۆتان نەکردبێت، من شێت نابم و ناشمرم تاکوو ئەو حەفتاو حەفت منداڵە گەورە نەکەم، پاش کەمێ دەڕۆم، دەچمە لای کوڕ و کچەکانیدی ئەوانەی وەك ئێوە وا بە قەندیلەوەن، پێیاندەڵێم با وەك ئێوە کوڕ و کچی تەنگانە بن و نەکەن خۆ بەدەستەوە بدەن، پێیاندەڵێم ئەنگۆ بە قەندیلەوە جەنگاوەرن، ئەگەر لە قەندیل بینەوە دەبنە پێڵاوی دڕاو، فڕێدەدرێن و جاشی خوێڕیش لە پێتان ناکەن، دەیانڵێمێ خەمی نانتان نەبێت، لە بنی دنیایێش بێت بۆتان پەیدا دەکەم، بە ناو کەڵبەی ئەنفالیشدا بێت دەتانگەیەنمێ، خەمتان نەبێت، ئەوجارە زۆرم پێچوو، درەنگ هاتمەوە، لە دەست خۆم نەبوو، چوون لە دەست خۆتە، هاتنەوە لە دەست خۆت نیە، من چوون و هاتنم لە دەست خۆم نیە، لە دەست خۆم نەبوو لە گۆڕستان زۆر مامەوە، نووستم، زۆر درەنگ بە ئاگاهاتمەوە، خەوێکی گەلێك درێژ بوو، لەو خەوتنە هەزار خەونم پتر دیت، دەبێت زوو بە زوویش بچمەوە، ئەنگۆ نازانن حەفتاوحەفت شیرەخۆرەم بە ملیدا کەوتووە، دەبێت شیر بۆ هەموویان بگرمەوە.*

- تۆ شتێکی وات بە ئێمە نەگوت.

لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو وەك ئەوەی گوێی لێنەبووبێت.

- دایکی دایکان، پێویستمان بە تۆیە، وەرە لامان با پێکەوە قسە بکەین.

دوورتر کەوتەوە، هەر ئەوەتە دەنگی دەهات.

- قسە مەکەن، با قسە بکات، شتی گرنگی پێیە با لە دەستمان نەچێت

قڕو قەپیمان لێیکرد.

*کچە چاو ڕەشە تاقانەکەم، دەمویست بچمە لای دایکت و هەولی تۆی پێبگەیەنم، بەڵام مەستوورە هەمووی لە بیربردمەوە، کوڕەکانم ئەنگۆ غەدرتان لە مەستوورە کرد، قسەی منتان بە هەند وەرنەگرت، مەستوورەتان بە ئاوێ دادا، ئەوەی بێباکانە ئاقاری قەندیل جێبهێڵێت ئەوهای بە سەر دێت.*

یەك بە دەنگی خۆم هاوارمکرد، ئەوانیدیش بە هاوارەوە ئەو پرسیارەیان لە ئایشەگوڵ کرد:

مەستوورە چی بەسەرهاتووە؟

بە دەنگێکی حێل:

*هاوارمەکەن، لە قەندیلێ هیچ شتێك بە هاوارکردن نە چاك دەبێت نە خراپ، قسان مەکەن دەنا قسە ناکەم، دەنا باسی ئەسحابەکوژ و خولە ناکەم.*

- وس بن کاکە وس بن، قسەی گرنگی پێیە.

هەموومان دەلەرزین، لە سەر ئاو و ئاگر بووین، متەقمان لە خۆمان بڕی، من خەوم دەهات لە ترسان.

*دەڕۆم، سەرێك لە کوڕ و کچەکانیدیشم دەدەم دوور نین لە پشت ئەو بەرزاییەن، دەبێت زووش بگەمەوە ماڵ و حەفتاوحەفت شیر بگرمەوە، حەفتاوحەفت ساوای دایك و باوك ئەنفالکراوم بە دزیی چاوی ئەنفالەوە لە تۆبزاوە هەڵگرتۆتەوە، نزابکەن کەس ڕێی بەوێ نەکەوێ، ئەوێ دەروازەیەکە بە سەر دۆزەخەوە، لەوێوە گەشتی ڕاستەقینەی ئەنفال دەستپێدەکات، ئەوەی من دیتم لەوێ کەس نەیبینێت، ئۆی خودایە! ئەو ئەنفالە*

ببینم ئەنفال بکرێت، من ئەو ساوایانەم لەوێ هەڵگرتۆتەوە، دەبێت جوان بەخێویان بکەم، ئازایانە گەورەیان بکەم، بۆ ئەوەی وەك ئێوە بێنە قەندیل و بەرگی پیرۆزیی لەبەربکەن و تۆڵە لە ئەنفالی قوون رەش بکەنەوە، بە قسەی دایکی خۆتان دەکەن لێرە بن و قەندیل چۆلمەکەن، هەتا ئەو حەفتاوحەفت قارەمانە گچکلەیە پێدەگەیەنم، قەندیل چۆلمەکەن، حەفتاوحەفت قارەمان لە کچ و کوڕ، کە ئەوان هاتنە ئێرە ئەوجا ئەنگۆ کەیفی خۆتانە دەچنە کێندەرێ، بەڵام بزانن ئەنگۆ لە هیچ جێگەیەك عانەیەکی ناکەن، ئێ دێنەوە چ دەکەن، دەبنە مجێوری چ ئەسحابەیەك، ئەوە ئەسحابەکوژ لۆ خۆی لە سەر ئەو بەردەی کە پەڕۆکێکی کەسکی پێوە بوو، دەیانگۆت وەختی خۆی بە دەستی خۆیشی ئەو ئەسحابەی لە بن ئەو بەردە نایە، ئێستا وا بۆ خۆی بۆتە مجێور، خزمەتی مەزاری ئەسحابە دەکات، باشە ئەنگۆ دەبنە مجێوری چ ئەسحابەیەك؟

ئێ کچە تاقانەکەی دایکی، دەتەوێت تۆش وەك مەستوورە لێیکەن، بە شەش ژن بتگۆڕنەوە، بتدەنە مەلایەکی ئەو سەری دنیایێ. کا تۆ حەفت برات هەیە ژن لۆ شەشیان بکەیت؟ مەستوورە گوناحە کچەکەم، مەستوورە گوناحە، لە رێگەی نازانم کێندەرێ، کەوتە داوی براکانیەوە، گرتیان و بە زۆر دایانە مەلایەك کە حەفت کچی عازەبی هەبوو، مەلا، مەستوورەی لە ژووری بەند کردووە، دەنا هەتا ئێستا دەگەیشتەوە ئێرە، دەڵێن بابە تایەری برای بە دزیەوە ئیشی لۆ دەکات رزگاری بکات، نازانم دەگاتە کوێ!

دە باشە کوڕەکانم من دەبێت بگەمەوە حەفتاوحەفت قارەمان و شیریان بۆ بگرمەوە.

- ئەدی هەواڵی خوله نازانی؟

*نازانم، چی له بارەیەوه نازانم، من ڕۆیشتم، دێمەوه، ئاگاتان له خۆتان بێت، نەکەن خۆ به دەستەوه بدەن، نا، من چ هەواڵی تەواوی وی نازانم، قسه زۆره هەر کەسێك قسەیەك دەکات، نا، من چ هەواڵی ئەو نازانم، ئا دەڵێن پیاوێك له کونەگورگ له تەنیشت ماڵی خۆیان لاته عەردێکی دابڕیوه، توور و پیازی لێی چاندووه، له سبەینێ هەتا ئێوارێ خەریکی ئاودان و بژارکردنی توور و پیازه، ئەگەر ئەنگۆش حەز دەکەن تور و پیاز بچێنن، وەرنەوه، وەکوو ئەو پیاوه بکەن، له قسان، قسەی من نەبێت به چاوی خۆم نەمدیتووه، بەڵام خەڵك دەڵێن، ئەوجاره بچمەوه به تەواوی پێدەکەوم بزانم وایه ئەو پیاوەی خەریکی توور و پیاز چاندنه، خولەیه!*

ئایشەگوڵی بێ ڕەنگ دەنگیشی نەما، ڕۆیشت، ئاودیو بوو، له ئاودیوبووندا، تۆپێکی له گۆتەچنراوی هاوێشته قەندیلێ زرم به ناوەندی ئێمه کەوتەوه، به چاوی خۆم دیتم بووه حەفت پارچەی تیژ، تیژتر له شمشێری ئەنفال، هەریەکەی پارچەیەکمان گرتەوه، لەبەر چاوم نیه ئەوان چۆن چۆنیان گرتەوه، بەڵام ئەگەر گرتنەوەکەیان به وێنەی گرتنەوەکەی من بێت، دڵنیام مێژووی جەنگاوەر لێرەوه کۆتایی دێت، ئا جەنگاوەر لەوانەوه له منەوه کۆتایی دێت، نا نابێت گرتنەوەی من ڕێك گرتنەوەی ئەوان بێت، من به ئاستەم گوێم له هاوڕێی گیڤارا بوو، دەیگوت:

نا، وا نیه، باوەڕناکەم، ئەگەر واش بێت، من قەندیل چۆڵناکەم، نا چۆلی ناکەم.

نازانم قسەی ئەوانیدی چی بوو، من گوێم، لێیان نەبوو، ئایشەگوڵ تۆپی خۆی هاویشت و ڕۆیشت، هەموو ئەو تۆپانەی لە چوار ئالی دنیاوە هاتن و بە قەندیل کەوتن، هەموو ئەو تۆپانەی یەك یەك پێش کەوتن و دوای کەوتن دەنگیان دەهاتە گوێی من، هەموو ئەو تۆپانەی کەوتنەوەیان وا لە چاوی منە، بە قەد تۆپەکەی ئایشەگوڵ لە مندا دەنگیان نەدایەوە، نازانم ئەوان، من ئەوەم لەبیرە، لۆژە لۆژ چووینەوە ژوورەکەی ئایشەگوڵ.

دەبینم زریان لە ناو زریاندا هەڵدەکات و زریان و زریان تێکهەڵدەقژێن، من شەڕی زریان و زریانم دیت، دەبیستم لە ئاسمانێ شت بە شت دەکەوێت، بەوە دەچێت لە ئاسمان، لە سەر سەری ئێمە کەپکە شاخ کەرتبن و بە یەکتر بکەونەوە، شەڕ کەوتۆتە ئاسمانێ، شەڕ گەرمە لە ئاسمانێ، نازانم لەو ئاسمانی قەندیلە چ بە چ دەکەوێت! نازانم شەڕ لە نێوانی کێ و کێیە! کاتی پرسیارکردنیش بەسەرچوو، نازانم نە چاوم ڕەنگ تێکەڵ و پێکەڵ دەکات، نە ڕەنگێکی تازە هاتۆتە قەندیلێ، هاتۆتە دنیایێ، ڕەنگێك قەندیل هەرگیزاوهەرگیز ڕەنگی ئەوهای بە خۆیەوە نەدیتووە، منیش یەکەم جارمە ئەو ڕەنگە ببینم، ڕەنگێکە جیا لە هەموو ڕەنگەکانیدی، ڕەنگێکە لە هیچ ڕەنگێکەوە نەهاتووە، هەرچی ڕەنگێك تێکەڵی ئێکدی بکەیت، ئەو ڕەنگەی من دیتم، دەرناچێت، گۆتم هەبێت و نەبێت ئەو ڕەنگە ڕەنگی مردنە، نا نابێت هەو بێت، من لە نزیکەوە و زۆر بە ڕوونی ڕەنگی مردنم دیتووە، چ ئەوها نەبووە، نا ئەو ڕەنگە ڕەنگی مردن نیە.

بە وێنەی زریان بە ناو یەکدیدا دێین و دەچین، هەموو سەراسیمە، هەموو شلەژاو، هەموو هەڵلەرزیو، ئیمامەی پساوە لە

هەمووان پتر شلەژاوی پێوە دیار بوو، تا ڕەنگە من لەویش شلەژاوتر بووبم، بەڵام ئەوم دەدیت خۆم لێ دیار نەبوو، گوێم لێبوو، داغستانی بە لەرزینەوە کە دەتگوت درەختی ناو زریانە دەلەرزێت لە ئاسمانی خوری:

بەسە خودایە، بەسە، وا نابێت، دوو غەزەب نابێت، یان غەزەبی خۆت، یان غەزەبی بەشەر، یەکیان بە لایەکیدی ببە، بۆ وا دەکەیت خودایە، کێت کەوتۆتە بەردەست!

خودا ئەو جارەش گوێی نەدایە داغستانی، چاوم چووە سەر ئاگرەکە، دیتم بەرەو کزی دەچوو، ویستم بە کۆلکەدارێک گەشی بکەمەوە، نەمکرد، دەستم هیچی نەدەگرت، گوێم لە پۆلای فاتیمە بوو:

بەس ئاگرەکە نەکوژێتەوە، چ دەبێت با ببێت.

هەندێ وێنەی ژوورەکەم، وێنەی ساتەکانی دوایی، تا ئێستاش جاروبار خۆ نیشانی چاوم دەدەن، ئەوەتا فاتیمە دوو کۆڵەپشتی هەڵگرتووە، ئەوەی لە ماڵی ئایشەگوڵی دیتەوە، بە سینگی خۆیەوە ناوە، هاوڕێی گیڤارا تفەنگەکەی خاوێن دەکاتەوە، من شمشاڵەکەم توند بە دەستمەوە گرتووە، ئێستا نۆرەی شمشاڵە، دەبێت فووی پێدا بکەم، فوویێ بگاتە ئەوسەری دنیا، فوویێ بگاتە گوێی خولە و بمانگاتێ، دەبێت شمشاڵ بژەنم.

چەندی بیردەکەمەوە، بە بیرمنایەتەوە بۆ شمشاڵم نەژەند، دەبووایە بمژەندایە، بۆ نەمژەند! ژەندبام دنیا وا نەدەکەوتەوە، دێتەوەبیرم وا بە خێرایی خۆمان خڕدەکەینەوە، ئیمامەی پساوە دەدوێ من تێیناگەم، داغستانی لە بەر خۆوە:

چەندی گۆتم کورە با زوو لێرە بڕۆین.

پۆلای فاتیمە چاو بە ئاسماندا دەگێڕێ، وا دیارە بە دوای ئەستێرەدا دەگەڕێ، دەڵێ:

باشترە بەو لایەدا بڕۆین.

سەردەستەی مراویان شیعرە پەرتبووەکانی خڕدەکاتەوە، تۆپەکان سات دوای سات زۆرتر و نزیکتر دەکەونەوە، وەك خەون دێتەبیرم، هاوڕێی گیڤارا بە پۆلای فاتیمەی گۆت:

نا ئەو لا باش نیە، با بەو لایەدا بڕۆین.

پۆلای فاتیمە ملی نەدا، سوور بوو لە سەر ئەوەی کە ئەو لا باشترە، هاوڕێی گیڤاراش لە قسەی خۆی نەدەهاتە خوارێ.

بە لایەکدا رۆیشتین، نایەتەوەبیرم لای کامیان بوو، نازانم قسەی کامیان بە سەرکەوت، تا ئێستاش ئەو ئاوڕدانەوەی خۆمم لە چاوم پاراستووە، ئاوڕدانەوەیەك کە دایکیشم بەجێهێشت ئەوها ئاوڕم لێی نەدایەوە، زەردەشتیانە ئاوڕم لە ماڵی شەیتان و ماڵی ئایشەگوڵ دایەوە، پێش دوا پسانەوە چی وام لە بیرنیە، کاتێ نیوەی دوا زرمەم بیست، تەنها یەك وێنەم لە چاو ماوە، پۆلای فاتیمە و فاتیمە توند یەکتریان لە باوەش گرتبوو، نەمزانی بە کام لادا غلۆر بوونەوە، چیدیم نەدی.

بیستنیش، هەر هێندەم بیست و دەنگم ناسینەوە، لە هاوڕێی گیڤاراوە:

نامرێ ناو و نیشانتان...

لە داغستانیەوە:

وا هاتن پێشمەرگێت مە...

دەنگێکی نووساویش نەمناسیەوە کێیە:

رادیۆ بە قسە هات.

فریـای بیسـتنی رادیـۆ نەکەوتـم، نهێنـی شەویشـم لەبیـرە، ئایشەگوڵ بوو.

*******

ئەوەتا پیاوێ شمشاڵ دەژەنێ، پیاوێ جگە لە سەر و ریش، سەراپا رەش، شمشاڵ دەژەنێ، کێ دەبینێ، کێ دەبیستێ! پیاوێ بەو جێگەیەوە نووساوە و شمشاڵ دەژەنێ، پیاوێ لە تووڕەبووندا لە پەنجەکانیەوە زریان هەڵدەکات، لە هێوربوونەوەدا، لە هەناسەیەوە بارینێ نەرم نەرم دەبارێ، پیاوێ بە سیمایەوە نە گریان دەڕژێ نە پێکەنین، بێ پسانەوە شمشاڵ دەژەنێ، پیاوێ هەموو ساتەکانی بێ شمشاڵی لە ژەنینێکدا بە شمشاڵ دەکاتەوە، شمشاڵ سەرهاتی پیاوێ دەگێڕێتەوە، پیاوێ خۆی نازانێ لە کوێ کەوتۆتەوە، لە ناو ئاودا ملەقوتێ دەکات یان لە وشکانی هەڵتووتکاوە، پیاوێ نازانێ لە کوێ کەوتۆتەوە، لە بن عەرد داکوتراوە، یان بە ئاسمانەوە هەڵواسراوە.

ئەو جەنگاوەرانە چیان بە سەرهات؟ بۆ کوێ هەڵدران؟ کەسێ هەیە وەڵامبداتەوە! من چ لە بارەیانەوە نازانم، نێوان ئێرە و ئەوێ، چ رێگەی نیە، پێیناکەومەوە، لەو رێگەیە نە وێنەیەکی دیتنم بەجێهێشتووە، نە دەنگێکیش لە بیستنم، من بە دنیایەك

پرسیاریش بەو قەندیلە نەکەوتمەوە، ئەو قەندیلەی خۆمم تێدا بزرکرد و هاوڕێکانم نابینمەوە، فاتیمە و کۆڵەپشتەکەی نابینمەوە، ئای پێڵاوە جوانەکانم بە پێیەکانەوە لە کوێ کەوتنەوە؟

ماندووبووم، نازانم ئێرە کەوتۆتە کوێی قەندیلەوە، قەندیل کەوتۆتە کوێی ئێرەوە! ئەدی کونەکان! نازانم ئێرە کام دیوی حەمرینە، ئێرە کوێی دنیایە! ماڵی ئایشەگوڵ لە کام لایە! هێندە دەزانم بە دیار دەرگایەکەوە دانیشتووم، دانیشتن نیە، وەك بڵێی پێوەنووسانە بە جێگەیەکەوە، ئێرە جێگەی پیاوێکە نازانێت لە کەیەوە جەنگـــــــاوەرە، لە کەیەوە لە جەنگـــــــاوەری رووت رووتبۆتەوە، پیاوێکە بە شمشاڵ یادەوەریی خۆی دەنووسێتەوە، پیاوێکە شەش پارچە کاغەزی پێچراوەی لە بن چۆکی داناوە، ناوێرێت بیانخوێنێتەوە، دەترسێ سوێندەکە بیگرێ، ئاخر دڵنیانیە شەش هاوڕێکەی زیندوون یان... نازانێ ئیمامەی پساوە و فاتیمە و پۆڵای فاتیمە و داغستانی و هاوڕێی گیڤارا و سەردەستەی مراویان، لە کوێی زەوی کەوتنەوە، پەڕینە سەر چ ئەستێرەیەک.

پیاوێکە لە هەزار و یەك پرسیار کەس وەڵامی پرسیارێکی نەداتەوە، پیاوێکە بە ژمار سەدویەك جار پساوەتەوە، ئیدی جێگەیەك نەمایەوە بۆ پسانەوە، پیاوێکە سەر و ریش سپی سپی، سپی وەك قەندیلی یاد، پیاوێکە نە خۆی دەزانێت تەمەنی چەندە نە کەس، پیاوێکە لە سەردەمێك شمشاڵ دەژەنێ، پێناچێت سەردەمی شمشاڵ بێت، پیاوێکە نە کەس دەناسێت، نە کەس دەیناسێت، پیاوێکە جگە لە چاوەڕوانی کەس ناناسێت، پیاوێکە چاوەڕوانیی دنیا دەکات لەو دەرگایەوە خۆی پیشانبدات.

چاوم لە دەرگایە، دەرگایەك دیار نیە بە سەر کوێدا

کراوەتەوە، بە سەر کوێدا دەڕوانێت، چ دنیایەکی چۆڵەوانیە، نە جەنگاوەرێ دیارە، نە دۆستێ، نە ناسیاوێ.

چاوم لە دەرگا نابێتەوە، لێوم لە شمشاڵ نابێتەوە، پەنجەم لە شمشاڵ ناپسێتەوە، وێدەچێ سەردەمی بەتاڵبوونەوەی شمشاڵ گەیشتبێت، من هەر شمشاڵ دەژەنم و چاوم لە دەرگایە، کەس نەهات و چاوم هەر لە دەرگایە، دڵم دەڵێت:

لێو با بە شمشاڵەوە بێت، پەنجە با بە شمشاڵەوە بێت، برژانگ با پەرژینی دەرگا بێت، کەسانێک وا بە ڕێوەن.

دڵم دەڵێت:

ئێستا نا ئێستا شۆخە کچێکی کەڵەگەتی کەمەر باریکی شمشاڵی، پیاڵەیەك چای بە دەستەوەیە، بە شەرمەوە، بە خەندەیەکی ناسکەوە، پیاڵەکە لە پێشم دادەنێ و خۆی لە ئامێزم داوێ و دەڵێ:

ئەوەتە ماڵمان، ئەو چایە دایکم بۆی تێکردی، نامناسیتەوە؟ من تریفەم!

## لیستی کتێبەکانی دەزگای ڤام

١- پێگەیشتن، بیرەوەرییەکانی میشێل ئۆباما/ نووسینی: میشێل ئۆباما/ لە ئینگلیزییەوە: هێما ئەحمەد.

٢- تیۆری فستق١، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: فهد عامر الاحمدي/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

٣- زانکۆ بەخێرهاتنت دەکات، ڕێبەر بۆ فێرخوازانی زانکۆ/ نووسینی: جاسم بن هارون الهارون/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی

٤- زازانا، ڕۆمان/ نووسینی: کامەران خۆشناو.

٥- ئەتەکێتی سەردەمییانە، چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ڕۆژانە بۆ گەیشتن بە لووتکە، ئەتەکێت/ نووسینی: دۆرسیا جۆنسن، لیڤ تایلەر/ لە ئینگلیزییەوە: کۆمەڵێك وەرگێڕ.

٦- پێغەمبەر و پێغەمبەرناسی، ئایینی/ نووسینی: سەرحەد یونس محەمەد.

٧- هێزی ئێستا، ڕۆحانی/ نووسینی: ئێکهارت تۆڵێ/ وەرگێڕانی: بنار جەبار.

٨- جثثُ أحلام، شعر، نرکز ادریس شکر.

٩- ضجيج أبْكَمْ، شعر، إليسا حاجو.

١٠- زنجیرەی ڕەوشتە باشەکان، منداڵان (٨ کتێب)/ لە ئینگلیزییەوە: کەوسەر تەها.

١١- زنجیرەی خێزانەکەم، منداڵان (٤ کتێب)/ لە ئینگلیزییەوە: کەوسەر تەها.

١٢- نیل بە سارای سیناوە، گەشتنامە/ نووسینی: کەریم کاکە.

١٤- سەما لەگەڵ ژیان، ژیاندۆستی/ نووسینی: مەهدی ئەلموسەوی/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

١٥- دەمەوێ بژیم، ژیاندۆستی/ نووسینی: مەهدی ئەلموسەوی/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.

# خـــەوی پساوەی قـەندیل

چاپـی پێشـووی (خـەوی پسـاوەی قەندیـل) نەختێ پەڕینـی بەرکەوتبـوو، تـۆزێ تێئاخنینـی زیـادەی تێکەوتبـوو، هەنـدێ ناویش گۆڕابوون.

لـەم چاپـەدا، هـێ لـە ڕاسـتکردنەوەی ئەوانـە، کەمـێ دەسـتەواژە و ڕسـتە دەسـتی دەسـتکارییان گەیشـتۆتێ و لە پێشوو ڕێکتر داڕێژراونەتەوە.

کەسـێ بخـوازێ (خـەوی پسـاوەی قەندیـل) بخوێنێتـەوە، شتێ بڵـێ، وا باشـە پشـت لـە چاپـی پێشـوو بـکات و پشـت بەم چاپە تازەیە ببەستێ.

+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub